ڕێواس ئەحمەد

# ژن ...

کوردستان – هەولێر

2005

**ناوی کتێب: ژن ......**

- نووسینی: ڕێواس ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: ١٣١
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ١١ – (١١٤)

**ناونیشان**
**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**هەولێر – پشت ڕۆژنامەی خەبات**
**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@maktoob.com
**ژمارەی تەلەفۆن:** ٢٢٦٠٣١١

# 1

هەورێکی بۆر بە ئاسمانەوەیە، چاوەڕوانی باران دەکرێ. لەم کاتانەدا لای خۆمان خەڵکی دەچنە سەیران، دەرودەشت بە گوڵ و گوڵزار ڕازاونەتەوە. ئێستا گەرچی ئازادم، بەڵام لە زیندانێکی گەورەی بێ سنووردام. سەیرە خۆ لێرە کەلەبچەت لە دەستدا نییە، بەڵام ڕێگاکان چاویان هەیە، کۆڵانەکان بنبەستن و هەردەم لە دڵەکوتێ دایت. ئەمڕۆ یەکەمین ڕۆژی کارکردنمە لە نەخۆشخانە. زەمانێک بوو خەوم بەوەوە دەبینی کە لە نەخۆشخانەیەکدا کاربکەم و پێشوازیی لە نەخۆشەکان بکەم و چارەسەریان بکەم. حەزم دەکرد یەکێ لەوانەی دێنە لام دایکم بێت.

ئەمڕۆ لە وڵاتی بەفر و سەوزایی، وڵاتێک تەنانەت خەویشم پێوە نەبینیوە، بە خەیاڵیشمدا نەهاتووە ڕۆژێک لە ڕۆژان تێیدا بگیرسێمەوە، لە نەخۆشخانەیەکدا کار دەکەم. دایکم نازانێت لێرە کچەکەی وەک فەراشێک دامەزراوە. ڕۆژانە دوو نهۆمی نەخۆشخانەکە پاکدەکەمەوە، یەکەیەکە ژوورەکان گسک دەدەم و زبڵەکان دەڕێژم و دوایش زەوییەکە دەسڕمەوە و توالێتەکان پاکدەکەمەوە. هەر نهۆمێک بیست ژووری تێدایە. گەر بزانێ ئەم کارە دەکەم ڕەنگە دڵی بوەستێ، چونکە ئەو دەزانێ چەند ڕەنجم داوە و چەند شەونخونیم بەدیار کتێبەکانمەوە کردووە بۆ ئەوەی نمرەیەکی باش بێنم و بچمە کۆلێژی پزیشکی. ئەو ئاواتەم هاتەدی، ئەو ڕۆژەم لەیادە کە دلێری برام هاتەوە و هاواری کرد:

– مژدە، مژدە لە کۆلێژی پزیشکی وەرگیرایت، مزگێنیم دەوێ.



نەمزانی چی بڵێم، قیژاندم و بەپێی پەتی ڕامکردە کۆڵان و هاوارم کرد:

– خەڵکینە وەرگیرام، خەڵکینە وەرگیرام. هەمووتان بێنە لای خۆم، بەبەلاش چارەسەرتان دەکەم.

هێندەی نەبرد هەرچی دراوسێ هەیە ڕژانەماڵمان، داوای شیرینی و شەربەتیان دەکرد. دایکم تازە چەند دینارێک حەقی دروومانی وەرگرتبوو، خێرا پارەکەی هێناو بێ ئەوەی بیر لە سبەی بکاتەوە، براکەمی نارد و هێندێ چکلێت و پاقلاوەی کڕی. هەرگیز لە یادم ناچێ دوو ڕۆژ دوای ئەوە پارەی خەرجیمان نەبوو. ناچار براکەم لای خزمێکمان دەستی بەکارکرد، دڵی براکەمم دەدایەوە و دەمووت: "دلێر گیان بەڵێنت پێدەدەم کە بووم بە دکتۆر حەقی ئەم هەموو ماندووبوونەت بۆ دەکەمەوە". ئەویش بە پێکەنینەوە دەیووت:" چییە دەتەوێ وەک فەڕاش دامبمەزرێنی".

داخی گرانم گەر ئێستا بزانێ لە نەخۆشخانەدا گسک دەدەم، کفنەکەی خۆی دەدڕی و لە گۆڕەکەی دەهاتە دەرێ و پەلی دەگرتم و دەیبردمەوە بۆ وڵات و تفی لەو ڕۆژگارە دەکرد کە منی تووڕداوەتە ئێرە.

ڕۆژێ چووم تا کارەکەم نیشانبدەن، ژنە لێپرسراوەکە کەوتە پرسیارکردن.

– پێشتر کاری واتکردوە؟

– بەڵێ.

– لە کوێ...؟

– لەماڵەوە، پاککردنەوەی ماڵ لەسەر من بوو.

– مەبەستم لە دەرەوەی ماڵەوە کاری واتکردووە؟

– نەخێر. ئەمە یەکەمین جارمە.

– ئەی لێرە هیچت خوێندوە؟

– تەنیا زمانم خوێندوە، ئێستاش ئێواران بەردەوامم لە خوێندن.

– کەمێک زانیاریمان سەبارەت بە تۆ پێگەیشتووە، هەوڵدەدەین یارمەتیت بدەین.

چوومە دەرەوە و دەرگاکەم داخست، بەرەو ماڵ گەڕامەوە، بەهەزار حاڵ خۆمم ڕاگرت تاگەیشتمە ژوورەکەم. دامە پرمەی گریان و لەسەر قەروێڵەکە دانیشتم. هێندە گریام تا هێزم لێبڕا، ئیتر هەر بە

جلەکانمەوە پاڵکەوتم و خەوم لێکەوت. هەرباشبوو خەبەرم بووەوە، ئەگینا لە کارەکەم دوادەکەوتم. دەڵێن ئەم سوێدییانە گەر لەکار دوابکەوی زۆریان پێناخۆش دەبێت. هەروا دەڵێن باشترە مرۆڤ جلێکی شیاو و جوان لەبەربکات، بۆیە منیش بە جلی نوێوە بەرەو کار ڕێگام گرتەبەر.

هەموو چوونە دەرەوەیەکم دڵە لەرزێیەکی گەورەی لەدوایە. گەرچی دەزانم مەحاڵە هزری ئەوە بکات من گەیشتبێتمە ئەم شارە، بەڵام هەردەم هەست دەکەم وەک سێبەر بەدوامەوەیە و دەنگی لە گوێما دەزرنگێتەوە. هەوڵدەدەم ئەو ڕۆژە پڕئازارانە لە یادی خۆم بەرمەوە، هەرچەند دەزانم سارێژکردنی ئەو برینانە مەحاڵە. ئەو بڕیارەش زۆر سەخت بوو، بڕیارێک کە ژیانی تەواو گۆڕیم و ناچاری کردم لە خاڵێکی تازەوە دەست پێبکەم، ئەوەی چەندان ساڵە بۆ خۆمم دارشتبوو لە ساتێکدا هەڵیبوەشێنمەوە. بەڵام هەمووی خەتای خۆم بوو، لەسەرەتاوە دەبوایە بەرگریم بکردایە و بەگوێی کەسم نەکردایە. کەسیش کاری لێم نەکردایە، تازە ئەوەی ڕوویدا ناگەڕێتەوە. گرنگ ئەوەیە لێرەش نەمدۆزێتەوە. لەگەڵ ئەوەی ڕەنگی چاو و قژم گۆڕیوە، کەچی هێشتا هەر شکم هەیە کە بمبینێ بمناسێتەوە. هەر بەبۆندا دەمناسێتەوە، وەک سەگ وایە، گەر پۆلیس بەم ڕاستییەیان بزانیبایە کارێکیان پێی دەدا. ئۆی منیش چەند سەیرم هەموو ڕۆژێ بڕیاردەدەم کە ڕابردوو بە خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە لەیاد بکەم، کەچی لەوە ناکات بتوانم.

ئەم نەخۆشخانەیە زۆر گەورەیە، مرۆڤ بەزەحمەت دەتوانێ بەشەکانی بدۆزێتەوە. پاش چەند ڕۆژێک لە کارکردن، زۆر بەزەحمەت بەشەکەم دۆزییەوە. کە دەگەیشتمە نهۆمەکەی خۆم تۆزی هەستم بەدڵنیایی دەکرد و دەموت: " باشبوو ئەمڕۆش بەسەلامەتی گەیشتمە سەرکار". بەترسەوە دەرگاکەم دەکردەوە و جلەکانم دەگۆڕی، پاشان دەستم بەکار دەکرد، چ ڕۆژانێکی سەخت بوو، سەردەمانێک بوو خۆم ئامادە دەکرد وەک پزیشک کاربکەم کەچی ئەمڕۆ وەک فەڕاشیک کاردەکەم. ئەمەشم هەرقەبووڵە بەمەرجێک ئیتر لەوە زیاتر زەلیل نەکرێم.

لێپرسراوی سیستەرەکان هات و بەخێرهاتنی کردم و داوای لێکردم بچم لەگەڵیان قاوەیەک بخۆمەوە، بەڵام شەرمم کرد.

– سوپاس نانی بەیانیم خواردووە.

– چاکە، هەر شتێکت هەبوو دەتوانی بپرسی، هەوڵبدە کاتێک ژوورەکان پاکبکەیتەوە کە کارمەندەکان لەوێ نەبن. من کێشەکەت دەزانم بۆیە هەر کاتێک هەستت بە شتێکی نا ئاسایی کرد



ئاگادارم بکەرەوە.

– سوپاس، سوپاس بۆ ئەم میهرەبانییە.

پەشیمان بوومەوە کە نەچووم پشوویەک بدەم، وامزانی وەک لای خۆمان وایە کە کەسێ دەعوەتت دەکات و بڵێی ناخۆم ئەوا وازناهێنێ: "نابێ بەخوا دەبێ بێیت قاوەیەکمان لەگەڵ بخۆیتەوە و نابێ شەرم بکەیت". کەچی ئەو یەکسەر بە وەڵامەکەم قەناعەتی کرد و ڕۆیشت.

بە هێمنی دەستم بەکار کردەوە، هەوڵم دا ئەرکەکانم بە باشی جێبەجێ بکەم. لە وەختی خۆیدا بەرەو ماڵ بڕۆمەوە، تاپشوویەک بدەم و فریای مەکتەبەکەم بکەوم. یەکەم ڕۆژی کارەکەم تەواو شەکەت بووم، ماوەیەک بوو بە تەمبەڵی ڕاهاتبووم و لە ماڵەوە خەریکی خوێندنەوە بووم. زۆربەی ئەوکتێبانەی کە دەمخوێندنەوە بە ئینگلیزی بوون. ئینگلیزیم باش دەزانی و قەرەبووی سوێدی نەزانینەکەی بۆ کردبوومەوە.

کە گەڕامەوە هێزم تیا نەمابوو، بۆیە بڕیارم دا ئەو ڕۆژە بۆ قوتابخانە نەچم. لەوێش مامۆستایەکی هێندە باشمان نەبوو زۆربەی کات وتاری ڕۆژنامەیەکی کۆپی دەکردو دەیدا پێمان تاخۆمان بیخوێنینەوە، بەڵام ئەو کاتەی کە لە سەنتەری ژنان بووم هەوڵم دەدا لە کتێبخانەکە کتێب وەرگرم و بیخوێنمەوە. ئەو ژنەی لەوێ کاری دەکرد کە زانی لە کۆلێژی پزیشکی خوێندومە، زیاتر یارمەتی دەدام و لە کتێبخانەکانی ترەوە کتێبی بە کەڵکی بۆ پەیدادەکردم. پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوانماندا دروست بوو. ژنێکی تەمەن مامناوەندی بوو، بەژنێکی کەڵەگەت و گۆشتنی هەبوو، قژە زەردو خاوە درێژەکەی بەسەر شانەکانیدا بەردەدایەوە و ماکیاجێکی تەنکی دەکرد و هەردەم ڕوو بە پێکەنین بوو. دەتگوت لە ژیاندا تۆزقاڵێ ناخۆشی نەدیووە، ئێنگلیزییەکی باشی دەزانی، بەڵام زۆرتر هەر بە سوێدی قسەی لەگەڵ دەکردم، تا لەوێندەر بووم زۆر کەڵکم لێوەرگرت، زمانە سوێدییەکەشم باشتر بوو. هەر ئەویش یارمەتیدام بگوازمەوە ئەم شارە و ئەم ئیش و خانووەم دەستبکەوێت. ئەو لەو باوەڕەدابوو هەرگیز لە شارە کۆنەکە هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی ناکەم، باشترین چارەسەر بۆ گرفتی من بەجێهێشتنی ئەو شارە و دوورکەوتنەوەیە لە یادگارە تاڵەکانم.

ئێستاش لەم شارە نامۆیەدا کەس ناناسم و هەست بە تەنیایی دەکەم، بیری ئەو دەکەم و یادی ڕۆژانی سەنتەری ژنان دەکەم، هەر هیچ نەبێ لەگەڵ چەند ژنێکدا دەژیام و دەرد و ئازارەکانمان هاوبەش بوون، کەسمان لەوی ترمان نەدەترساین، دڵمان لای یەکدی هەڵدەڕشت و هەستمان بە

بارسووکی دەکرد. ئێستا مەگەر بۆ دیوارەکانی ژوورەکەم قسەبکەم. یەکەمین ڕۆژی کارکردن خەم و ترس گیانمی داگیرکردبوو، بەترسەوە دەرگاکانم دەکردەوە نەوەک یەکێک لە نەخۆشەکان بمناسێ. زوو زووش خۆم هێمن دەکردەوە: " ئێتر بەسە ترس و دڵە لەرزە قابیلە چ دەبێ گەر یەکێک بمناسێتەوە"، زووش ئەوەم لەبیر دەچوو کە من ڕەنگی قژو چاوم گۆڕیووە. باشبوو بیرم کەوتەوە دەبێ لینزەکانم دەربێنم و بیانشۆم. دوێنێ هەر بە لینزەکانمەوە خەوتم، ئەمڕۆ چاوەکانم سووربونەتەوە و سەریشم دێشێ. ئەمڕۆژەش یەکێک بوو لە ڕۆژە درێژەکانی ژیانم. دڵم پڕبوو، حەزم دەکرد بخزێمە قوژبنێک و تێرتێر بگریم.

بارانی دووشەکە و خەمەکانم ئامێتە دەبن. پرچم لەتاو ئازار دەناڵێنێ، دڵۆپە ئاوەکانیش بەسەر جەستەمەوە سەمادەکەن و دەیانەوێ ختووکەم بدەن تا خەمە قورسەکانم تۆزێک سووک بکەن. ئای خودایە ئەم خەمە قووڵانە چین وا دڵی منیان کردۆتە هێلانە. چ تاوانێکم کردبوو وا گیرۆدەی ئەم ژیانە پڕئازارەت کردووم، ببوورە خودایە خەتای تۆ نەبوو خەتای خۆم بوو، خۆم بڕیارم دا، خۆم ڕازی بووم، ببوورە خوایە گیان. بەڵام ئێستا یارمەتیم بدە کە بەسەر تاریکی و خەمی دەروونمدا زاڵبم، تروسکاییەک ڕۆشنایی بکەوێتە ژیانمەوە و سەر پێی خۆم بکەوم و هیوام بە ژیان و داهاتوو هەبێت. گرنگ ئەوەیە لە هەوڵدان نەکەوم بۆ ئەوەی بەباشی فێری زمانەکە ببم، تا لە داهاتوویەکی نزیکدا بچمەوە زانکۆ، ئاواتەکەی خۆم و دایکم بهێنمە دی. بەڵکو لەم ماوەیەدا هەرچۆنێ بێ بێمەوە سەرخۆ و کەمێک پارەش کۆبکەمەوە یارمەتی دایک و براکانم بدەم، بەردەوام هەرچۆنێ بێت یارمەتیان دەدەم. دەترسم بەهۆی ئەم پارە ناردنەوەشەوە، شوێنەکەم بدۆزرێتەوە.

مەعاشێکی باش وەردەگرم و کرێی خانووەکەشم کەمە، خەرجیشم هێندە نییە، حەزی چوونە سینەما و مووزەخانە و شانۆشم بیرچۆتەوە. کە شووم کرد و هاتمە ئێرە بە هیوابووم تێکەڵ بە ژیانی ئەوروپا ببم و درێژە بە خوێندنەکەم بدەم. کەچی ڕێگەی فێربوونی زمانم لێ داخرا، هیچ مانایەک بۆ خوێندن و زانکۆ نەمایەوە. بووم بە باڵندەیەکی نامۆ و دیل، هەر ڕۆژەی تەلێکی قەفەسەکەم بۆ دەچنرا.

ئای خۆ بڕیارم دابوو، قۆناغێکی نوێ دەست پێبکەم، بەڵام دیارە هێندە ئاسان نییە. پزیشکەکەشم پێی گوتم گێڕانەوەی خەم و نیگەرانییەکانم لای دۆست و ناسیاوان یارمەتیدەر دەبێ بۆ لەبیرچوونەوەیان. بەڵام من کێم هەیە کە دڵی خۆمی لابکەمەوە. بڵێم چی مەگەر لەم ئیشەمدا



کچێک بکەمە هاوڕێ و لێی نزیک ببمەوە و باسی خۆمی بۆ بکەم. ئەمڕۆ لە نەخۆشخانەکە تاقە بێگانەیەک چی بوو نەمبینی، ئەمەش تۆزێ ئارامیی پێ بەخشیم، چونکە لە سوێدی ناترسم کە نهێنی من بە خەڵکی تر بگەیەنێ. لێرەش تەنیا دوو کەسی لێپرسراو ڕابڕدووی من دەزانن.

لە یادم نەچێ سبەی پاش کار بچم ڕادیۆ و تەسجیلێک و چەند سیدێ و کاسێتێکی مۆسیقای کلاسیک بکڕم. هەرچەندە زیاتر حەزم لە مۆسیقاو گۆرانی لای خۆمانە، بەڵام ئەوە لە کوێ پەیدا بکەم، جارێ هیچ کەسێک ناناسم و خۆشم لە هاووڵاتی و هاوشارییەکانی لای خۆمان دەشارمەوە. کە لە سەنتەری ژنان بووم وتیان لەو شارەدا کتێبفرۆشی لای خۆمانی لێیە و بە هەموو زمانێک کتێب و کاسێت دەستدەکەون. پاش ئەم هەموو دەردەسەرییە پێویستم بە پشوویەکی باش هەیە، گرفتەکە ئەوەیە کە ناتوانم خۆم لە ڕابردوو داببڕم، بیر لەهەرچ شتێک بکەمەوە ڕابردوو دەبێتە تەوقێک و دەچێتە گەردنم و دەبێتە بازنەیەک تێیدا بسووڕێمەوە... ناشزانم کەی ئەم مۆتەکەیە یەخەم بەردەدا. تاکەی لەژێر ناو و کەسایەتیەکی تردا دەژیم، کەی ڕەنگی قژ و چاوم وەک جارانی لێدێتەوە. کەی دەتوانم بە ئازادی بژیم و بەبێ ترس بگەڕێم و شەوانیش کە دەنووم لە سبەینێم نەترسم. کەس ناتوانێ لەو ترسەی من تێبگا، مەگەر ئەوانەی هەمان دەردی منیان هەبێ. ترسێک هەناسەم کورت دەکات و ئۆقرەم لێدەبڕێ. تێناگەم من مرۆڤێکی ترسنۆک نەبووم تەنانەت لە بۆمببارانیش نەدەترسام، کاتێ کە فڕۆکە جەنگییەکان بەسەر شارەکەماندا دەفڕین و بۆمببارانیان دەکرد هێندەی چوونە دەرەوەیەکی ئێرە تووشی دڵە کوتێی نەدەکردم، تەنانەت دایکم زۆرجار لێم توڕەدەبوو دەیووت ئەم کچەتیووە تا خۆی بە قەڵبەیەکدا نەدا واز لەم کەللە وشکییەی ناهێنێ. گەر دەیزانی ئێستا ڕۆژی ڕووناکم لێبووەتە تاریکستانی و شارێکی وا گەورەشم لێبووەتە کونە مشک، ئەوا یەخەی خۆی دادەدڕێ و نەعلەت لەو ڕۆژەش دەکا کە داوای لێکردم ئەم شووە بکەم.

## 2

نزیکەی مانگێکە لەم نەخۆشخانەیەدا کاردەکات، بێ گرفت و ڕێکوپێک کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات و هێمن و بێدەنگە، لە سڵاوکردن بترازێ کەس سرتەیەکی لێوە نابیستێ. تەنانەت سەرنجی نەخۆشەکانیشی ڕاکێشاوە کە پرسیاری لێدەکەن هەوڵدەدا وەڵامەکانی کورت بن و نەچێتە بابەتی جدییەوە. زۆرجار خۆی بەوە دەپەڕێنێتەوە کە سوێدی باش نازانێ. کچێکی تا بڵێی جوان بوو، جوانیەکەشی یەکێک لەو هۆیانە بوو کە گەیاندیە ئەمڕۆژە.

بەژنێکی نە زۆر درێژ نەزۆر کورت، چاوەکانی سەوز و برۆ و برژانگەکانی قەترانی، پێستێکی گەنمڕەنگیی کاڵ، لەگەڵ هەموو بزەیەکدا دوو چاڵ دەکەوتنە گۆناکانییەوە. کە لە دایک بوو دراوسێکان هاتبوون بۆ سەیری، خەڵک لە جوانی ئەم کچە سەریان سوڕمابوو، باجی حەلاویش کۆمەڵی دوعای بەسەردا خوێند و موورویەکی شینی چاوەزاری کرد بە سەرییەوە، دەڵێن باجی حەلاو دەیگوت کچەکەیان بووە بە چاوەوە، هەر بۆیە خوا دوو کوڕەزای گۆج و شەلی پێبەخشین. دەڵێن کاتێک لە دایکبوو چاوەکانی هێندە جوان بوون، ژنانی گەڕەک دەیانگوت ئەم کچە دەبێتە شای جوانان و نیگای چاوەکانی تەلیسماوین و کوڕان خۆیانی لەبەرناگرن.

کەسانێکی تریش دەیانگوت هێندەش جوان نییە کە باجی حەلاو ڕیکلامی بۆ دەکات. بەڵام جوانییەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو، خوێن شیرین بوو، هەر کە دەتبینی دەست بەجێ دەچوو بەدڵتاو خۆشتدەویست. بە منداڵیش زیرەک و ژیربووە. دەڵێن پێشوەخت فێری قسەکردن ببوو، قسەی وای دەکرد عەقڵ نەیدەبڕی. ئەو کۆڵانەی هێنابووە زەلزەلە. ژنانی گەڕەکیش بەیانیان زوو کاری ماڵیان بەجێ دەگەیاند و دەهاتنە کۆڵان تاتێر بە قسە قووت و خۆشەکانی پێبکەنن.

ئەم خۆشییە هێندە درێژەی نەکێشا، هێشتا منداڵ بوو باوکی لە پڕێکداو کتوپڕ مرد. خەم و



پەژارە ئەم ماڵە و سەر تاسەری گەڕەکەی گرتەوە. باجی حەلاویش بە مردنی کوڕەکەی هەموو دنیای لە پێش چاو ڕەش بوو، مردنی کوڕە تاقانەکەی لە چاوی ئەم کچەدا دەبینی. چاوی بەرایی نەدەهات کوڕەزاکەی ببینێ و دەیگوت پێوقودومی ئەم کچەتیووە ڕەش بوو، هەر ئەم کچە بوو ژیانی لە باوکی سەندەوە. کەس نەیدەزانی ئەم باوکە بۆ هێندە ئەم کیژەی خۆشدەوێ، هەموو ڕۆژی کە لە کار دەهاتەوە تا ئەم کچەی لە باوەش نەگرتایە و تێر ماچی نەکردایە دانەدەنیشت نانەکەی بخوات. ژنەکەی بیری دەخستەوە کە سێ کوڕیشی هەیە و دوانیان سەقەت و کەمئەندامن و پێویستیان بە نازی باوک هەیە.

باجی حەلاو سەری لەوە دەرنەدەکرد بۆ ئەم باوکە هێندە ئەم کچەی خۆشدەوێت و سێ کوڕەکەی پشتگوێ خستووە. هەندێ جار پێی دەگوت: "کوڕم خوا دەتگرێ لایەکیش لەو کوڕانەت بکەرەوە، ئەوانیش منداڵی تۆن و پێویستیان پێتە، کە تۆ دێیتەوە ئەم چەتیووە وا دەگری بە باوەشەوە، ئەو منداڵانە زەق زەق تەماشات دەکەن. کوڕەکەشی بەدەم پێکەنینەوە دەیگوت: " دایە گیان چۆن دڵت دێت وا بڵێی، من هەموویانم خۆش دەوێت، بەڵام تەنیا ئەم کچەم تەسکینی دڵم دەداتەوە، ئەی گوێت لە قسەکانی نییە سەر بە قوڕیش دێننە پێکەنین".

باوکە پاش ئەم قسانە هەموو ڕۆژێ کە دەهاتەوە چنگێ نوقڵ و شیرینی بۆ کوڕەکانی دەهێنایەوە. ئیتر کە باوکیان مرد، کچەش ئەو کچەی جاران نەمایەوە و تاقە وشەیەک لە دەمی نەدەهاتە دەرەوە. ماوەیەکیش خواردنی تێکچوو، میزی بەخۆیدا دەکرد، لە کاتێکدا هەر بە شەش مانگی فێری ئەوەبوو بوو کە خۆی پاکڕاگرێ تا دایکی دەیخستە سەر پێ. جاران لە ڕۆژێکدا چەندان جار هاواری لێهەڵدەستاو دەیگوت برسیمە. زووزووش نەنکی دەیوت: " بەخوا هیچ بەشی ئەم کچەتیووە ناکات، نازانم ئەم ورگەی خۆ دەستاڕی تێدا نییە وا زوو خواردنەکە دەکات بە گوو".

باجی حەلاو هەر لە سەرەتاوە بەم کیژە ئاسوودە نەبوو. هەندێ جاریش دەیووت: "ئەوەندەی من بزانم ئەم کچە سەر بەخێر نییە، بڵێم چی مەگەر سەرم لەبەر هەتاو سپی کردبێ".

دوای مردنی کوڕەکەی دووچاوی هەبوو ئەم کچەی نەدەبینی، دایکی کچەش نەیدەزانی خەسووی بوغزی چی لەم کچە هەڵگرتووە. هێندەی نەبرد باجی حەلاو شاری بەجێهێشت و چووەوە گوندەکەی خۆیان کە هێشتا شوێنەواری کەلاوەکەیان مابوو. ژنە و هەرچی دەرودراوسێ هەیە کەوتنە تکاو ڕجا لە باجی حەلاو تا کوڕەزاکانی جێنەهێڵێ، بەڵام قسەی کەس نەچوو بە مێشکیدا و شاری جێهێشت. ئیتر ئەو ماڵە دەتگوت خۆڵەمێشی بەسەردا کراوە. بەڵام هێندەی نەبرد کیژە هاتەوە سەرخۆی و کەوتەوە هەڵبەز و دابەز، بە قسە قووتەکانی ماڵەکەی ئاوەدان کردەوە. باوکی ناحەقی نەبوو ناوی نابوو هەتاو، باجی حەلاو و ڕەعنا خان زۆریان هەوڵدا تا باوکی ناوی نەنێ هەتاو،

گوایە هەتاو ناوێکی کۆنە و ئێستا مۆدەی نەماوە، بەڵام لەکەلی شەیتان نەهاتە خوارێ و هەر ناوی نا هەتاو. زۆرجار باوکی دەیگوت من هەتاوم بۆ چییە! هەتاوی خۆمم هەیە.

ڕەعنا خانیش بە دەست چوار منداڵەکەیەوە شەکەت ببوو، دوو منداڵی کەمئەندام، دووانی تری عەجول و زیتەڵە. پاش مردنی مێردەکەی هەرچی ئەرکی ماڵە کەوت بەسەریدا و لە دراوسێکانی زیاتر کەس نەبوو یارمەتی بدات، تەنانەت خزمەکانیشی لێیان نەدەپرسی، گوایە کاتی خۆی لە شووکردنەکەی ڕازی نەبوون. تەنیا دایکی ڕازیبووە، هەر ئەویش قەناعەتی بە باوکی کردووە کە ڕەعنای کچیان شوو بەو پیاوە بکات. کە ئەو کات تازە ماڵی زاوا لە گوندەوە هاتبوونە شار و بە پارەی ئەو شتانەی کە لە لادێ فرۆشتبوویان دوکانێکی کوتاڵ فرۆشییان پێکەوە نابوو. هەر لەو دوکانەشدا چاویان بەیەک کەوتووە و عاشقی یەکتر بوون. ئیتر ئەو عەشقە هەردووکیانی بەیەکەوە بەستەوە تا مردن لەیەکی جیاکردنەوە. ڕەعنا خان بە هیچ جۆری نەیدەویست ئەو دوکانە بفرۆشێ. هەرچەندی دەکرد لە دڵی نەدەهات بیداتە دەست کەسێکی تر. لەبەرئەوە هەموو بەیانیانێک تکاو ڕجای لە دراوسێکانی دەکرد کە ئاگایان لە منداڵەکانی بێ تا چەند سەعاتێ لەسەر دوکانەکە دانیشێت. خەڵکی دراوسێ و ناسراو هەوڵیان دەدا لای ئەو قوماش بکڕن، بەڵام کاری بازرگانی هەر لەسەر دوکان دانیشتن نییە، بەڵکو بەزم ڕەزمی زۆری هەیە، ڕەعنا خانیش لەم بارەیەوە هیچی نەدەزانی. بۆیە وردە وردە دوکانەکە بەرەو کزی ڕۆیشت و نانی خێزانەکەی دابین نەدەکرد، ناچار ئەو قوماشانەی مابوونەوە هێنانیە ماڵەوە و کەوتە دروومانی جلوبەرگ و دەیفرۆشتنەوە. دوکانەکەشی بەکرێ دا بەو نیازەی کە کوڕەکەی گەورە بێت جارێکی تر دوکانەکە بکاتەوە.

ڕەعنا خان هەر زوو سەری سپی کرد. دەڵێن خەمی مێردەکەیەتی وای لێکردووە. زۆرجاریش لای دراوسێکان گوتویەتی گەر منداڵەکانی نەبونایە لەسەر گۆڕی مێردەکەی خۆی دەرمان خوارد دەکرد. پاش چەند ساڵێ نەنە حەلاویش کۆچی دوایی کرد و ئەو هیوایەی ڕەعنا کوێربووەوە کە نەنکە بگەڕێتەوە لای کوڕەزاکانی و کەمێک باری ئەمی سووک بکردایەتەوە. بەڵام هەردەم بەگلەیی بوو لە خەسووی کە لە کاتی تەنگانەدا بەجێیهێشتوون. منداڵە کەمئەندامەکانیشی تا دەهات گەورە دەبوون و ئەرکیان زیاتر دەبوو، هەتاو کە ئەو کات ببووە هەشت ساڵان یارمەتی دایکی دەداو دلێری براشی کە شەش ساڵان بوو کوڕیکی سالارو ژیری لێدەرچووبوو. دلێر و هەتاو تەسکینی دایکیان دەدایەوە کە خۆی لەسەر پێ ڕاگرێ و توانای خزمەتکردنی منداڵەکانی ببێ. هەردووکیان کە لە قوتابخانە دەهاتنەوە یارمەتییان دەدا تا خەریکی دروومانەکەی بێت. ڕەعنا خان خەیاتێکی دەست ڕەنگینی لێدەرچوبوو، ژنی خێزانە دەوڵەمەندەکان دەهاتنە لای ئەم جلیان بۆ بدروێ. پارەیەکی باشیان دەدا پێی.



دلێر و هەتاویش لە قوتابخانە زیرەک بوون بەتایبەتی هەتاو. ناویان نابوو کچە زیرەکەکە. ئیتر کە بوو بە نۆ ساڵ دایکی نەیدەهێشت بچێتە دەرەوە لە کۆڵان یاری بکات. لەلایەکەوە لەبەر جوانییەکەی و لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەوەی لەکاری ماڵەوە یارمەتی بدات. هیچ ڕۆژێکیش ئەم کیژە سەلارو هێمنە لە قسەی دایکی دەرنەدەچوو، زۆرجار پێیان دەوت خوا جەزای ئەم دوو منداڵە کەمئەندامەی بەم دوو منداڵە زیرەکانە داوەتەوە. دلێر دەیویست قەناعەت بە دایکی بکات دوکانەکەی باوکی بۆ بکاتەوە و لەوێ کار بکات، بەڵام دایکی دەیگوت "کوڕم پەلە مەکە کاتی ئەوەش دێت".

لە زستانێکی زۆر ساردا هەردوو کوڕە کەمئەندامەکەی نەخۆش کەوتن و دکتۆرانی شار وتیان دەبێ ببرێن بۆ پایتەخت. ئەوکات ڕەعنا خان ناچاربوو دوکانەکە بفرۆشی و چارەسەری منداڵەکانی بکات. ئیتر ئەو هیوایەشی بڕا کە "کوڕ جێگای باوکی بگرێتەوە". دەڵێن پاش فرۆشتنی دوکانەکە هەموو ڕۆژێ ژەمێک دەگریا، هەرچەند دەرودراوسێ دڵخۆشییان دەدایەوە، بەڵام هیچ تەسکینی دڵی نەدەدایەوە. پێیان دەوت دەبێت شوکری خوا بکات کە ئەو دوکانەشی هەبووەو توانی منداڵەکانی لە مردن ڕزگاربکات.

دوو منداڵ لەیەک ڕۆژدا لەدایک بوون و تەنیا سەعاتێک کەوتە بەینیانەوە کەچی هەردووکیان هەروەک ژنانی گەرەک دەڵێن بە ئەمری خودا سەقەت دەرچوون. ڕەعنا خان دەیوت ئەمە غەزەب و دوعای ئامۆزاکەیەتی، چونکە ئەمی یەکجار خۆشدەویست. زۆریش هەوڵی دا شووی پێبکات، بەڵام ڕەعنا بە هیچ جۆرێ ملی بۆ نەدەدا. کاتێکیش باوکی ویستی ناچاری بکات، بە باوکی گوت گەر بە زۆر بمدەن بەشوو خۆم دەسووتێنم. باوکیشی پیاوێکی خواپەرست و بە ئیمان بوو، هەرگیز نەیدەویست کچەکەی کارێکی وابکات. هەربۆیە وازی لە مەسەلەکە هێنا و بەردێکی لەسەر دانا، زۆربەی بنەماڵە و خزمە نزیکەکانیان لێی لالووتبوون و یەکدوانێکیشیان حاشایان لێکرد. باوکی ڕەعنا دەیوت دیارە خوا ئەم کارەی بەباش نەزانیوە. ئامۆزاکەی تەواو تێکچوو، دەڵێن تاماوەیەک لە ماڵ نەدەهاتە دەرێ. کوڕەیان نارد بۆ پایتەخت بۆ ئەوەی ڕەعنای لەبیر بچێتەوە. دەڵێن هەردەم دوعای لە ڕەعنا کردووە کە لە ژیانیدا نەحەسێتەوە، هەروا دایکیشی سنگی لێکوتاوە و سەر لە ئێواران کە نوێژی مەغریبی خوێندووە دوعای لە سەبەبکاری نەخۆشی کوڕەکەی کردووە.

ڕەعنا بەگەنجی کچێکی دامەزراو و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بوو. کەس نەیدەتوانی ڕێگری مەرازەکانی بێت ئەوەی بیویستایە وەدی دەهێنا، ئەمەش بۆ ئەو سەردەمە زۆربوو، دایکیشی پشتگیری دەکرد. ڕەعنا زۆر حەزی لە خوێندن بووە و هەر بەپشتگیری دایکی چووەتە مەکتەب، هەرچەندە ئەو سەردەمە کچان نەدەچوونە مەکتەب، زۆربەی خێزانەکان بەلایانەوە شەرم بووە کچیان

بخوێنێ. دایکی ڕەعنا گەرچی خۆی نەخوێندەوار بوو، بەڵام مێردەکەی ڕازی کرد کچەکەیان بنێرنە قوتابخانە. پیاوەکە زۆر حەزی لە شیعر بوو، جارێکیان شیعرێک بۆ ژنەکەی دەخوێنێتەوە کە داوا دەکات کیژانیش وەک کوڕان بنێردرێنە بەر خوێندن. جا دایکی ڕەعناش زوو زوو ئەو شیعرەی وەبیر مێردەکەی دەهێنایەوە. ڕەعنا تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێند. بەڵام پاش ئەوە دەستیان لە خوێندن پێهەڵگرت، تا لە ڕۆژێکی بەهاردا چاوی بە عەولە سوور کەوت و شەیدای یەکتربوون. ڕەعنا لەسەرەتاوە نەیدەوێرا بۆ دایکی باسبکات، دەترسا ڕێگای لێبگرێ و چوونە بازاڕی لێ قەدەغە بکرێت، عەولە سووریش نەخوێندەوار بوو ئەگینا هەر زوو نامەی بۆ دەنووسی. ڕۆژێ عەولە سوور هەلی دەستکەوت و لەپەنای دیوارێکدا ماچێکی کرد و پێی وت " کچێ چەند ڕۆژێکە نەمبینیوی ئەوە لە کوێ بووی وەختە ئاگرم تێبەربێ. لەڕاهی خودا پێم بلێ کچی کێیت وماڵتان لە کوێیە"

ڕەعناش نادڵی لە ماچەکەی نەکرد بەتایبەتی کەسەیری کرد کۆڵان چۆڵەو کەس دیارنییە، بەنازێکەوە پێی وت"ماڵمان لەگەرەکی "باخان"ەو کچی وەسمانی دەلاکم پێدەڵێن." عەولە سوور بەدەنگێکی نزم پێی وت" هەی بەقوربانی خۆت و باوکت و گەڕەکی باخان بم هەر سبەی ئێوارە دێمە داوات". ئەو شەوە عەول و ڕەعنا خەویان لێنەکەوت. ڕەعنا ترسی ئەوەی هەبوو ماڵەوەیان بەم خۆشەویستییە بزانن و بەزۆر بیدەن بە ئامۆزاکەی، عەولیش دەترسا کچەی نەدەنێ لەبەر ئەوەی تازە هاتوونەتە شار و بە لادێییان دابنێن. هەرچەندە ئەم دوکانی کوتاڵ فرۆشیی هەیە و ناویشی وەک بازرگانێکی دەستپاک و ڕاستگۆ دەرکردووە، دڵیشی بەوە خۆش بوو کەناو و ناوبانگی دەبێتە یاریدەدەر بۆ ئەوەی دەست بەڕوویەوە نەنێن.

بۆ ڕۆژی دوایی پاش نانی بەیانی ڕەعنا ماڵەکەی جوان پاککردەوە و بە ئەسپایی بە دایکی وت :

- دایە گیان، دەزانی چی، ئەمڕۆ میوانمان دێت، مەبەستم ئەوەیە ئەمڕۆ دێن بۆ خوازبێنیم.

- کچەتیوو داوای چی! پێش چەند مانگێک دەستت نا بەڕووی ئامۆزاکەتەوە.

- دایە گیان ئەمە یەکێکی ترە، پیاوێکی گەلێ باشە و منداڵکاریش نییە وەک ئامۆزاکەم. دوکانێکی گەورەی هەیە و پیاوێکی دامەزراوە.

بە ترسەوە وتی :

- ئەزانی کێیە؟ عەولە سوورە، ئەوەی کە کوتاڵی لێ دەکڕین. بیرت دێ وتت خوا بەختێکی باشی بە دایک و باوکی بەخشیوە کە کوڕێکی وای پێداون. ئەی تۆ ناتەوێ پیاوێکی وا ببێ بە زاوات.



- ئەی چۆن زانیت دێتە داوات ؟

- خۆی پێی وتم.

- بۆ چەتیو شتێکت هەبووە لە گەڵی؟

- نا دایە گیان، بەڵام بەخوا منیش ئەوم زۆر خۆشدەوێ. هەر لەیەکەم جارەوە کە بینیم چوو بە دڵما. هەرچەندم دەکرد لەیادم نەدەچوو.

- ئێستا دەزانم بۆ وا ئازابووی بۆ چوونە بازاڕ. بەڵام باشترە ئەمڕۆ نەیەن تا تۆزێ باوکت ئامادە دەکەم و زمانی تاقیدەکەمەوە بزانم چی دەڵێت، زوو خەبەری بدەرێ کە هاتنەکەیان دوابخەن.

ئیتر ڕەعنا لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات و قاچی زەوی نەدەگرت. دایکیشی خۆی ئاسایی هەموو شتێکی وا بەجوانی ڕێکخست کە مێردەکەی ناڕەزایی دەرنەبڕێت. لە سەرەتادا باوکە تۆزێ مینگەمینگی کرد گوایە چۆن ئەم کچ بدات بەبێگانەیەک لە کاتێکدا کچەکە ڕازی نەبووە شوو بە ئامۆزای خۆی بکات، بەڵام دایکە هەرچۆنی بێت مێردەکەی ڕازی کرد. خزم و ئامۆزاکان لە باوکی ڕەعنا خان دڵگران بوون و تەنانەت بۆ شاییەکەشی نەهاتن و قسەو قسەڵۆکێکی زۆریشیان خستنە سەر. گوایە کچیان بە بێگانە داوە. عەولە سووریش بەم کەینو بەینەی دەزانی بۆیە بەپێی توانا دەیویست لە قسەی خەسوو و خەزووری دەرنەچێ و نازی کچەکەیان هەڵگری. تا مردیشن ڕێزی گرتن و هەرچی سەروەت و سامانیشی هەبوو خستبووە ژێردەستیان، تەنانەت کە باوکی ڕەعناش نەخۆش کەوت چەند جارێ بردیە لای ناودارترین پزیشک و خزمەتێکی زۆری کرد.

ڕەعنا و عەولە سوور مردن لێکی جیاکردنەوە، خۆشەویستی نێوانیان ببووە چیرۆکی سەرزاری شارەکە. دەڵێن ڕۆژێ لە ڕۆژان عەول قسەیەکی ناشیرینی لە ڕووی ڕەعنادا نەکردووە و هیچ کاتێکیش دڵی نەشکاندووە. هەروا ئەویش مێردەکەی زۆر خۆشدەویست و ڕێزێکی زۆری خەسووی دەگرت. خوا هەڵناگرێ باجی حەلاویش بووکەکەی گەلێ خۆشدەویست و هەموو ناسیاوانیان دەیان گوت ئەم بووک و خەسوویە یاسا گشتیەکانی بووک و خەسووێتییان سڕیوەتەوە و وەک و کچ و دایک پێکەوە دەژین. مردنی ناوەختی عەولە سوور کارێکی وا جەرگبڕانەی کردبووە سەر ڕەعنا خان و باجی حەلاو کە هەردووکیان ژیانیان لە پێش چاو ڕەش ببوو، ڕەعنا لەگەڵ خەم و دوکانەکە و منداڵەکانیدا مایەوە، تا دەهات توانای کەمتر دەبوەوەو ماندووبوونی زۆر پێوە دیار بوو، بەڵام هەرچۆنێ بێ هەوڵی دەدا هێز و بڕشت بە خۆی بدا تا بتوانێ دroomanەکەی بکات.

# 3

ئەوا دوو مانگ بەسەلامەتی تێپەڕی و لەکارەکەمدا سەرکەوتووم، ئەی قابیلە بۆ سەرکەوتوو نابم هەروەک ماڵ پاککردنەوەکە وایە، هەر لە منداڵییەوە فێر بووم هەموو کارێکی ناوماڵ بکەم. دایکم فێری هەموو کارێکی دەکردین. بەڵام لەسەرەتاوە تۆزێک ترسم لە دڵا بوو، گومانم لە هەموو کەس دەکرد و نەمدەوێرا قسە لەگەڵ کەس بکەم، ئێستاش دوو کچ بوونەتە هاوڕێم و هیچ نەبێ بۆ فێربوونی زمان باشە، لە جارانیش زیاتر دەخوێنم، وا خەریکە دەبووژێمەوە و تۆزێ دێمەوە سەر خۆم. ئەوەی زیاتر دڵخۆشی کردووم ئەم مانگە پارەیەکی باشم بۆ دایک و براکانم ناردەوە. ئای دایە گیان چەندم خۆشدەوێی، چ دایکێکی میهرەبان و بە جەرگی. شەرت بێت ئیتر نەیەڵم بێ پارەبیت و بەو چاوە کزانەتەوە دروومان بکەی. لە تۆنی دەنگتدا هەستم کرد چەند دڵخۆش بوویت کە پێم وتی ٥٠٠ دۆلارت بۆ دەنێرمەوە. لەخۆشیا نەتدەزانی چی بڵێیت، هەر ئەوەندەت وت " ڕۆڵە گیان لە دەمی خۆتی مەگرەوە ئاگات لەخۆت بێت، هەر تۆمان هەیە". براکانم هەروەک خۆیانن ئەرکیان بەسەر دایکمەوەیە. پێمگوت "دایکە گیان لەمەو دوا کەسێک بگرە یارمەتیت بدات و خواردنی باش بۆ خۆت و کوڕەکان بکڕە. من ئیتر هەموو مانگێ شتێکت بۆ دەنێرمەوە". دوایی دەستت کرد بەگریان و داوای لێبووردنت لێکردم. خۆ دەزانم تۆ منت زۆر خۆشدەوێت و ناخۆشی منت ناوێ، بەڵام کێ دەیزانی وام بەسەر دێت و هاتنەکەم بۆ ئێرە ئەم چیرۆکە سەیرەی لێ پێکدێت.

هەست بە تەنیاییەکی زۆر دەکەم بەتایبەتی ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە. زۆربەی کات لە ماڵەوە و



بە تەنیا کات دەبەمە سەر. تا ئێستاش ناونیشانی ماڵەکەم بە کەس نەداوە، تەنیا ئەو دوو ژنە هاوزمانە ژمارەی تەلەفۆنەکەم دەزانن، ئەوانیش بەڵێنیان پێداوم کە بەکەسی نەدەن. ئەوان هێشتا لە سەنتەری ژنان ماونەتەوە، لەبەر ئەوەی منداڵیان هەیە، تۆزێ گرانترە شوێن بدۆزنەوە. ڕێزان دوو منداڵی هەیە، نازانم ئەو نەگبەتە بۆ وا زوو منداڵی دروستکرد. خۆ ماوەیەک بوەستایە تا ئەم کابرایەی بەباشی بناسیایە پاشتر منداڵی ببوایە. ئەویش بەشەرتی ئەوروپا شووی کرد. بێ یەک و دوو بێ بیرکردنەوە بڕیاری دا شوو بە یەکەم داواکاری ئەوروپانشین بکات. لەگەڵ ئەوەی خێزانەکەی ئەو هیچ گرفتێکی ئابووری نەبوو. خۆیشی تابلێی کچێکی زیتەڵەو زیرەکە، هێندەش جوانە هەر حەز دەکەیت تەماشای بکەی.

ئەم پیاوانەی خۆمان کە لە ئەوروپا دێنەوە وڵات بە دوایی کچی ڕەنگکاڵدا دەگەڕێن، کام کچەی جوان و گەنجە دەستی دەخەنە سەرو دەیهێنن، زۆریشیان جیاوازی تەمەنیان یەکجار زۆرە، بەڵام کەس گوێ ناداتە جیاوازی تەمەن. خۆ ئەوەی منیش هەروابوو. جیاوازی تەمەنمان پانزدە ساڵ بوو، بەلامەوە زۆر ئاسایی نەبوو، بەڵام باری من جیاواز بوو، نەشمدەویست قسەی دایکم بشکێنم، تاقە هیوام ئەوەبوو لەو بارە ئابوورییە نالەبارە ڕزگاری بکەم. تەنیا سێ ساڵم مابوو کۆلێژی پزیشکیم تەواو دەکرد و دەستم بەکاردەکرد، ئیتر پێویستیشمان بە هیچ نەدەبوو، دایکم خەمی براکانم دایگرتبوو، لەوە دەترسا بکەونە نەخۆشخانە و پارەمان نەبێ عیلاجیان بکەین. ئەم کابرایەش بەڵێنی پێدا لە ماوەی چەند مانگێکدا من دەگەیەنێتە ئەوروپا و نایەڵێ دایکم موحتاج بێت. تا مینش لەوێ بووم بە دووجار ٥٠٠ دۆلاری بۆ ناردین، ئیتر دایکم وایدەزانی کووره هەنگی دۆزیوەتەوە و قاچی نەدەکەوتە سەر زەوی، بەشبەحاڵی خۆم هیچ دڵم بەو شووەم خۆش نەبوو.

ئێوارەیەکی درەنگ نەورۆزی هاوڕێم کە لە کۆلێژی ئاداب دەیخوێند و منی خۆشدەویست، لە دەرگای دا. وشەکانی بوونە تارمایی گومان و نیگەرانی. حەزم دەکرد وەک کچەکەی دراوسێمان کەڕ بوومایە، حەزم دەکرد ئەو ئێوارەیە دوای دلێر بکەوتمایە و لەگەڵ ئەودا ئێستا لە ئامێزی گڵدا بوومایە. دەمزانی خۆشیدەوێم، ئێستا لە ناسکی ئەو هەستە خنکاوەی ئەو تێدەگەم.

– هەتاو گیان ئەوە چۆن کاری واتکردووە، ئەزانی من تەواو دڵگران بووم، واتێنەگەی کە حەزم

نەکردووە شووبکەی، بەڵام ئەو کوڕە شیاوی تۆ نییە، لە دەرەوەش کەسێکتان نییە ئەم کابرایە بناسێ. من هاوڕێیەکم هەیە لە هەمان وڵات دەژیت کە ئەم کوڕەی لێیە. باوەڕت بێت دەڵێت کابرایەکی تەواو نییە، تا ئێستا لەگەڵ چەند کچە سوێدییەکدا ژیاوە و لەگەڵ کەسیان نەیبردۆتە سەر، گەلێ گرفتی هەبووە تەنانەت لە یەکێ لەو کچانەی داوە و ئاکام چوار مانگ زیندانی کراوە. بۆیە خەمی تۆمە. ناشزانم تۆ چۆن بڕیارێکی وات داوە. خۆ تۆ تەنیا سێ ساڵت ماوە چ مەجبوری کاری وادەکەیت.

ئیتر نەمتوانی خۆم ڕابگرم دەستم کرد بەگریان، فرمێسک وەک ڕەهێڵە دابارییە خوارەوە. ئەویش تەواو شڵەژا.

– ببوورە هەتاو، من نامەوێ بریندارت بکەم، بەڵام تەنیا ویستم ئاگادارت بکەمەوە. من دڵگران بووم کە ئەمەم زانی. دەشزانم کە تۆ هیچ شتێک لە بارەیەوە نازانی.

کە دایکم هاتە ژوورەوە و چاکەی بۆ هێنااین، ئەو بێ دەنگ بوو، دایکم کە سەیری منی کرد دەگریم بەبێدەنگی چووە دەرەوە.

– خۆ ئێستاش نەچووە بچێ دەتوانی پەشیمان ببیتەوە.

– باوەڕناکەم تازە کار لەکار ترازاوە، بەلایەنی زۆریشەوە لەم ماوەیەدا ئیقامەکەم دەردەچێ و دەبێ بڕۆم.

کە ئەمەم وت چاوی پڕبوو لە فرمێسک و چاکەشی نەخواردەوە و هەستاو چووە دەرەوە.

دایکم شپرزە و نیگەران بوو.

– کچی شیرینم چی ڕوویداوە، نەڵێی ئەم کوڕەت خۆشدەوێ و ئێستاش پەشیمانی لەو کارەی کە کردووتە ؟.

– نا دایە گیان هیچ شتێک لە نێوان من و ئەم کوڕەدا نییە. ئەو منی خۆشدەوێت، بەڵام لەم ڕووەوە هیچ جۆرە قسە و باسێک لە نێوانماندا نییە، ئەو دەڵێت ئەم دەزگیرانەی من کابرایەکی خراپە و لەگەڵ چەند ژنێکی تریشدا ژیاوە لە وێندەر.

دایکم دەستی کردە ملم و دایە پرمەی گریان. بەکوڵ دەگریا هەروەک ئەو کاتانەی کە باسی باوکم دەکات یا کە دەچێتە سەر گۆڕەکەی.



– باوەڕناکەم وابێ کچم. ئەو کوڕێکی ڕێکوپێک دیارە، ئەوە نییە ئەو هەموو پارەیەی بۆ ناردین. ئەم کوڕەش لەوە دەکات تۆی خۆش بوێ، بیەوێ پەشیمانت بکاتەوە. کیژەکەم هیوادارم وانەبێت، خۆ گەر وابێ دڵم دەوەستێ.

– ڕاست دەکەی ئەم کوڕە دەمێکە منی خۆشدەوێ، ڕەنگە بیەوێ پەشیمانم بکاتەوە، بەڵام دەڵێت لە برادەرێکی خۆی پرسیووە.

– باشە ئەم حەقی چییە بەسەرەوە سۆراخی ئەم دەزگیرانەی تۆ بکات، خۆ تۆ داوای شتی وات لێنەکردووە.

– نا دایە گیان لەو ڕۆژەوە کە بڕیارم داوە ئەم شووە بکەم، ئەمم نەبینیوە دیارە ئەو لە قوتابیانی کۆلێژەوە بەر گوێی کەوتووە.

دایکم چایەکەی ئەوی خواردەوە و بەبێ دەنگی پیاڵەکانی خستە سەر سینییەکە و چووە دەرەوە و منیش لەسەر جێگاکە پاڵکەوتم. لەو ڕۆژەوە ترسێکی گەورە کەوتە دڵمەوە، هەرچەندم دەکرد هەستم بەهێمنی نەدەکرد تا هاتم و هەموو شتێکم بە چاوی خۆم بینی. بەم شێوەیە شووم بەم کابرایە کرد، بەشێکی ناچاری و بەشێکی تری مۆدەی ئەوەی کچ ئەو کچەیە شوو بە ئەوروپانشینێک بکات، ئەگینا قەیرە دەبێ و قیتار جێیدەهێڵێت، بەلای دایکمەوە زۆر گرنگ بوو پێش ئەوەی زانکۆ تەواو بکەم خوازیارم هەبێت. ئەو کابرایەش درۆزن دەرچوو. بە دایکمی دەگوت هەرکە گەیشتین دەیخەمە کۆرسێکی زمانەوە تا خێرا فێری زمانەکە بێت و لە خوێندنەکەی دوانەکەوێ. کەچی خۆشی ئەوە چەند ساڵە لەم وڵاتەدایە هێشتا سوێدییەکی شەقوشڕیش نازانێت، ئەمەش قەینا بەڵام هەر ڕێگای نەدام کۆرسی زمان تەواو بکەم.

ڕێزان خۆی بۆ هەر ئەوروپانشینێک کوشتبوو بێتە خوازبێنی. هەروەک خۆی دەڵێت چەند کوڕی باشی خاوەن شەهادە داوایان کردبوو، کەچی ئەم هەر چاوەڕوانی سوارەی خەونەکەی بوو، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان کابرایەکی ئەوروپانشین داوای کرد کە شانزە ساڵ لە خۆی گەورەتربوو، لە ژنەکەشی کە لێی جیابببووەوە دوو منداڵی هەبوو، ئیتر نازانم ڕێزان خان بۆ دوو منداڵی تریشی کرد بەبار بەسەرییەوە. لەیادمە ئەو ڕۆژەی کە هاتە لامان بەخۆی و منداڵەکانییەوە هێندە شپڕێو بوو دەتگوت هەموو ژیانی لە گونددا بردۆتە سەر. منداڵەکانیشی پەڕپووت دیاربوون، کە مارییا لێی پرسی بۆ

جلی بۆ منداڵەکانی نەهێناوە: وتی "بۆ ئەو کەربابەی مێردم فلسێکی دەدامێ تا شتیان بۆ بکڕم".

ڕێزان لەگەڵ ئەوەی نارەحەتی زۆر دیبوو لەگەڵ مێردەکەیدا، بەڵام لە گاڵتەی خۆی نەدەکەوت ئیتر ئێمەش بەپێی توانا یارمەتیمان دەدا و ئاگاداری منداڵەکانی دەبووین.

- ڕێزان خان بۆ وا زوو ئەم دوو منداڵەت دروست کرد، خۆ چاوەڕوانت بکردایە تا تۆزێک یەکترتان دەناسی ئەوکات بڕیاری منداڵ کردنت بدایە.

- جا گیانەکەم ئەوەندە عەقڵم هەبووایە ڕۆژم بەم ڕۆژە دەبوو، ئای گەر دەزانی چەند بێ عەقڵ بووم. یەکێکی وەک من لە ماڵە باب و لە وڵات هیچم ناتەواو نەبوو. باوکێکی دەوڵەمەند و دەسترۆیشتوو، خێزانێکی ناسراو و سەرنجڕاکێش. گەر دەزانی چەند کەس هاتوونەتە داوام، دەستم بەڕووی هەموویانەوە نا، هەر چاوەڕوانی ئەوروپانشینێکم دەکرد بێت بۆ داخوازیم. دایکم تکاو ڕجای لێکردم کە پەلە نەکەم، گەر مەبەستم تەنیا خارجە ئەوا باشترە واز لەم شووەم بێنم، بەڵێنی پێدام گەر شوو بکەم بە یەکێک لە وڵات لای خۆمان، ئەوا یارمەتیم دەدا دەرچین بۆ ئەوروپا، گرنگ ئەوەیە شوو بەیەکێک بکەم کە باش بێت. وامدەزانی گەر شوو بەم مێردە نامۆبارەکەم نەکەم ئەو شیرینیەی کە لە ئەوروپا دابەش دەکرێ بەشی منی لێ نامێنێتەوە، بۆیە هەر زوو ڕازی بووم شوو بکەم.

- دە پیرۆزت بێت شووی ئەوروپاو شیرنی ئێرەت نۆش گیان بێت.

- باش نۆشی گیانم بووە. ئەی نابینی بە دوو منداڵەوە لە کوێدا کەوتووم.

- باشە بۆ وا زوو منداڵت دروست کرد ؟

- قسەی خۆخۆمان سێتبئەوەم هەبوو بگەڕێتەوە بۆ ژنی یەکەمی. جا لە هەمووی خۆشتر هەر کە منی هێنا ژنی یەکەمی کەوتە نازونوزکردن بە سەریدا، هەموو ڕۆژێ تەلەفۆنی دەکرد کە منداڵەکان نەخۆش کەوتوون، دەبێ بچێ بیانبات بۆ نەخۆشخانە یان خانم خۆی نەخۆش کەوتووە و دەیەوێت ئەم بڕوا و منداڵەکان بهێنێتە لای خۆی. ئابەم جۆرە ئەم ژنە ژیانی لێ تاڵ کردبووین، منیش ڕۆژێک وتم کەڵکی نییە باشترە منداڵێک بکەم بەڵکە ئیتر بە منداڵەکەی منەوە خەریک بێت و واز لەو جامبازە بێنێ. هەر زوو سکم پڕبوو پاش نۆ مانگی بۆ نەگبەتی ئەم دووانەیەم بوو. خۆ خوا نەیبڕێ، بەڵام قوربانی بم بۆ تاقە منداڵێک نەبوو، ئیتر بەسترامەوە و ژنەی ئەولاش منداڵی



دایەوە بەسەردا. جا ئەمجارە دەبوو خزمەتی منداڵەکانی ئەویشم بکردایە.

- بۆ ئەو ئاگاداری ئەوەی نەکردی کە لە ژنەکەی تری منداڵی هەیە.

- با، ئەو وتی کە لە ژنەکەی تری جیابوەتەوە و دوو منداڵیشیان هەیە، دوو هەفتە جارێک شەممە و یەکشەممەیەک دێنە لای ئەم. جا ئەوکات من وتم دوو ڕۆژ لە دوو هەفتەدا چییە، هەرچۆنی بێ خزمەتیان دەکەم، کەچی نەمزانی وام بەسەر دێنێ.

- ئەی دەستی ژنە کۆنەکەی خۆش بێ ئاوای لێکردی.

- کچێ دەستی بشکێ. خۆ ئەو ژیانی لەو ملحیزە تێک نەدا، ژیانی لە من و منداڵەکانم تێکدا. ئەمەش هەر قەینا بۆ فلسێکی دەدا پێم. ئەمەش هەر قەیناو قەبوڵم کرد، بەڵام ڕێگەی نەدەدام تەلەفۆنێک بۆ ماڵی باوکم بکەم، ئەوان لەوێوە تەلەفۆنیان بۆ دەکردم. لە سەرەتاوە ڕووم نەدەهات ئەم ڕاستییەیان پێ بڵێم. یارمەتییەکەی سۆسیالیشی وەردەگرت و هیچی بەمن نەدەدا، وایدەزانی پارە بۆ ماڵی باوکم دەنێرمەوە. هەرچەندیشم پێدەوت کە ماڵی بابی من موحتاجی پارە نین، کەچی بڕوای پێنەدەکردم، خۆ دەیزانی ماڵی بابم چ ژیانێک دەژین.

- تۆش سەیر بووی، خۆ جارێک سەفەرێکی ئەوروپات بکردایە، تا بەچاوی خۆت ئەوروپا حەیاتەکەت ببینیایە.

- هەر دەمێک بوو خەوم بەوەوە دەبینی کە بێمە ئەوروپا و بە ئارەزووی خۆم جل لەبەرکەم ، کەس پێم نەڵێ عەیبە، یان کە تەنورەیەکی کورت لەبەر دەکەم کوڕان فیکەم بۆ لێنەدەن. خۆ لای خۆمان ناتوانی بە ئازادی تەماشای کوڕێکی جوان بکەی یەکسەر هەزارو یەک توانجت تێدەگرن. ئەوانەشی کە دێنە ئێرە هەر خەریکی فشەو فیشاڵن.

- ئەی بێ قەزا بی شتی وامان هێندە زۆرە هەر باسناکرێ. فەرهادە چاو زەقی گەڕەکەکەمان چوار ساڵ بوو لێرە دەژیا و هێشتا کۆرسی زمانی تەواو نەکردبوو، کەچی کاتێک گەڕایەوە وڵات دەیوت گوایە لە زانکۆی ستۆکهۆڵم فەلسەفە دەخوێنێ، کەچی نەیدەتوانی دوو ڕستەی ڕاست بە سویدی بڵێ.

- ئەی بۆ خولەی دراوسێمان ناڵێی، باوەڕدەکەی لێرە لە ڕێستەورانێکدا قاپشۆر بووە، کەچی کە هاتەوە قاچی دەخستە سەر قاچ و دەستی بە سمێڵە تاشراوەکەیدا دەهێناو دەیگوت خاوەنی

ڕێستەورانێکی گەورەیە، هەی ترحێو، ئاخ مەگەر جارێکی تر نەڕۆمەوە جا بزانە چۆن کارتی هەموویان دەخەمە سەر مێز. دەی باشە ئەوە من کوێری ئەوروپا بووم، ئەی تۆ بۆ ئەم شووەت کرد و گەیشتیتە ئێرە.

دەستم بە پێکەنین کرد و هەوڵمدا خۆم لە وەڵامی پرسیارەکەی بدزمەوە.

– خوا ڕەحمی لەمن کرد کە تۆی هێنایە ئێرە، دەزانی ئەوە ساڵ تێپەڕی من هێندەی ئەم چەند ڕۆژە پێنەکەنیوم.

– دەی دەی خۆت گێل مەکە، ئاگام لێیە هەموو جارێک خۆت لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لادەدەیت، بەڵام ئەمجارەیان وەک کارەبا دەتگرم تا وەڵام دەدەیتەوە.

– نامەوێ خۆم بدزمەوە، بەڵام بەباسکردنی ئەو مەسەلەیە برینەکانم دەکولێنەوە، باری من زۆر جیاوازە، من بە ئارەزووی خۆم ئەم شووەم نەکرد بەڵکو لەبەر ناچاری و بۆ یارمەتیدانی دایک و براکانم کەسەقەت و کەمئەندامن.

ئەمەم وت و بێدەنگ بووم ئیتر خەمێکی زۆر دایگرتم و هەستام و ئەوم بە جێهێشت. زۆربەی کاتمان پێکەوە دەبردە سەر تا شارا خانیش بە خۆی و منداڵێکی ساواوە هاتە ڕیزمانەوە. ئێتر بە سێ قۆڵی کارمان دەکرد و هەر پێکەوە خواردنمان دروست دەکرد، زۆرجاریش خەریکی پاککردنەوەی ژوورەکانمان دەبووین، جا ژنێکی سوێدیشی لێبوو، زوو زوو دەهاتە لامانەوە و لەگەڵمان خەریکی ماڵ پاککردنەوە دەبوو، ئەو زۆر حەزی دەکرد لەگەڵماندا تێکەڵاو بێت، ڕێزان و شارا سوێدییەکەیان لەمن باشتر بوو هەرچۆنێ بێ ئەوان توانیبویان بخوێنن. کەس وەکو ئەم کەربابەی من نەبوو. ئەوەی ئەو بە منی کرد تەنیا کەسێکی نەخۆش دەیکات.

ئێستا لەماڵی خۆمدا دەژیم و کار دەکەم. نازانم تاکەی دەتوانم بەم شێوەیە بژیم، لەهەموو چوونە دەرەوەیەکدا ترس وەک مۆتەکە بەدوامەوەیە و دەستم لەسەر دڵمە. خۆ دەشزانم لێرە ناژی، تارماییەکە و لەبەرچاوم ون نابێ. لە وەڕینی هەموو سەگێک ڕادەچڵەکێم، لە خرەی کلیل دەستم دەلەرزێ.

لەم تەنیاییەمدا بیر لە هەموو ساتەکانی ژیانی خۆم دەکەمەوە، ژیانێک پڕ لە خۆشەویستی و کارەساتی دڵتەزێن. کە باوکم مرد هێشتا منداڵبووم، تا ئێستاش هەست بە گەرمی باوەشی باوکم



دەکەم. تا ئێستاش خۆشەویستی نیگاکانی سۆز بە دڵم دەبەخشێ. دایکم زۆر جار باسی پەیوەندی خۆی و باوکمی بۆ دەکردم، کە بیر لە هەندێ لایەنی ژیانیان دەکەمەوە سەرم لەو خۆشەویستیەی ئەوان سوڕدەمێنێ. ئەوەندە بە تەنگی یەکترەوە دەهاتن هەر باس ناکرێ.

خۆ باوکم نەخوێندەواربوو، لە ژیانیاندا خۆشەویستییەکی قوڵ بەرجەستەببوو. بۆیە کە گەورەش بووم خەوم بەوەوە دەبینی کەسێک لە نموونەی باوکم بکەوێتە ژیانمەوە. دایکم دەیگێڕایەوە، کە باوکم گوتوویەتی " من خۆم نامەیەکم بۆ ناخوێندرێتەوە و حیساب و کیتابی دوکانەکەشم پێناکرێ. بۆیە ئەوەی بتوانم دەیکەم تا منداڵەکانم مەکتەب تەواوبکەن... ". باوکم بە چاوێکی پڕ لە بەزەییەوە سەیری دوو برا کەمئەندامەکەمی دەکرد، زۆرجار کە ماچی دەکردن چاوەکانی پڕ لە فرمێسک دەبوون، منیش هەستم بەم میهرەبانییەی دەکرد کە لە ڕۆحمەوە نزیکە. هەر لە منداڵیشمەوە وەک موگناتیس پێوەی دەنوسام و بەرم نەدەدا تا دەیخەواندم، لەیادمە زوو زوو نەنکیشم لە باوکم توڕە دەبوو دەیوت "کوڕم دەڵێی ئەم کچەت لە ئاسمانەوە بۆ هاتووەتە خوارەوە وا هێندەت خۆش دەوێت؟" بۆیە نەنکم بە زۆر پەلی دەگرتم و لە باوکمی دوور دەخستمەوە و منیش دەستم دەکرد بەگریان و دەچوومەوە لای. پاش مردنی باوکم حاڵمان تێکچوو، کەسیش بە دەنگمانەوە نەهات.

دایکم بەو ئاواتەوە بوو کە دلێری برام گەورە بێ و دوکانەکەی بۆ بکاتەوە. هەر کە براکەم گەورە بوو دوکانەکەی کڕییەوە کە دەمێک بوو پارەی بۆ کۆدەکردەوە، دلێری لەسەر داناو خۆشی یارمەتی دەدا و هەر لەوێش قوماشی دەهێناو دەیدرووی. دایکم نیازی وابوو دەست بکات بەفرۆشتنی جل و بەرگی دووراو. بەڵام ئەم ئاواتەی بەدی نەهات، ڕۆژێکیان شار شڵەژاو هەرچی گەنج هەیە ڕژانە سەر شەقامەکان، دلێریش وەک ئەوانی تر دوکانەکەی داخست و هاتە ماڵەوە، دایکم زۆر تکای لێکرد کە نەچێتە دەرەوە و لە هیچ خۆپیشاندانێکدا بەشداری نەکا. لە یادمە دایکم وتی" کوڕم ئێمە هەر تۆمان هەیە گەر تۆ شتێکت لێ بێ ئێمە ڕوو لە کوێ بکەین. کەسێک نییە بێتە هانامانەوە مەگەر دەرو دراوسێ فریامان بکەون". ئەوکاتیش براکەم گەلێ سەرگەرم بوو، بەلایەوە شەرم بوو خۆی بشارێتەوە. لەکاتێکدا هەموو هاوڕێیانی ڕژابوونە سەر شەقامەکان ئەو لە ماڵەوە دانیشێ. هیچ دەستەڵاتێکم نەبوو، دەمزانی دایکم ڕاست دەکات. بۆیە کە براکەم ویستی بچێتە

دەرەوە دوای کەوتم و وتم دلێرگیان مەچۆرە دەرەوە و جێمان مەهێڵە، یان ئەوەتا منیش لەگەڵ خۆتدا بەرە. دەستی گرتم و ماچیکی کردم" برۆ لای دایە من هەر ئێستا دێمەوە، خەمت نەبێ من دەبێ چەند برادەرێک ببینم ".

شەو نەهاتەوە، من و دایکم تا بەیانی چاوەڕوانی بووین، ئەو شەوەش تەقە و هەرایەکی زۆر بوو دەیانوت "مەنعەتەجەولە" و نابێ کەس لەماڵ دەرچێ، ئێمەش بەوە دڵخۆشی خۆمان دەدایەوە کە گوایە لەماڵی برادەرێکی ماوەتەوە. کە ڕۆژ بووەوە دایکم عەباکەی دا بەسەریداو کەوتە گەڕان بە دوایدا، منیشی بەدیار براکانی ترمەوە بەجێهێشت، پاش چەند سەعاتێک دایکم بە قژڕنین و شیوەن و هاوارەوە هاتەوە، ئیتر زانیم ئەوەی لێی دەترساین ڕوویداوە. کاتێک باوکم مرد، بەهەمان شێوە شیوەن و گریانە سۆزدارییەکانی بەردی دەتواندەوە. دایکم دەنگێکی زۆر تایبەتمەندی هەیە، گەر خەڵکی وڵاتێکی تر بوایە دەبووە گۆرانیبێژێکی بە توانا. هەر کە دەستی بەلاواندنەوەی دلێری برام دەکرد دەرو دراوسێی دەهێنایە گریان، هەندێ لە دراوسێکانمان پێیان دەگوت کە بچێ بە پارە مردووی کەسانی تر بلاوێنێتەوە، بەڵام ئەمەی نەکرد.

هەوڵدەدەم خۆم لە یادکردنەوەی ئەو ڕۆژانە لادەم، بەڵام دیارە لە دەسەڵاتی خۆمدا نییە، بەشیکی زۆری مەودای بیرکردنەوەی داگیرکردووم، لەگەڵ ئەوەی زۆر ڕووداوی تری دڵتەزێنم بەسەرهاتووە، بەڵام مردنی باوکم و براکەم کارەساتێکی وا نین کە لە یادبکرێن. هەر کە سەیری وێنەکانیان دەکەم پێم وایە هێشتا زیندوون و گوێم بۆ ڕادەگرن، کەتەماشای چاوەکانیان دەکەم وادەزانم لێم تێدەگەن و لە دڵمدان. لەو باوەڕەدانیم گەر باوکم بمابایە ئەم شووەم بکردایە.

– هەرگیز ڕازی نەدەبووم کە تۆ بەم شێوەیەی ئێستا شووت بکردایە.

– ئەوە چییە، ڕاستییە یان خەیاڵە، ئۆی خوایە هەموو شتم بەسەردا بێنە، بەڵام شێتم مەکە ،بەخێوکردنی دوو هەتیو و دایکمم بەسەرەوەیە.

– نا کچە نازدارەکەم تۆ شێت نەبووی، ئەوەی دەیبینی ڕاستییە، ڕاستییەکی بەرچاو، من باوکتم و هاتوومەتەوە لات، ئاگاداری هەموو گرفتەکانتم. بۆ پێشتر منت نەدەبینی، ئەو شەوانەی کە خەریک بوو لە تینوواندا بخنکێیت، بە جامێک ئاوەوە دەهاتمە ژوور سەرت و دەستم بە ڕوومەتدا دەهێنا. ئەو شەوانەشی کە لەسەرماو لەترساندا لەرزت لێدەهات دەهاتم و دامدەپۆشی، 





بە هێواشی باوەشم پێدادەکردی تا هێور دەبوویتەوە. من هەموو کات لەگەڵ تۆدام، بەڵام تۆ نەتویستووە ئەو ڕاستییە ببینی. بڕوا ناکەی؟ وەرە بزانم گەرمی ئامێزم دەناسیتەوە.

– نا باوکە گیان وانییە، تۆ مردووی من چۆن بڕوا بکەم کە تۆ زیندوو بویتەتەوە، ئاخر شتی وا هەرگیز ڕووینەداوە. لەوانەشە ڕاست بێت، زۆرجار هەستم بەنزیکی تۆ دەکرد، هەستم بە گەرمی هەناسەت دەکرد و وەک شنە بایەک پرچمی دەخستە سەما. وامدەزانی خەون یان خەیاڵە.

– نا کچەکەم من ئێستا بۆ یارمەتیدانی تۆ زیندوو بوومەتەوە، من خۆڕاناگرم لە دوورەوە سەرنجت بدەم و تۆش وا ئازار دەخۆی و گیرۆدەی ئەم کێشە و خەمانە بووی، داوام لە خوای خۆم کرد کە یارمەتیم بدات، تا فریات بکەوم، کەمێک هێزت پێ ببەخشم و ئاواتەکانت بێنە دی. من بەردەوام ئاوێزان و ئاگاداری تۆ بووم. کاتێک ویستت خۆت دەرمان خوارد بکەی، ئەوە من بووم پاڵم نا بەدەستەوە و دەرمانەکەم پێ ڕشتی، ئەی تۆ ئەوکاتە منت نەبینی، ئەی بەلاتەوە سەیر نەبوو چۆن ئەو دەرمانە لە دەستت کەوتە خوارەوە کاتێک کە توند توند شووشەکەت گرتبوو.

– ئای بابە گیان من تەواو بڕیارم دابوو کە خۆم بکوژم. وتم پاش مردنی تۆ و دلێر هیچمان بەسەر نەهات و بەردەوامبووین لە ژیان. بەهەمان شێوە پاش مردنی منیش دایک و براکانم هیچیان لێ نایەت، ئەوەبوو دەرمانەکەم لەدەست کەوتە خوارێ.

– نا هەتاو گیان تۆ نەدەبوو وا بیر بکەیتەوە تۆ کەسێکی بەهرەدار و خاوەن داهاتووی. ئەمە جگە لەوەی بەخێوکردنی دایک و دوو براکەتت لەسەرە، دایکت لەگەڵ ئەوەی پیر نییە، کەچی خەم و خەفەت پەکی خستووە و توانای کاری نەماوە و ئەرکی براکانیشت هێزیان لێبڕیووە. چۆن دڵت هات بیر لەوە بکەیتەوە بەجێیان بهێڵێت. هەر هیچ نەبێ پەڕۆیەک لە دایکت دادرە، دایکت منی لە دەست چوو و بە شەهیدبوونی دلێر جەرگی سووتا...

– ئەی تۆ چۆن دڵت هات ئێمە جێبهێلیت... ئەی تۆ چۆن دڵت هات دایکم بەو گەنجییە سەرگەردان بکەیت. ئەی من، دەتزانی من...

– کچم مردنی من ئەمری خودایی بوو. بەرامبەر ئەمری خودا ناتوانین هیچ کارێ بکەین. من بیرم لەوە نەدەکردەوە بە دەستی خۆم کۆتایی بەژیانم بێنم.

– ئاخر بۆیە منیش پاش مردنی تۆ بڕیارم دا کە خوا نەپەرستم و ڕۆژی هەزارو یەک کفر بکەم،

ئاخر ئەو خودایەم بەنەعلەت کرد چۆن تۆی لە ئێمە سەندەوە، تۆی بۆ چی بوو، ئێمە پێویستمان بە تۆ بوو نەک ئەو.

باوکم لەبەر چاوان ونبوو، تەنانەت کە سەیری وێنەکەشیم کرد هەستم کرد تێڕوانینەکانی وەک جاران نین، بڵێیی خودا لە کفر و جنێوەکانی من تووڕە بووبێ و جارێکی تر ڕێگەی نەدا بەسەرم بکاتەوە. یان ئەمەی کە من بینیم زادەی خەیاڵم بێت. خۆ لەوانەشە هەندێ جار هاتبێتە لای دایکم و یارمەتی دابێت، وابزانم دەبێ وابێت، زۆرجار دایکم بەیانیان لەخەو هەڵدەستا دڵی خۆش بوو، زۆرجاریش دەم بەپێکەنین بوو، دەمگوت دیارە ئەمشەو خەوێکی خۆشی بینیوە.

"ها دایە گیان ئەمشەو خەوێکی خۆشت بینیوە وا دەم بە پێکەنینی"، ئەویش دەیگوت "نا کچم لە ژیانی ئێمەماناندا خەوی خۆشیش نەماوە. بەڵام چ دەستەڵاتێکمان هەیە لە بەرامبەر کاری خودایی. هەرچۆنێ بێ مرۆڤ دەبێ باوەڕی بەوە بێت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان خودا جەزای دەداتەوە و دەیحەسێنێتەوە". منیش دەمگوت "جاکەی دایە گیان ئەم پاداشتەمان وەردەگرینەوە، کە مردین، ئەویشمان نەویست". سەیرێکی دەکردم و دەیوت "کچم بەخوا بێ ئیمانیت".

باوکم ڕاست دەکات. بابە گیان دایکم لە ڕۆحی تۆوە هێزی وەردەگرت. هەموو شەوێ بەسەر ئەستێرەیەکەوە بەرامبەرت دەگرت. وا دەزانم ئێستایە، شەوان ئێمەی دەخەواندو دەچوو لە سەر چیمەنی حەوشەکەمان پاڵدەکەوت و گۆرانی دەوت، ئەو ساتانەی کە گوێی لە دەنگی تۆ دەبوو بێدەنگ دەبوو. هەموو شەوێکیش گوڵەباغێکی بۆ هەڵدەدایت و تۆش دەتگرتەوە. تا وایلێهات باخچەکەمان گوڵی پێوەنەما. ئەو شەوانەشی کە هەور ئاسمانی داپۆشیبوو، دەچووە ژووری نووستنەکە و دەگریا.



# 4

ئەوە چوار مانگە کاردەکات، هیچ ڕۆژێ دوانەکەوتووە و هەموو ئەو کارانەشی کە پێی دەسپێردرێن بە باشترین شێوە ئەنجامیان دەدا. کارمەندانی ئەو دوو بەشە زۆریان خۆشدەویست، کەسی بێزار نەدەکرد، هەر کاتێک دەچووە ژوورێکەوە ئیزنی وەردەگرت، دکتۆرەکانیش هەستیان بە ڕێکوپێکی کارەکانی کردبوو. سەرۆکی بەشەکە "هانس" دەیوت دەبێ ئەم کیژە لە کارەکەیدا بەردەوام بێت، کەسێکی وا ڕێکوپێکمان دەست ناکەوێت. دکتۆر هانس هێشتا هەتاوی نەبینیبوو، کە دەچێتە ژوورەکەی خۆیەوە هەموو شتەکان پاککراونەتەوە و خراونەتە جێگەی خۆیان، هانس سەرۆکی ئەم بەشەیە و لە کاری نەشتەرگەریدا ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام تابڵێیی لەڕێکخستنی کەرەستە و ژوورەکەیدا بێ سەروبەرە، تەنانەت لەماڵەوەش لەگەڵ ژنەکەی دەمەقاڵە و کێشەیان هەیە، یارمەتی ژنەکەی نادا. ئەم دووانە هەر لە باخچەی ساوایانەوە پێکەوەبوون و یەکتریان خۆشویستووە و هاوڕێی گیانی بەگیانی بوون، لە دوای قوتابخانە پێکەوە کاتیان بەسەر دەبرد، ئیتر دایک و باوکی هەردووکیان ڕێگەی هیچیان لێ نەدەگرتن. کە بوونەتە هەژدە ساڵیش گواستیانەوە بۆ خانوویەکی بچوک و پێکەوە دەژیان. بە هاوینانیش کاریان دەکرد، هەر لەو کاتەشەوە سارا دەیزانی هانس لە کاری ناوماڵدا تەمەڵ و تەوەزەلە، لەو باوەڕەدابوو کە خێزان دروست بکەن و منداڵیان بێت واز لەم تەمەڵییەی بێنێ. هانس هەر لەسەرەتاوە زیرەک بوو، باشترین نمرەی وەردەگرت و حەزیشی لێبوو کۆلێژی پزیشکیی بخوێنێ. سارایش حەزی لە چوونە دەرەوە و خۆڕازاندنەوە بوو.

کە کۆلێژیان تەواو کرد زەماوەندیان کرد، ئەو کات سارا سکی بە نۆبەرەکەیانەوە پڕبوو. پاش

سێ مانگ لە زەماوەندەکەیان کچێکیان بوو. ئیتر سارا بەدیار منداڵەکەیانەوە دانیشت، هانس لە نەخۆشخانەیەک کاری کرد، هەرکە دەهاتە ماڵەوە خەریکی خوێندنەوە بوو. سارا هەستی بە دڵگرانی دەکرد چونکە جاران هیوای بەوە بوو کە منداڵیان بێت مێردەکەی گرنگی بە کاری ناوماڵ بدات، کەچی بە پێچەوانەوە لە ماڵ دابڕاوە و خشتەی کارەکەشی وابوو کە لەکاتی جیاوازدا کاری دەکرد و ماندووش دەبوو، بەڵام سارا بیری لەمە نەدەکردەوە.

سارا داوای لە هانس کرد کە ئەویش ماوەیەک لە ماڵێ لای منداڵەکەیان بمێنێتەوە تا بتوانێ کاربکات، بەڵام هانس ڕازی نەبوو بۆ ماوەیەکیش واز لەکارەکەی بێنێ. ناچار دایکی سارا کچێکی بۆ دۆزینەوە لە ماڵەوە منداڵەکەیان بەخێوبکات بۆ ئەوەی هەردووکیان کار بکەن. بەمجۆرە ساراش تۆزێ هێمن بووەوەو کەوتە کارکردن. پاش ئەم منداڵە کوڕێک و کچێکی تریان بوو. هانس لە هاوشانی کارەکەشیدا بۆ پسپۆری لە بواری نەشتەرگەریدا درێژەی بە خوێندن دەدا. سەرقاڵی خوێندن بوو، کاتێکی کەمی دەمایەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانیدا بباتەسەر. زوو زوو هەوڵی دەدا پشوویەک وەرگرێ و لەماڵەوە بمێنێتەوە. ئەم پشوودانە دڵدەی سارای نەدەدا، سارا دەیویست ئەویش وەک ئەم ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانی بگرێتە ئەستۆ، هانس مووچەیەکی باشی هەبوو هەر زووش توانیان خانوویەکی گەورە و خۆش لەناوچەیەکی باشدا بکڕن و ئەو کچەشی کە جاران خەریکی منداڵەکانیان بوو هەندێ جار بێت بۆ لایان تا یارمەتی سارا بۆ کاری ناوماڵ بدات.

سارا پێویستی بە خۆشەویستییەکەی جاران بوو. کارەکەی هانسیش وەک دیوارێک وابوو لەنێوانیاندا، ڕوخاندنی زەحمەت بوو. سارا دەیزانی هانس کارەکەی زۆر خۆشدەوێت و هەر لە لاوێتیشەوە باسی ئەوەی بۆ کردووە چەند حەزی لە پزیشکی و لێتوێژینەوەیە. بەڵام خۆ هەموو ئەو دکتۆرانەی کار دەکەن وازیان لە خێزان و منداڵیان نەهێناوە، هەموو خێزانیان هەیە و زۆربەشیان بەختەوەرن. زۆرجار سارا بیری لەوە دەکردەوە کە جیا ببێتەوە، جیابوونەوە لە کەسێک کە زۆرترین کاتی ژیانی لەگەڵ بردۆتە سەر هێندە ئاسان نییە. جگە لەمەش سێ منداڵی هاوبەشیان هەیە و بەبێ ئەویش نەیدەتوانی بیر لەژیانی خۆی بکاتەوە. هانسیش بیری لەوە دەکردەوە خۆی و سارا وەک مەنجەڵ و سەرەمەنجەڵیان لێهاتووە، بێ یەکتری هەڵناکەن، هەرچەند زۆر دەمەقاڵەیان دەبێت و سارا پرتەوبۆڵەی بەسەردا دەکات، هانس دەیوت:" من دەزانم ناتوانم ئەوەی سارا دەیخوازێ بۆی جێبەجێ بکەم، ناشتوانم واز لەکارەکەم بهێنم. دەبێ ساراش لەوە بگات کە من چەند پەرۆشی ئەم



کارەم و لە نەشتەرگەریدا چەند داهێنەرم و چەند ناوبانگم ڕۆیشتووە. سارا نایەوێ لەم ڕاستیە بگات. کاتێکیش بوومە سەرۆکی ئەم بەشە تەنانەت پیرۆزباییەکیشی لێنەکردم، ناچار هەر خۆم هەموویانم بۆ گرانترین ڕێستەورانی شار بانگهێشت کرد".

شیرین کە بۆ چوارمانگ دەچێ لەم نەخۆشخانەیە کاردەکات و هێشتا هانسی نەبینیووە، هەموو ڕۆژێ سەرمێزەکەی پاکدەکاتەوە و ئەو وێنەیەی لە سەر مێزەکەیەتی دەیسڕێتەوە و بۆ ماوەیەک لە وێنەکە دەڕوانێ و دایدەنێتەوە.

لەڕاستیدا بیرم چوو لەسەرەتاوە پێتان بڵێم کە هەتاو ناوی خۆی گۆڕیووە بۆ شیرین و ڕەنگی قژی کاڵکردووەتەوەو چاوە سەوزە جوانەکەشی کردووە بە ڕەش. ئەو چاوە جوانەی کە خۆی دەیوت "ئەم چاوە کاڵەم بۆم بووە بە بەڵا ئەگینا ئەوروپا نشینێک کاری چی بوو بەسەر منەوە". گەر لەمەودوا ناوی شیرینم هێنا بزانن کە مەبەستم کێیە.

ئەو ڕۆژە شیرین گەلێ ماندوو بوو. دیارە زۆریش گریابوو، بۆیە چاوەکانی سووربببونەوە و شەونخوونی شەوێی پێوە دیاربوو، سیستەرەکان هەستیان کرد ماندووە.

– زۆر ماندوو دیاری خۆ تەنیا ژوورەکەی هانست ماوە پاکی کەیتەوە، ئەویش گرنگ نییە، چونکە ئەمڕۆ زوو ڕۆیشتەوە، دەتوانی بڕۆیتەوە ماڵێ.

شیرین نەیدەویست بڕواتەوە، نەوەکو هەمان شیوەنی دوێنێ دانیێتەوە.

– ئەمڕۆ هەر نایەتەوە؟

– پەلە مەکە ئەمڕۆ زوو چۆتەوە و سبەینێ لەگەڵ خێزانەکەیدا دەچنە سەفەر. خۆش بەحاڵی ئەو دەچێتە سەفەر و ئێمەش لێرە کار دەکەین، دەڵێی چی شیرین.

– من بیرلە شتی وا ناکەمەوە، چونکە تازە دەستم بەکار کردووە. ئەی تۆ نیازی سەفەرت نییە؟

– گەر پارە هەبێ بۆ نا، دەزانی سەفەر چەند پارەی تێدەچێ. ئێمەمانان لە ساڵێکدا هەر تاقە جارێک دەتوانین سەفەربکەین. بۆ وا سەیرم دەکەی!! ئێ وایە من بەتەنیا کار دەکەم و دوو منداڵم هەیە و مێردێکی دەوڵەمەندی وەک هانسیشم نییە تا بتوانم لە ساڵێکدا چەند سەفەرێک بکەم. قسەی خۆمان بێت چەند جارێک هەوڵیشم دا ڕاوی بکەم، بەڵام نەکرا.

– ئێ قولاپێکی بۆ هەڵدە خۆ هەموو ڕۆژێ چەند جارێ بەلاتدا تێپەڕدەبێ.

– هەر ئەو، بۆ زۆر کەسی ترم فڕێ داوە و نەیگرتوون، من لەو ڕووەوە بەختم ڕەشەو بۆمنایە.

شیرین بەم چەند وشەیە تۆزێ باری خەمی سووک بوو. دەرگای ژوورەکەی دکتۆری کردەوە و چووە

سەر کورسیەکەی دانیشت و وەک هەموو ڕۆژێ سەیرێکی وێنەی سەر مێزەکەی کرد و بزەیەک گرتی و لە دڵی خۆیدا وتی "بلێیی ڕۆژێ لە ڕۆژان منیش ببمە خاوەنی خێزان و بتوانم خوێندنەکەم تەواو بکەم." چاوەکانی دەکزانەوە و ئەزیەتیان دەدا، بۆیە لینزەکانی لە چاوی دەرهێناو خستنیە قوتووە بچووکەکەی خۆیانەوە و دەمووچاوی شۆرد و ترسی ئەوەشی هەبوو کە یەکێ خۆی بکا بە ژووردا و ئەم نهێنییەی ئاشکرا بێت، بۆیە بە ئەسپایی سەیرێکی دەرەوەی کرد کەسێک لەو ناوە دیار نەبوو تەنانەت سکرتێرەکەی هانسیش لەو ناوە نەمابوو. لە سەر کورسییەکەی دانیشت، کورسییەکی نەرم و شل و بە هەموو لایەکدا دەخولایەوە. چەند جارێ خۆی خولاندەوە و چاوەکانی نوقاند و بیری لەوە دەکردەوە گەر خوێندنی تەواو بکردایە ئێستا دەیتوانی پسپۆڕێتی لە بەشێکدا وەرگرێ. دڵی دەکولا و چاوەکانی نوقاندبوون. بەڕوومەتەکانیدا هۆنهۆن فرمێسک دەهاتنە خوارێ.

هانس بەهێواشی دەرگاکەی کردەوە و بینی کەسێک لە سەر کورسییەکەی دانیشتووە، بەڵام لەبەرئەوەی ڕووی کورسیەکەی وەرچەرخاندبوو، نەیزانی کێیە. بەئەسپایی چووە پێشەوە، سەیری کرد کچێکی گەنمڕەنگی برۆ قەیتانی دانیشتووەو چاوەکانی نوقاندوە و دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک بە گۆنایدا دێنەخوارێ، لەگەڵ ئەوەی چاوەکانی نوقابوون، بەڵام وەک هەتاوی پشت هەور دەروونی هانسیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو. ئەمیش وا پەشۆکا تەنانەت لە گەورەترین نەشتەرگەریشدا دڵی بەو جۆرە لێنادات و دەزانێ چۆن ڕەفتار بکات. ئێستا لەبەردەم ئەم فرمێسکانەدا نازانێ چبکات. ویستی بەئەسپایی بچێتە دەرەوە، بپرسێ ئەم ڕۆحە خەمبارە کێیە لە ژوورەکەیدایە، ترسی ئەوەی هەبوو خەبەری بکاتەوە. دەبێ لەم خەوە ناخۆشە وەئاگای بێنێت و پەنجەرەکەی بۆ والآ بکات، خەمەکانی لەگەڵ هەوردا داباڕێنە سەر سنگی شار. بە هێواشی دەستی خستە سەرشانی، چاوەکانی کردەوە... شڵەژاو نەیزانی چبکات. کەسیان نەجولآن... فزەیان لێوە نەهات. تەنیا تەماشای یەکتریان دەکرد، گوێیان لە ترپەی دڵی یەکتربوو. تەماشای چاوە پڕنزاکانی کرد ئەویش وەک ئەم فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتنەخوارێ. لەپڕێکدا هەردووکیان خەبەریان بوەوە.

– تۆ کێیت؟

– من شیرینم، بە منیان وت کە تۆ چویتە ماڵێ منیش تەواو ماندوو بووم بەسەر کورسیەکەتەوە... ببورە، داوای لێبووردنت لێ دەکەم دکتۆر.

– نا... ئاساییە من هەر شتێکم بیر چووە، دانیشە من وا دەڕۆم.

شیرین هەستا بڕوات، هانس قوتووی لینزەکانی دا بە دەستیەوە و سەیرێکی چاوەکانی کرد.



– ئەو چاوە جوانانەی تۆ پێویستیان بە لینز نییە!

بە نازێکەوە پێکەنی هیچی نەوت و بە بێ ئەوەی سەرهەڵببڕێ لە ژوورەکە چووە دەرەوە. بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە ژوورەکەی خۆی تا لینزەکانی بخاتەوە چاوی و بەرەو ماڵ ڕێگا بگرێتە بەر.

– ئەمە ئەو کچەیە کە ژوورەکەم پاکدەکاتەوە، جاران حەزم لە دانیشتنی ئەم ژوورە نەبوو، بەڵام لەوەتی ئەو پاکیدەکاتەوە هەست بە ئارامییەکی سەیردەکەم.

سکرتێرەکەی دەرگاکەی کردەوە، پێی سەیربوو کە دکتۆر لە ژوورەوەیە.

– ئەوە چ بوو واگەڕایتەوە، ئەمە بۆیە وا بە پەلە چووە دەرەوە.

– ئەو بەستەزمانە بە سەر کورسییەکەمەوە خەوی لێکەوتبوو. کە منی بینی زۆر شڵەژا. دەزانی چاوێکی یەکجار جوانی هەیە.

– پیاوی وڵاتی ئەوان حەزیان لە چاوی شینە و ئێوەش لە چاوی ڕەش.

لە مەبەستی سکرتێرەکەی نەگەیشت. بۆ دەبێ وابڵێ لە کاتێکدا چاوی ئەو کیژە ڕەش نەبوو، بەڵام نەیدەویست لەوە زیاتر قسە لەو بارەیەوە بکات.

– دەزانی ئەمڕۆ جەژنی لەدایکبوونی سارایە، ئەو دیارییەی کە بۆم کڕیبوو لێرە دامنابوو، لە نیوەی ڕێگا بیرم کەوتەوە و گەڕامەوە.

– هەر باشبوو لە نیوەی ڕێگاش بیرت کەوتەوە ئەگینا سارا ئەمشەو دەیناردیتەوە بۆ لای من. دەزانی ئەمشەو منیش خەفارەتم هەیە.

هیچی نەوت و پێکەنی و چووە دەرەوە. ئەمجارەشیان خەریک بوو دیارییەکەی لەسەر مێزەکە بیرچێت، ئێڤا بیری خستەوە و تا لای دەرگای نهۆمەکە بەڕێی کرد.

لە ئۆتۆمبیلەکەیدا بوو هەستی دەکرد گۆڕانکارییەک لە ناخیدا ڕوویداوە، نەیدەتوانی قاچ بە بەنزیندا بنێ و بیری لە فرمێسکەکانی شیرین دەکردەوە، بۆ دەبێ وا بگری. بۆ دەبێ ئەمیش وەک ئەو فرمێسک بەچاوەکانیدا بێنە خوارەوە. کە چاوی کردەوە، گڕی ئازاری تێدا بەدی دەکرا. ئەمیش خۆی بۆ ڕانەگیرا و دەروونی هەژا. ئەی باشە ئیستا بۆ توانای بیرکردنەوەی نەماوە و هەر دەڵێی ئۆتۆمبیل لێخوڕینی بیرچۆت

# 5

نازانم چیم لێقەوماوە ئەوە ماوەیەکە ئارامم لێبڕاوە، لە هیچ کوێدا ئۆقرە ناگرم. کە دەچم بۆ کار خواخوامە زوو بگەڕێمەوە ماڵێ. هەموویان هەستیان بەم شپرزەییەی من کردووە. ئێڤا پێی وتم "چییە شیرین لەوە دەکات کەوتبێتیتە دەریای خۆشەویستییەوە، وا گۆڕاوی ئاگات لە خۆت نەماوە، ئەوە چ بەختەوەرێکە کەوتویتە داوییەوە" بزەیەک گرتمی و نەمزانی چی وەڵامی بدەمەوە، دەزانم هەژانێک لە ژیانمدا ڕوویداوە. شەوان خەوم لێناکەوێت، نانم پێناخورێ، شتم لەبیر دەچێتەوە، شپرزەم و زۆرجار نازانم چیم دەوێت یان چیم کردووە. تەنانەت ئەو ترسەی کە جاران بۆ ساتێک چیبوو یەخەی بەرنەدەدام نەماوە، دوێنێ بێ ترس چووم بۆ ناو شار و ماوەیەکی زۆر پیاسەم کرد و سەیری زۆر دوکانم کرد. ڕێگەم کەوتە بەر کتێبفرۆشییەک و چوومە ژوورەوە، دوو ڕۆمانم کڕی یەکەمیان لە نووسینی ئەلێزابێت ئەلێندی، ئەویتریان "ئاسترید ليندگرين. ماوەیەک بوو دەمویست چەند کتێبێک بە زمانی سوێدی بکڕم لەماڵەوە هەمبێت. هەر کە دێمەوە ساتێک دڵم خۆشە، ساتێک هەست دەکەم ئەم دنیایەم بەسەرەوەیە. خۆشم لە خۆم تێناگەم. ئەم سوێدییانە دەڵێن پێکێک هەڵدەدەین و هەموو دنیا لەیاد دەکەین، من قەت ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە بخۆمەوە. وەک خەوێک دێتە یادم هەندێ جار باوکم دەیخواردەوە و دایکم مەزەی بۆ ئامادە دەکرد،



جاجیک یان نۆکاوی بۆ دەکرد. ئێوارەیەک باوکم تەواو سەرخۆش ببوو بە زۆر دەیویست دایکیشم بخواتەوە، ئەویش ڕازی نەدەبوو. جا باوکم بە منی وت تامی ئارەق بکەم، منیش بەبێ ترس چوومە پێشەوە، ئەوەی لە پەرداخەکەدا بوو هەڵم دا. یەکسەر هەستم بە تامێکی تاڵ و ناخۆش کرد، پاشان گێژبووم و دنیام لە پێش چاو دەخولایەوە. دایکم توڕەبوو لە باوکم و بردمیە سەر جێگاکە و خەوم لێکەوت. ئیتر تا بەیانی خەبەرم نەبووەوە. پاش ئەو جارە ببڕای ببڕ دەمم لە هیچ جۆرە خواردنەوەیەک نەداوە، ئێستاش بۆ لە یادکردنی خەمەکانم شتی وا ناکەم.

– وابزانم باشترە بۆت پێکێ هەڵدەی تا حەقیقەتێک بزانی، ئەو ڕاستییەی کە ناتەوێ بیزانی. دان بەوەدا بنێیت کە کەوتوویتە داوی خۆشەویستی کەسێکەوە.

– باوکە گیان ئەوە تۆی، هەر ئێستا بیرم لەوە دەکردەوە کەمن بەبێ تۆ چەند بێکەسم.

– من دەمزانی تۆ پێویستت بە منە، بۆیە هاتم.

– توخوا باوکە گیان جێم مەهێڵە، جارەکەی تر زوو ڕۆیشتی، ئەمجارە مەڕۆ، تەنیاییەکەم ژیانی لێ هەراسان کردووم. نازانم چیمە.

– بۆ نازانی چیتە کیژم! دەزانیت بەڵام دەتەوێ چاوتی لێ بنوقێنی. تۆ کەوتوویە تۆڕی خۆشەویستییەوە، هەر لەیەکەم جارەوە هەردووکتان تێکەڵ بەیەکبوون. ئەی هەستت پێنەکرد چۆن وەک تۆ فرمێسک بە چاوانیدا هاتنەخوارەوە.

– نا وامەڵێ، من ناتوانم کەسێکی ترم خۆشبوێ من دڵم لە هەموو دنیا تۆراوە تازە من و خۆشەویستی کوجا مەرحەبا.

– کچم خۆت هەڵمەخەڵەتێنە، خۆشەویستی هەموو بەدەنتی داگیرکردووە، خۆشەویستی وەک هەور ئاسمانی بیرکردنەوەی تەنیوی، خۆت ناتەوێ ئەو هەورە بە سەرتا دابارێت. لەمن بپرسە منێک کە شەیدای دایکت بووم تا نەمهێنا کۆڵم نەدا، کەسیش نەیتوانی ببێتە ڕێگرم.

– نا باوکە گیان، من مافی ئەوەم نییە کەسێکم خۆشبوێ کە ماڵ و منداڵی هەبێ. من مافی ئەوەم نییە پاش ئەم تاقیکردنەوە قەڵبەم لەگەڵ کەسێکی تردا ژیان بەرمەسەر. پاشان من ئەو ناناسم، تاقە یەکجار بینیومە.

– کە دڵت کەوتە داوی یەکێکەوە ناتوانی لەو داوەی دەرکەی، مەگەر مردن یەکەم ژووان وماچت بیر بباتەوە.

– ماچی چی باوکە ئەوە تۆ چ دەڵێی لەڕاهی خودا.

– تۆ دەبێت پێ لەو ڕاستییە بنێیت کە ئەو پیاوەت خۆش دەوێت، تابتوانی مامەڵە لەگەڵ ئەو هەستەی خۆتدا بکەی. خۆ گەر بە گرفتیشی دەزانی ئەوە دەبێت هەر خۆت چارەسەری بکەی.

– هەر کە فرمێسکەکانیم بینی، زانیم کار لە کار ترازاوە، هەر ئەوەندەم پێکرا ژوورەکە بەجێبهێڵم. دەزانی بابە گیان ناتوانم باسی ئەو هەستەی خۆمت بۆ بکەم، تۆ دەبێ لە من بگەی. لە هەموو ژیانمدا حاڵەتێکی وام بە سەر نەهاتووە. ئێستا ئەو هاوڕێیەی خۆمم بیر دەکەوێتەوە، نەورۆز کە لە کۆلێژی ئاداب دەیخوێند. ئەو منی خۆشدەویست هەستم بەو خۆشەویستییەی دەکرد، کاتێ منی دەبینی سوور وەردەگەڕا و تەنانەت کە لە نزیکیەوە بوەستامایە هەستم بە ترپەی دڵی دەکرد. داوای هەر شتێکم لێکردایە لەژێر زەویشدا بووایە بۆی پەیدا دەکردم،.شتی ڕێکدەخست بۆ ئەوەی بتوانێ یارمەتیم بدات. دەیگوت کچێکی خزمیان لە کۆلێژی پزیشکی دەخوێنێ، زۆر جار کتێبی گرنگی بۆ دەهێنام و دەیوت ئەم کتێبەی لەو کچە وەرگرتووە. دەیزانی ئێمە باری ئابووریمان باش نییە، بۆیە بە پێی توانا یارمەتی دەدام، بەڵام باسی ئەم هەستەی خۆی نەدەکرد. بڵێ خوایە گیان بۆ خۆشەویستی خۆی بۆ من نەدرکان، توشم بە توشی ئەم کابرایەوە نەدەبوو، نەدەکەوتمە داوی کەسێکی ژنداریشەوە، نە دەگەیشتمە ئەم وڵاتەش. ئێمەی کچ بۆمان نییە هەستی خۆمان بۆ کوڕێک بدرکێنین، خۆ ئەو کوڕ بوو بۆ نەیدەوێرا باسی خۆشەویستی خۆی بکات؟

– دیارە زانیویەتی کە تۆ هەمان هەستی لەگەڵدا ناگۆڕیتەوە بۆیە نەیویستووە دڵی خۆیت لابکاتەوە. نەوەک وەک هاوڕێیەکیش لەکیسی بچی. ئیتر چ دەکەی کچم. دیارە خوا هەر هێندەی لە چارە نووسیوی.

– گوو دەکەمە ئەو چارەیەش کە خوا بۆ منی نووسیوە.

کە لام کردەوە باوکم لە هیچ قوژبنێکی ژوورەکەمدا نەمابوو، هاوارم کرد و کون بە کونی ژوورەکە گەڕام نەم دۆزییەوە. "ببوورە باوکە، تکایە بگەڕێوە ".

لەسەر جێگەکەم پاڵکەوتم و تاقەتی هیچم نەما. برسییەتییەکەشم چوو، دەبێ ئەمە چیبێ بەسەر من هاتبێ ئاخۆ ئەمە نەخۆشی خۆشەویستی بێت، بڵێی نەورۆزیش وەک من بە هەمان زروفدا ڕۆیشتبێ. ئەو بەستەزمانە بە ئازارێکی واوە چۆن توانیویەتی خوێندنەکەی بکات، بۆیە هەموو ڕۆژی بۆ ساتێکیش بوایە خۆی دەگەیاندە کۆلێژەکەمان بە حیساب هاتووە سەر لە هاوڕێیەکی





بدات. هێندە گوێم نەئەدا پێی، کە لە دوورەوە دەمبینی هەوڵم دەدا خۆمی لێ گێل بکەم. بەڵام لووتم هەر ئەتەقی بەلووتییەوە. لە دوورەوە هەستم بە تیشکی چاوەکانی دەکرد، هەتا دەگەیشتە لام چاوی لێنەدەتروکاندم، هەستم دەکرد کە نزیک بکەومەوە. نیگای چاوەکانی دەمسوتێنێ، بۆیە بەپێی توانا هەوڵم دەدا تەماشای چاوەکانی نەکەم. ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە گەر هانس بەرامبەرم بێت چۆن بڕوانمە چاوەکانی، یان چۆن بتوانم نیگای چاوەکانم ئاوێنەی دەروونم نەبێ. بە هەرحاڵ دەبێ خۆم لە بینینی لادەم، کاتێ ژوورەکەی پاکبکەمەوە ئەوی لێ نەبێ، یان باشترە شوێنی کارەکەم بگۆڕم. خۆ هێندە گران نییە، لەگەڵ کەسێکی تردا کارەکەم دەگۆڕمەوە. دەبێت چارەسەری خۆم بکەم، نازانم ئەمە چیبوو بە سەر مندا هات. ئەوە چەند مانگە لەو شوێنە کار دەکەم بە ڕێکەوتیش نەمبینی، کەچی لەو ڕۆژەدا لە ژوورەکەی خۆیدا بینیم.

ئەوە دوو ڕۆژە ناتوانم بچمە سەر کار و تووشی شەونخونی بووم و دڵم تەنگە، بەیانیان بە هەزار حاڵ لە جێگەکەم دێمە دەر. دوێنێ تەلەفۆنم بۆ هاوکارەکەم کرد و پێم ڕاگەیاند کە نەخۆشم. بەلایەوە سەیر بوو چونکە لەوەتی کاردەکەم هەموو ڕۆژ چوومەتە سەرکار. زەنگی تەلەفۆنە. دەبێ کێ بێ!!

– فەرموو کێ قسەدەکات.

– چۆنی شیرین. دیارە نەخۆشی کە دوو ڕۆژە نەهاتوویتە سەرکار.

– بەڵێ تەندروستیم خراپە.سەرم دێشێ و خواردنم پێناخورێ.

– ئەها ئەوە جۆرە ڤایرۆسێکە دیارە تۆش تووشبووی، ئاو زۆر بخۆرەوە. خۆ ئەگەر باش نەبووی باشترە بچیتە لای دکتۆرێکی ناوچەکەی خۆتان، بەڕاست دوێنێ دکتۆر هانس هەواڵی پرسی و ویستی بزانی بۆچ نەهاتووی. دوێنی کەس نەهات ژوورەکان پاکبکاتەوە ئەمڕۆش کوڕێک هات زۆر بەخراپی شوێنەکانی پاککردەوە.

– سوپاس. هەر کە تۆزێ باشتربم حەتمەن دەست بە کار دەکەمەوە.

ئەم تەلەفۆنە تۆزێ هێمنی کردمەوە، نەمزانی بۆ ئەوە دوو ڕۆژە گوێم لە دەنگی کەس نەبووە، ئاگاداری دەرەوەی ژوورەکەم نیم. تەلەڤزیۆنیشم نەکردوەتەوە، سەیرە ئەوە چیم بوو، ئەو دوو ڕۆژە خۆ ئاگام لە دنیا نەمابوو. لەوە دەکات ئەم دوو ڕۆژە ئەم مەملەکەتەم بەجێهێشتبێ، ئا وایە باوکم منی بردە لای خۆی. لەوێ بووم، گیانی شێلام. پێکێ ئارەقی داپێم و خەوم لێکەوت. دیارە وایە،

هەست بەماندوو بوون ناکەم. سبەی هیچ نارۆمەوە، بەڵام دووسبەی دەڕۆمەوە. هەواڵی پرسیووم، ئاخۆ ئەویش وەک من بێت. لەو باوەڕەدانیم چونکە ئەو ژیانی خۆی هەیە، ژن و منداڵی هەیە. من هەر لە نەخشەی بیرکردنەوەشیدا نیم، ئەو دکتۆرێکە و لێپرسراوی بەشێکە خەڵکی ئەم وڵاتەیە، چی بەسەر منەوەیە. باشە ئەی بۆچی هەواڵی پرسیووم، ڕەنگە لەبەرئەوەی بە جوانی ژوورەکەم بۆ پاککردبێتەوە و ڕێکخستبێ. چەند حەزم دەکرد ڕۆژێ لەڕۆژان وەک دکتۆرێ بگەڕامایەتەوە بۆ ئەم نەخۆشخانەیە.

به خەیاڵمدا هات زەنگێک بۆ ڕێزان یان شارا لێبدەم. هەرچەند دەمێکە قسەم لەگەڵ شارا نەکردووە، ئەو منداڵی بچوکە و سەری قاڵە. ڕێزان خۆشە و خەمڕەوێنە، هەرچۆنێ بێت نابێ باسی شتی وایان لا بکەم. گەر بزانن عاشقی سەرۆک بەشی ئەو نەخۆشخانەیە بووم کە فەڕاشیی لێدەکەم، دەمکەن بە کێودا. ئەمەش هەروەک شووکردنەکەم نووکتەیەکە بۆ خۆی. دیارە ژیانی من هەمووی نووکتەیە. گەر ڕێزان بەمە دەزانێ هەزارو یەک نووکتەم لەسەر دەڵێ. هەندێ جار چی بەو شارا هەژارە دەکرد. هەر باشبوو ئەویشمان لەگەڵ بوو، خۆ من و شارا هەر خەریکی گریان بووین تا ئەو هات تۆزێ دنیای ڕۆشن کردینەوە. شارا لە من بەستەزمان تربوو، کچێکی کۆرپەی هەبوو، هەر کە مەمکەکەی دەخستە دەمییەوە دەستی دەکرد بە گریان، دەیوت بەزەییم بەم منداڵەدا دێتەوە بەبێ باوک بەخێو دەبێ، دەبوو منداڵم نەکردایە، ماڵی باوکم ئاوا بێ گێژیان کردم تا منداڵم بوو.

کاتێک دێنە سوێد سیانزدە ساڵان دەبێ و یەکسەر دەست بە خوێندنی سوێدی دەکات، هەر زوو سوێدییەکی باش فێر دەبێت، دایک و باوک و براکانی دەرحەقی توند دەبن و ڕێگەی نادەن تێکەڵ کۆمەڵگە ببێ. تەنانەت نەیان هێشتووە لەگەڵ کچە سوێدییەکانی هاوڕێشیدا بچێتە دەرەوە. شارا ملکەچی هەموو جۆرە بڕیارێکی خێزانەکەی بوو، براکانی زۆر زۆڵمیان لێدەکرد و تەنانەت نەیاندەهێشت بە دڵی خۆی جل لەبەر بکات. هەموو ڕۆژ دەبوایە پاش قوتابخانە یەکسەر بگەڕێتەوە ماڵێ، ڕێگەی ئەوەشیان نەدەدا بچێت بۆ مەلەوانی یان هەر شوێنێک کە پۆلەکەی بۆی دەچوو. بەزۆریش بردیانەوە بۆ وڵات و بۆ ئامۆزاکەی نیشانەیان کرد. جارێکی تر زەنگی تەلەفۆنە، ئەمجارەیان کێیە، خێر بێ خوایە.

– فەرموو، کێ قسە دەکات؟

– شارام، چۆنی. مەترسە خۆمانین.



– تۆی شارا، دڵ ئاوێنەی دڵە دەزانی ئێستاکە، هەر ئێستاکە بیرم لە تۆ دەکردەوە. چۆنی ؟ منداڵەکەت چۆنە ؟

– منداڵەکەم خراپ نییە. بەڵام وەزعی خۆم باش نییە، براکەم شوێنەکەمی دۆزیوەتەوە. دوێنێ بەردەمی دەرگاکەی گرتبوو نەدەڕۆیشت، تا لێرەوە پۆلیسیان بۆ بانگ کرد. وازم لێناهێنن تا نەمکوژن، کە شووم کرد برا گەورەکەم هەرەشەی لێکردم و وتی گەر ئامۆزاکەت جێبهێڵی یەک چەقۆ دەکەم بە سکتا. هەموو گیانم دەلەرزێ، تەنانەت لە دوێنێوە مەمکیشم وشکی کردووە، قەترەیە شیر لەمەمکمدا نەماوە.

– ئەی ناتوانن شوێنەکەت بگۆڕن، بتبەنە شارێکی تر.

– با ئەوان یەکسەر بیریان لەوە کردەوە کە جێگەم بگۆڕن، بەڵام لە هیچ کوێیەک شوێنی بەتاڵ نییە.

– گەر دەتەوێ و ئێرەت پێ باشە، دەتوانی بێیت بۆ لای من. وەرە ئێرە ماوەیەک دانیشە تا شوێنێکت بۆ دەدۆزنەوە، هیچ نەبێ لێرە هەست بەئەمان دەکەیت. تۆ دەتوانی هەر لە ماڵەوە بیت و هەر پێویستیەکیشت هەبێ خۆم بۆتی جێبەجێ دەکەم.

– ئاخر زەحمەتە، تۆ کاردەکەی و دێیتەوە ماڵێ ماندویت.

– نا شارا زەحمەت نییە خۆ من بەیانی دەردەچم بۆ پێنجی ئێوارە دێمەوە.

– دەترسم شەوان گریانی منداڵەکە نەیەڵێ بخەوێ.

– بیر لە شتی وامەکەرەوە، من هێندە ماندووم هیچ دەنگێ خەبەرم ناکاتەوە.

–کەواتە پێیان دەڵێم بزانم چ دەڵێن. زۆر سوپاس شیرین گیان.

هەموو گیانم کەوتە لەرزین. هەرچی شت هەبوو لە بەر چاوم دەسووڕانەوە، لەسەر کورسییەکە دانیشتم، دەستم بە گریان کرد. بیرم لەوە دەکردەوە گەر من بدۆزرێمەوە دەبێ چیم بەسەربێت، خۆ قابیلە تا سەر بتوانم خۆم بشارمەوە. ئەوەم باشە مێردەکەم تەنیایە و کەسی لێرە نییە هاریکاری بکات. لەوانەشە ئێستا بە کەسێکی ترەوە سەر قاڵبێ، یان ژنێکی تری هێنابێت. چاوی دەربێت گرنگ ئەوەیە شەڕی لە منەوە دووربێت. باوەڕیش ناکەم زۆری مەبەست بێت بمدۆزێتەوە، بڵێم چی خۆ بە دایکمی وتبوو لە بنی عەرزیشدا بێت دەیدۆزمەوە. دایکیشم چاکی پێ وتبوو " بۆ وا دەزانی کچەکەم بێکەسە بەخوا بەخوایە گەر دەستێ لەو کچە دەدەیت هەرچی کەسوکارت هەیە شار

بەدەریان دەکەم"، درۆیەکی گەورەشی کردبوو پێی گوتبوو خاڵۆزا و ئامۆزاکانم هەڕەشەی لێدەکەن، نەوڕۆزی هاوڕێشمی دۆزیبووەوە و داوی لێکردبوو بەناوی خزمانەوە تەلەفۆنێکی بۆ بکات و هەڕەشەی لێبکات. ئەویش نەیکردبووە نا مەردی تەلەفۆنی کردبوو بۆی و هەڕەشەیەکی زۆری لێکردبوو، داخی دڵی خۆی پێ ڕشتبوو. ئەمیش دووجار تەلەفۆنەکەی بەڕوویدا داخستبوو، دیسانەوە تەلەفۆنی کردبووەوە بۆی. دوا جار کە قسەم لەگەڵ دایکمدا کرد وتی هەواڵی پرسیوم و داوای ژمارە تەلەفۆنەکەی کردوم، دایکیشم وتبووی تەلەفۆنی نییە. چەند جارێک سەری لەدایکم داوە. لە چارەسەری براکانمدا یارمەتی داون، ئێستا دایکم دەزانێ گەر شووم بەم کابرایەش نەکردبا ژیانمان بەڕێوە دەچوو، خۆ ماوەیەکی زۆریش هیچم بۆ نەدەناردنەوە و لە برسانا نەمردن. دایکم خۆشی هەست بە پەشیمانییەکی زۆر دەکات، دەشزانێ زۆڵمی لێکردم کە ئەم کارەی پێکردم و بە فشەو فیشاڵی ئەو خوێڕییە هەڵخەڵەتا.

ژیان لەخۆیدا ئاڵۆزە، ئاڵۆزییەکی وا زۆر جار مرۆڤ سەری لێدەرناکات. باوکم بەو گەنجییەی خۆی مرد، لەناکاوا هەموو گیانی وەک پارچە تەختەیەک وشک هەڵگەڕابوو. دوکاندارەکانی دراوسێی یەکاو یەک سواری ئۆتۆمبیلیان کردووە و بردوویانە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام هیچ شتێ فریای نەکەوتووە و گیانی لەدەست داوە. دکتۆرەکانیش نهێنی مردنەکەیان نەزانیووە. لە کاتێکدا باوکم پێشتر هیچ نەخۆش نەبووە، نەنکم دەیوت هەر بە شیری مەڕ بەخێوم کردووە، نان و کەرەم داوەتێ. هەر لە منداڵییەوە زۆر بەهێز و ساغ بووە. نەنکم باوکمی یەکجار خۆشدەویست و دەیوت منداڵی وا بەئەدەب و گوێڕایەڵی وەک ئەم کوڕەی خۆم نەدیووە. بەو خودا گەورەیەی کە کەس نەیدیوە و نازانی شێوەی چۆنە هەرچی خەڵکی ئەو ناوچەیە هەبوو بەخیلییان پێ دەبردم. کە مێردەکەشم مرد خەڵکی دەیانووت باجی حەلاو نابێ شیوەن بۆ مێردەکەت بکەی چونکە خوا کوڕێکی وای پێداوی کە جێگەی هەزار مێردت بۆ دەگرێتەوە. مەحاڵە بتوانم لەو خۆشەویستییەی نەنکم بگەم، بڵێم چی مەگەر کاتێ خۆشم ببم بە دایک، نەنکم کەسێکی خوا پەرست بوو سەری برۆیشتایە نوێژی نەدەرۆیشت، هەردەم خەریکی دوعاو نزاکردن بوو، تەزبیحەکەی هەر بە دەستەوەبوو، قولوەڵاو دوعای خێری بۆ باوکم دەخوێند، کە خوا رزقی بداتێ و لەچاوی پیس بیپارێزێت. کەچی کاتێک باوکم ئەمری خوای کرد، ئیتر ئەم نەنکە بەئیمانەم بڕوای بەخوا نەماو ڕۆژی هەزارو یەک کفری دەکرد و وازی لە نوێژ و ڕۆژوو هێناو هەموو ڕۆژێ لەجیاتی نوێژ هەزار



جنێووی بۆ خودا دەنارد. دایکم پێی دەووت گەر بڕوای بەخودا نەماوە بۆچ شەڕی لەگەڵ دەکات و کفر دەکات. نەنکیشم دەیووت بۆ ئەوەی حەقی ئەو هەموو نوێژو ڕۆژووە درۆینانەم بکەمەوە لە ژیانمدا پێی کردووم.

پاش مردنی باوکم بەماوەیەک نەنکم ئێمەی بەجێهێشت و چووە لادێکەی خۆیان ئیتر هەتا مردیش سەری بە ماڵەکەماندا نەکرد. دایکم لەگەڵ دلێری برامدا دوو جار سەریان لێدا، دەیوت هەندێ لیرەی هەبووە پێش گەڕانەوەی فرۆشتبووی. هەر لەو ناوە چەند بزن و مەڕێکی کڕیبوو. پاشتریش خەڵک وردە وردە دەگەڕانەوە ناو دێهاتەکان و سەر لەنۆی ژیانیان دەست پێدەکردەوە و گوندەکانیان ئاوەدانکردۆتەوە. نەنکم هەموو جار دەیوت پێش هەڵگیرساندنەوەی شەڕەکەی هەفتاو چوار باوکم گوتویەتی هەرچی هەمانە دەیفرۆشین و دەچینە شار بە مەزەنەم هێندە نابا ژیان لە دێهاتدا مەحاڵ دەبێت. نەنکیشم بەگوێی کردووە و هاتوونەتە شار کە شەڕیش دەستیپێکرد پێشبینییەکەی باوکم ڕاست دەرچوو.

گوندەکان لەگەڵ زەویدا تەخت کران و دەیان هەزار کەس بێ سەرو شوێن کران، کەچی پاش ئەو هەموو کارەساتەی بەسەر ئەو ناوچەیەدا هات نەنکم ڕۆیشتەوە و سەرلەنوێ ژیانی دەست پێکردەوە. بەو تەمەنەوە خانووی دروستکردووە و خەریکی مەڕو بزن بەخێوکردن بووە، ئەمجارەیان وەک بێ ئیمانێک ژیانی دەست پێکردەوە. ئەو خێزانانەی کەلەم دواییەدا گەڕابوونەوە گوندەکە دەیانگوت ئەم پیرەژنە ژیانێکی زۆر تایبەتی هەبوو، لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ نەدەبوو. زۆربەی کات بەو دەشت و دەرەدا دەسوڕایەوە، ئێواران لەگەڵ مەڕ و بزنەکانیدا دەگەڕایەوە ماڵ. دەڵێن خەریکی باخێکی سووتاو بووە و خزمەتی هەموو دار میوەکانی کردووە و گەڵێکیش ماندوو بووە، کەڵکی نەبووە. خەڵکەکەش پێیانگوتوە کە ئەو دارانە گازی کیمیایی سووتاندونی و تازە مەحاڵە بەربگرنەوە، ئەو هەر وازی نەهێناوە، پاشان لە شوێنێکی تردا قەڵەمی ئەو دارانەی چاندووە. پاشتر بەریان گرتوە. منداڵانی لادێ دەچوون سێو و هەنجیر و هەرمێیان دەکردەوە و دەیان خوارد. ئەو باخچەیەیان ناو ناوە باخچەکەی نەنە حەلاو.

من حەزم دەکرد بچین سەرێکی بدەین، دایکم دەیوت ماڵەکەی نەنە حەلاو گەلێ بچوکە و هیچ پێخەف ونوێنێکی ئەوتۆشی نییە. پاش ئەوەی گەورەتربووم زانیم مەسەلەکە پەیوەندی بە بچووکی ماڵەکە و نەبوونی پێخەفەوە نەبوو، کە داوای سەردانی نەنەم دەکرد دایکم هەر جارەی بیانوویەکی

دەهێنایەوە و هەوڵی دەدا خۆی لەو مەسەلەیە لادا، پاشتریش ئاگاداربووم دایکم بە خەڵکدا شەکر و چاو ڕۆن و برنجی بۆ دەنارد، یان دەستێ جلی بۆ دەدرووی و بۆی دەنارد. هەوڵی دەدا لای من باسی نەنکم نەکا، بەڕێکەوتیش لەگەڵ یەکێکدا باسی ئەوی بکردایە و من بچومایە بەسەردا بابەتەکەی دەگۆڕی. ئەم مەسەلەیە ببوو بە گرێکوێرە لام، نەمدەزانی بۆچی دایکم بە هیچ جۆری نایەوێ نەنە حەلاو ببینم یان بچم بۆ لای. تەنیا کە مرد ئەم ڕاستیەم بۆ دەرکەوت.

ئێوارەیەکی درەنگ بوو پیاوێک لە دەرگای دا، من چووم دەرگاکەم کردەوە، هەواڵی نەنکمی پێبوو، کە نەخۆشە و لەگیانەلادایە. ئیتر دایکم زۆرشپرزە بوو، پیاوەکە پێی وت: "خوشکە پێویست ناکات خۆت شپرزە بکەیت، دەتوانی لەگەڵ مندا بێیت، من ئۆتۆمبیلم پێیە. دوای ئەوە خەڵکی ئاوایی نەنە حەلاویان خۆشدەوێ و بە تەنیا جێیناهێڵن. نەنە زەرەری بۆ کەس نەبووە، جگە لەوەی هەموو ئەو خەڵکەی هاندەدا کاربکەن و ئاواییەکە ئاوەدان بکەنەوە. ئەو داوای کرد خۆت بەتەنیا بچی بۆ لای". دایکم سەیرێکی منی کرد و وتی بچۆ بە شوێن توباو خان دا بابێت بۆ ئێرە. توباو خان هات دایکم داوای لێکرد ئاگای لە ئێمە بێت تا ئەو دەگەڕێتەوە. ئیتر دایکم لەگەڵ ئەو پیاوەدا ڕۆیشت و شەویش توباو خان هات لامان مایەوە.

سێ ڕۆژ دایکم لەو گوندە مایەوە، کە هاتەوە ماندوو خەمگین بوو، بێ دەنگ دەهات و دەچوو. دراوسێکانیشمان زوو زوو دەهاتن سەریان لێدەدا و دڵنەواییان دەکرد، دایکم بەدەم گریانەوە باسی نەنەی دەکرد. دایە حەلاو زیاتر لە هەموو شتێ کوڕەکەی خۆشدەویست. کاتی خۆشی کە عەول داوای لێکرد بێنە شار دڵی نەشکاند، دەیووت هەرگیز نامەوێ دڵی تاقانەکەم بشکێنم، ئەویش زۆر ڕێزی دایکی دەگرت.

دایکم دەیوت ئەو خانووەی کە جاران تێیدا ژیاون تەنیا لا ژوورێکی بەپێوە مابوو، ئەو ژوورەی چاککردوەتەوە و موبەقێکی بچووکی دروست کردوەو ژوورێکیشی بۆ مەڕو بزنەکانی بنیاتناوە. هەر خۆی بە تەنیا ئەم کارانەی ئەنجام دابوو، کە خەڵک لێیان دەپرسی نەنەحەلاو چۆن بەتەنیا ئەم هەموو کارانەت ئەنجام داوە، دەیوت کوڕەکەم یارمەتی داوم. ئیتر خەڵکەکە وایان دەزانی نەنەحەلاو شێت بووە. بەیانیان زوو مەڕو بزنەکانی دەبردە هەردەکانی پایینی گوندەکە و درەنگانێ ئێواران دەیهێنانەوە. هیچ کاتێ هەستت نەدەکرد تەنیایە، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد. لەسەرەتاوە منالآن دوای دەکەوتن و بە شێتیان دەزانی، ئەویش منداڵانی دادەناو باسی ئەم گوندەی





بۆ دەکردن، کاتێک کە ئەم تێیدا ژیاوە. باسی شەوی بەرات و جەژنی ڕەمەزان و قوربانی بۆ دەکردن، باسی ئەوەی بۆ دەکردن کە چۆن ژنان هەموو بەیانییەک لە سەر کانی کۆبوونەتەوەو دەمەتەقێیان بووە، باسی ئەو ئێوارانەی دەکرد خێزانەکان لە مانگە شەودا لە سەربانان دانیشتوون و پیرە پیاوان و گەورە ژنانی لادێ چیرۆک و ئەفسانەیان بۆگێڕاونەتەوە. ئیتر منداڵان زانییان کە نەنە حەلاو شێت نییە. هۆگری بوون و خۆشیاندەویست و داوایان لە دایکەکانیان دەکرد خواردنی بۆ بنێرن چونکە ئەو بە درێژایی ڕۆژ لە دەرەوەیە و فریا ناکەوێ خواردن ساز بکات.

دەڵێن پاش ئەوەی باری وڵات هێمن بوەوە و وردە وردە خەڵکەکە دەگەڕانەوە بۆ جێگە و ڕێگەی خۆیان. یەکەمین جار ئەم پیرەژنەیان بینیوە سەریان سوڕماوە کە بەتەنیا لەم گوندەدا هەڵیکردووە. پیرانی ئاوایی ناسییانەوە و ڕێزێکی زۆریان لێدەگرت. تێکەڵی کەس نەدەبوو، جار جارێک نەبێت ئێواران کۆڕی حیکایەتخوانیی بۆ منداڵانی گوندەکە دەبەست. گەر کەسێکیش بیویستایە بچێتە لای ئەوە هەر لە دەرگاوە قسەی لەگەڵ دەکرد و فەرمووی لە کەس نەدەکرد. کە دەچووە دەرەوە دەرگاکەی بە قوفڵێکی گەورە دادەخست. لە بەهاراندا شیری مەڕو بزنەکانی زۆر دەبوو پەنیری دروست دەکرد و هەندێ جاریش شیری بۆ ئەو ماڵانە دەنارد کە منداڵی شیرە خۆرەیان هەبوو، زوو زوو قوڕە سورەی خۆشەدەکرد و لەبەر هەتاو دایدەنا و خەریکی دەبوو تەنیا کە مانگە شەو بوایە قورەکەی نەدەبردە ژوورەوە. دراوسێکان سەریان لەم کارە سوڕمابوو، کەسیش نەیدەوێرا پرسیاری لێبکات. کە دایکم چوو بۆلای ئەم نهێنییە بۆ خەڵکەکە ئاشکرابوو. لە ژوورەکەیدا بە قوڕ پەیکەرێکی بۆ باوکم دروست کردبوو، هەر ئەتووت خۆیەتی زیندوو بوەتەوە. لەولاشەوە پەیکەرێکی بۆ من دروست کردبوو، پەیکەرەکەی منی بە خەڵوز ڕەشکردووە، گوایە من بەخت ڕەشیم بۆ باوکم هێناوە. دایکم دەیگێڕایەوە کە گەیشتبووە لای هێشتا گیانی تیا مابوو. یەکسەر هەواڵی منی پرسیبوو گەر مابێتم. دایکم دڵگران ببوو لەو پەیکەرە ڕەشە، ئەویش وتبووی ئەو چەتیوە ناموبارەکە ئیزرائیلی هێنایە سەر باوکی و خنکاندی، گوایە کە دایکم سکی بە منەوە پڕبووە خەوی بینیوە گەر ئەم منداڵە کچ بێت ژیان لە باوکی وەردەگرێتەوە. لە سەرەتاوە بڕوای نەکردووە، پاشان بۆی دەرکەوتووە کە خەوەکەی ڕاست دەرچووە. ئەو هەموو ساڵە نەنکم دوعای شەڕی بۆ من کردووە.

هەندێ جاریش دەمووت لەوانەیە ڕاست بکات ئەوە نییە من ماوم و باوکم و براکەم هەریەک بە

دەردێکەوە مـردن. جـاران دەیانگوت باوکم ئیـزرائیـل خنکاندوویەتی. کـە دەسـتم کـرد بە خـوێندن کەوتمە سۆراخکردنی چەشنەکانی مردنی کتوپڕ. تەنانەت چوومە لای دوکاندارە دراوسێکانی و لێم پرسین چۆن مردووە، یان پێش ئەوەی ئەو حاڵەتەی بەسەر بێت چی خواردووە. شاگردی دوکانێکی دراوسێی وتی داوای لێکردووە بڕێک قۆخ و قەیسی بۆ بکڕێت، ئەوانەش نابێ ببنە هۆی مردنێکی وا کتوپڕ.

خۆزگە ئێستا نەنە بمایە ئەو کات بۆم ڕوون دەکردەوە من نەبووم بە هۆی مردنی باوکم، چارەڕەشی من نەبوو باوکمی لەناو برد، بەڵکو مردنی باوکم بوو کە منی چارە ڕەشکرد و ژیانی لێ تاڵکردم. گەر نەنکم بیزانیبا دوای مـردنی باوکم چیم بەسـەرهاتووە، ئاخـۆ بەهەمان شـێوە بیـری دەکردەوە. نەنکم باوکمی زۆر خۆشـدەویست، بەڵام ڕازی نەدەبوو دڵی دایکم بشـکێنێ. دەیوت من لە مـاڵی دنیـا هەر ئەم کـوڕەم بۆ مـاوە. حـەز ناکـەم زاڵم بێت و عـەزیەتی مـێشولەیەکـیش بدات، من خـۆم عـەزابم بە دەست باوکییەوە زۆر خوارد و زوڵمم زۆر دی، حەز ناکەم کوڕەکەم وەک باوکی دەرچێ. هەر بۆیەش بڕیارم داوە شوو بە هیچ پیاوێکی تر نەکەمەوە و هەوەس و ئالۆشییان بۆ دامرکێنمەوە. پیاوان زاڵمن و تەنیا بیر لە هەوەسی خۆیان دەکەنەوە. بۆ لە بیرم دەچێ ئەو قـورمساخە کە هێشـتا دوو ڕۆژ بوو ئەم کـوڕەم لە داوێن کـەوتبـوە خـوارێ کـەوتە کـەوڵم و هەرچەند هاوار و تکام لێکرد فایدەی نەبوو، دەیگوت خۆ ناچمە گیانی کەرەکان، ئەوانیش زەیستانن.

لەیادمە دراوسێکانمان هەموو کات گاڵتەیان لەگەڵ دایکمدا دەکرد و دەیانگوت کەس خەسووی وەک تۆ باشی نەبووە، تا زەیستـانبووی نەیدەهێشت کوڕەکەی بەلاتدا بێت. دەڵێن وەک حەسحەس وابووە و بە ناوی یـارمەتیـدانەوە شـەوان خۆی لە لای دایکم خـەوتووە. باوکم نەیوێراوە لێی نزیک بکەوێتەوە، خێرا نەنکم چاوی لێ سوورکردۆتەوە و پێی گوتووە کاتێ ژن زەیستان بێت خوا ئیجازە نادات مێرد بەلایدا بڕوات، بیرت چوو خوا چ جەزایەکی باوکتی دا لەسەر ئەم جۆرە ڕەفتـارانەی. نەنکم زوڵمی مێردەکەی خۆی لەیاد نەدەکرد هەر نـاویشی بهـاتایە هەزارو یەک جنێوی بۆ دەنارد. نەنکم دەیووت پیاو هەر زاڵمە، بەڵام هەرگیز زاڵمی وەک ئەو تەرەسەی مێردی من نەبووە و نابێ، ڕۆژی دە چینی لێدەدام. ئەو زاڵمـانە مانای بەزەیی نازانن، ئەو قورمسـاخە ڕۆژێ لەڕۆژان ماچێکی ئەو کوڕەی نەکردووم و دەستێکی بەسەردا نەهێناوە، بەڵام خوا حەقی لێکردەوە، ئاغـای گوندەکە بەسەر ژنەکەیەوە گرتی و گوللەیەکی نا بە تەپڵی سەرییەوە.

# 6

ئازارەکان سنووری هاوبەشیان هەیە و لە زمانی یەکتر دەگەن، ئەو مرۆڤانەشی کە ئازار بەڕێوەیان دەبات لەیەکتر حاڵین و یەکتر دەدۆزنەوە. زۆر بە تەنگی یەکترەوە دێن، پێکەوە دەگرین و پێکەوە پێدەکەنن. من هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە مرۆڤە ئازاردیتووەکان جیهانێکی تایبەتیان هەیە و ئاگاداری یەکبن و بە تەنگ یەکەوە بن. دەرد و خەمی یەک و دوو بزانن، ئەوەتا ئێستا کون نییە لەم شارەدا شارا خۆی تێدا بشارێتەوە، شیرین جێگەی کردەوە. ئەمڕۆ خۆی و منداڵە ساواکەی دێن بۆ لای. هەموو کاتەکە شیرین بیری لەوە دەکردەوە کە نهێنی خۆشەویستییەکەی خۆی بۆ باسبکات یان هەر لە دڵی خۆیدا پارێزگاری پێوە بکات. ئەو هێشتا نەیدەزانی کە هانس هەمان هەستی هەیە. چونکە پیاوێکی ژنداره و منداڵیشی هەیە.

سارا هەستی بە گۆڕانکارییەکی سەیری لە مێردەکەیدا کردبوو. لە ڕۆژی پێش سەفەرەکەیانەوە بۆ "کرێتە"، هانسەکەی جاران نەماوە. ئەو ڕۆژە بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونییەوە جوانترین دیاری بۆ کڕی، سارا دەبوو بە چل ساڵ. سی و پێنج ساڵ زیاترە یەکتر دەناسن، سارا بیری دەکردەوە کە هانس لێی بێزاربووبێ، لەو باوەڕەشدا نەبوو کەسێکی تر لە ژیانیدا هەبێ، ئەگینا ئەم سەفەرەی بۆ ڕێکنەدەخست. هەفتەیەک پێش جەژنی لەدایکبوونی، هانس بڕیاری دا ئەم سەفەرە بکەن و ئەو ئەنگوستیلە ئەڵماسە نەخش ئەستێرەیەش کە سارا حەزی لێیبوو بۆی بکڕی. جگە لەم سەفەرەیان کە لە باشترین ئوتێلی شاری "شانیا" ی کرێتە شوێنیان گرتبوو. سارا بیری لەوە دەکردەوە کە هانس پێی بڵێت"سوپاس بۆ ئەم هەموو ساڵەی کە پێکەوە بەسەرمان برد و ئیتر ماڵئاوا من دەمەوێ ژیانی خۆم بژیم"



منداڵەکانیان بەم سەفەرە دڵخۆش بوون. هەرچەند ئەوان بەردەوام سەفەری لەم چەشنەیان کردووە. بەڵام ئەمجارەیان جیاواز بوو، لەبەرئەوەی دیاری باوکیان بوو بۆ دایە. کاتەرینا هەڤدەساڵان و ئەندەش پانزە ساڵان و ئاننایش هەشت ساڵان بوو. ئەوانیش هەستیان بەگۆڕانکارییەک لە باوکیاندا کردبوو. ئەو ئێوارەیە دەبوو بچوونایە لە یەکێ لە ڕێستەورانە ناودارەکانی ئەو شارە نانیان بخواردایە. هانس هێندە حەزی لە خواردنەوە نەبوو، بەڵام بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی ژنەکەیەوە دوو پەرداخ شامپانیای خواردەوە. پاشان داوای پەرداخێکی تری کرد، سارا ڕێگەی نەدا زیاتر بخواتەوە. هەموو ئەو کاتەی کە دانیشتبوون هانس قسەیەکی نەکرد، ئەوانیش چەندان قسەوباسیان کردەوە، تەنیا بە نا یان بەڵێ وەڵامی دەدانەوە. دواتر بەناو شاری شانیادا پیاسەیان کرد. ئەو شارەش زۆر خۆشبوو، سروشتێکی جوانی هەبوو، دەوری شارەکە شاخاویی بوو لای خوارەوەشی تا چاوبڕکا دەریابوو. جاران هانس بەتایبەتی کە ئاسمان ساماڵ دەبوو یان مانگ دەردەکەوت، زۆر حەزی لە پیاسەی ڕۆخی دەریا بوو. هەندێ جار تا دەمەو بەیانی دەمایەوە. کەچی ئەمجارە ئەم جوانیانەی نەدەبینی.

ئەو ئێوارەیە زۆری نەخایاند داوای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ ئوتێل. ساراش دەیویست بچنەوە ئوتێلەکە تا بەتەنیا بمێننەوە و بزانێ مێردەکەی بۆ وا گۆڕاوە. کە گەڕانەوە ژوورەکەی خۆیان سارا باوەشی پیا کرد.

– سوپاس خۆشەویستەکەم بۆ ئەم سەفەرە و بۆ دیارییەکەت. ماچی کرد و ویستی وەک جاران دەم بخاتە ناو دەمییەوە و لە دەریای عیشق و سێکسدا نوقم بن.

– دەزانی چەند ماندووم، حەزدەکەم بخەوم و پشوویەک بدەم.

– وا هەست دەکەم مەسەلە ماندوو بوون نییە. دوو ڕۆژە وەک جاران نەماوی، بڵێ چی ڕوویداوە.

– هیچ ڕووینەداوە، تەنیا ماندووم.

– ئەم قسەیە بەیەکێک بڵێ کە تۆ نەناسێ، منێک کە زیاتر لە سی و پێنج ساڵە دەتناسم، بەم قسەیەت هەڵناخەڵەتێم.

– باوەڕبکە هیچ نییە، ئەو ڕۆژە بە هەڵە دەرمانێکم بە نەخۆشێک داوەو نیگەرانی ئەوەم.

سارا هەستی دەکرد کە وانییە، چونکە ئەم چەندان ساڵە کار دەکات و دەیزانی بۆ مەسەلەیەکی وا

هیچ کات ئەوەندە دڵگران نەبووە. هەندێ جار کە نەخۆشێکی بمردایە بۆ ماوەیەک خەم دایدەگرت، پاشان بیری دەچووەوە. دەبێ شتێک ڕوویدابێ وا بەمجۆرە کەوتۆتە جیهانێکی ترەوە. ئەو شەوە خەویان لێنەکەوت، بەڵام کەسیان وایان پیشان نەدا کە نەخەوتوون تەنانەت هانس کردیە پرخە پرخێک کە سارای ناچار کرد بەتانییەکەی هەڵگرێ و بچێتە هۆڵەکە بخەوێ. بەیانی زوو کە کاتەرینا لە دەرگای داو هاتە ژوورەوە بینی دایکە لە قەنەفەی هۆڵەکە خەوتووە نیگەران بوو.

– دایە گیان شتێ لە نێوان تۆ و باوکمدا ڕوویداوە وا لێرە خەوتووی؟

– ناکچم ئەمشەو باوکت یەک پرخە پرخی بوو هەر مەپرسە. ڕەنگە نەیهێشتبێ درواسێکانیش خەویان لێکەوتبێ.

– ئێستا باوکم خەوتووە؟

– وابزانم خەوتووە، باشترە وازی لێبهێنین تابخەوێ، خۆمان دەچین نان دەخۆین، دوێنێ ماندوو دیار بوو.

– دایە وا هەست دەکەم شتێک ڕوویدابێ، دوێنێ باوکم وەک جاران نەبوو، ئاگای لە خۆی نەبوو، قسەکانی ئێمەش بۆ ئەو وەک هەوا وابوون، پێشتر باوکمم وا نەدیووە.

– منیش سەرم لەم مەسەلەیە دەرناچێ، هەرچەند دەکەم نایناسمەوە.

– دوێنێ قسەت لەگەڵ نەکرد؟

– با، دەیووت گوایە پەیوەندی بە کارەکەیەوە هەیە. بەڵام بڕوا ناکەم.

– نەکەوتبێتە داوی خۆشەویستی یەکێکەوە.

– منیش هزری ئەوە دەکەم. تا پێرێش ئاسایی بوو. زیاتر لە بیست ساڵە ئێمە ژن و مێردین هیچ کاتێ شکم لێی نەکردووە و بڕوامان بە یەکتر بووە، خۆ باوکت چەند جار بۆ ئەم وڵات ئەو وڵات سەفەری کردووە وا بیرم نەکردۆتەوە کەسێکی تری هەبێ. بە هەر حاڵ خۆتان ئامادە بکەن، دەچین نان دەخۆین. نامەیەکی بۆ دادەنێین کە خەبەری بووەوە بێتە خوارێ.

هانس گوێی لە قسەکانیان بوو. بە درێژایی شەویش خەوی لێنەکەوتبوو. ئەوان چوونە خوارێ، ئەمیش مێشکی جەنجاڵ بوو، بیری لەوە دەکردەوە هەر چۆنێک بووە هەوڵبدات هەست بەو



گۆڕانکارییانە نەکەن. نامەکەی سارای خوێندەوە و خۆی گۆڕی و چوو بۆ لایان. کە هانسیان بینی دڵخۆش بوون بەتایبەتی سارا، وایزانی ئیتر خەمەکە بەری داوە. هەموو پێکەوە نانیان خوارد و هانس هەوڵی دەدا لەگەڵ منداڵەکانیدا بکەوێتە گاڵتەو گەپ و قسەکردن. پاشان داوای لێکردن ئەمڕۆ خۆیان بەتەنیا بچنە سەر دەریا، کەسیان ئەمەیان پێخۆش نەبوو، بەڵام دایکیان چاوێکی لێیان داگرت و ئیتر هەموو ڕازی بوون.

هانس بە تەنیا مایەوە و سارا لێی پرسی گەر حەزبکات دەتوانێ لەگەڵی بمێنێتەوە، ئەو وای پێ باشبوو خۆی بەتەنیا بمێنێتەوە. سارا ڕۆیشت و ئەمیش خۆی دا بەسەر جێگەکەدا و نەیدەزانی هەستەکانی خۆی تاوتوێ بکات. تیشکی چاوەکانی ئەو کچە دەروونی دەهەژاند، ئۆقرەی نەدەگرت، دەهات و دەچوو دەیویست لە خۆی بگات، ئەم هەستە چییە وا سەری لێشێواندووە. هەرگیز وای بە سەرنەهاتووە، بڵێی ئەمە خۆشەویستی بێت، بڵێی ئەم هەموو ساڵە ئەم بەبێ خۆشەویستی ژیانی لەگەڵ سارا بردبێتە سەر و سێ منداڵی لە ژنیک بووبێ کە خۆشینەویستبێ. ئەم بیرۆکانە هەموو گیانی دەهەژاند. چووە باڵکۆنەکە لەوێ دانیشت و سەیری دەریای دەکرد بەو هیوایەی کەمێک ئارامیی وەربگرێ. کە شەپۆلەکان خۆیان بە کەناری دەریاکەدا دەکێشا، فرمێسکەکانی ئەو کیژەی دەهاتە پێش چاو کە بەسەر گۆنا گەنمڕەنگیەکەیدا شۆڕ دەبوونەوە. چاوەکانی دەنوقاند و جارێکی تر سەیری پانتایی دەریاکەی دەکرد پانتایی دەریا دەبووە چاوە پڕ خەمەکانی ئەو کچە. هەستاو چووە ژوورەوە، دەیویست بەسەر هەستە نامۆیەکانیدا زاڵبێ، نازانێ ئەمە چییە. "نا دەبێ ئەم هەستەی من خۆشەویستی بێ، ئەو خۆشەویستییەی لە یەکەم بینینەوە دروست دەبێ. جا خۆ من منداڵنیم، من پاش چەند مانگێکی تر دەبمە چل و یەک ساڵ. جاران سەیرم بە خۆشەویستی لەم چەشنە دەهات. پێشتر هەستم بە شتێکی وا نەکردووە، بڵێی سارام خۆشنەویستبێ، نا باوەڕ ناکەم، ڕۆژێ لەڕۆژان بیرم لە کەسێکی تر نەکردۆتەوە، باشە ئەم هەستەی ئێستام چییە. گەر من سارام خۆشبوێ بۆ دەبێت هەستێکی وام بەرامبەر کچێک هەبێ کە نایناسم و نازانم کێیە. کێ دەڵێت ئەویش هەمان هەستی بەرامبەر بە من هەیە، لەوانەیە ئەویش مێرد و منداڵی هەبێت و ئەو ڕۆژە لەگەڵ مێردە خۆشەویستەکەیدا شەڕی بووبێ بۆیە وا لە قوڵایی دڵییەوە دەگریا، لەوانەشە خۆشەویستێکی هەبێ و شەڕیان بووبێ. بڵێی بتوانم ئەم چەند ڕۆژە ببەمە سەر و بە سەلامەتی ڕزگارم بێ بەبێ ئەوەی دڵی سارا و منداڵەکان زیزبکەم. هەرچۆنێ بێ

دەبێ ئاسایی بم و بەسەر ئەم هەستەمدا سەربکەوم و ئەم پشوویە لە منداڵەکانم تێک نەدەم. ئەوانیش هەستیان کردووە نائاساییم. نابێ ئەم پشووە خۆشەیان لێ تێک بدەم. من بەسەر زۆر زروفی گرانتردا زاڵبووم."

چەند گرانە گڕوگاڵی هەستێکی تازە لەدایکبوو بشاریتەوە، سیمای ئەو هەستە لە تابلۆی چاودا بفڕێنی. هانس بەدوای کومەڵێ پرسیاردا وێڵ بوو، کە تاقە ڕێگەیەکیش چیبوو نەی دەدۆزییەوە، نەشی دەتوانی تەلەفۆنەکە هەڵگرێ و قسەیەک لەگەڵ سکرتێرەکەی بکات، هەواڵی ئەو کیژە بپرسێ کە ئەم فەزایەی لە دەروونیا بەرپاکردووە. یان تەلەفۆن بۆ ژوورەکەی خۆی بکات بەڵکو لەوێ بێت و گوێی لە دەنگی بێت. لەوانەیە گەر لە ژوورەکەشی بێت وەڵام نەداتەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر بەیانی زوو بە هێمنی جلەکانی لەبەرکرد و چووە دەرەوە، لەو باوەڕەدا نەبوو سارا یان منداڵەکانی وا زوو خەبەریان بێتەوە، هیچ نەبێ لەسەر دەریا دەتوانێ بە ئازادانە بیر بکاتەوە، خۆ گەر خەڵکی لێ نەبێ دەتوانێ بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ خۆی بکات. کە دەرگای ژوورەکەی کردەوە سارا خەبەری بوویەوە، بەڵام هیچی نەوت، دەیزانی مێردەکەی پێویستی بەوەیە تەنیا بێ، هانس وا ڕاهاتبوو بەیانیانی زوو چاوێک بە ڕۆژنامەدا بگێڕێت و خواردن بۆ هەموویان ئامادەبکات. ئەو شەوانەشی کاری دەکرد کاتێک دەگەیشتەوە، هەر خۆی نانی بەیانی ئامادە دەکرد ئینجا دەچوو دەخەوت.

کەناری دەریاکەی گرت، بێ ئەوەی بزانێ بەرەو کوێ دەیبیا. ڕۆیشت... کەلای کردەوە هەستی کرد لە شار دوور کەوتووەتەوە. لەسەر بەردێک دانیشت و چاوی بڕیە دەریاکە... بە دەنگی بەرز گریا. لە دوورەوە شنەیەکی فێنک هەڵیکرد و سووتانی دەروونی کپ دەکردەوە. ئەو شنەیە تا دەهات لێی نزیک دەبوویەوە وەک پەرژینێک لە خەم و پەژارەی دابڕی. بەسەر شنەباکەوە ئەو کیژە پاڵکەوتبوو کە هەموو جەستە و بیری داگیرکردووە. سەری بەرزکردەوە و بزەیەکی فریشتە ئاسا گرتی، باوەشی بۆ هانس گرتەوە، ئەمیش هەستایە سەرپێ تا ئامێزی بۆ بکاتەوە بەڵام هەرچەندی دەکرد نەدەگەیشت پێی. هاواری کرد "ئەرێ تۆش منت خۆشدەوێت؟" بەقەد قوڵی ئەم دەریایە بەقەد شینایی ئاسمان بەقەد گەرمی هەتاو و ساردی سەهۆڵبەندان تۆم خۆشدەوێت، خۆشەویستییەک کە هەتا ئێستا هیچ ڕۆمان نووسێک باسی نەکردبێ، تۆ زەوی و ئاسمانی ڕۆحی منی. هانس لە خۆشیدا نەیدەزانی چیبکات کە زانی ئەو هێندەی خۆش دەوێت. خۆی هەڵدا تاباوەشی پێدابکات،



کەوتە ناو ئاوەکەوە و لەهەمان ساتدا کیژەکە وەک فریشتە لەگەڵ شنەباکەدا ونبوو، بەجلی تەڕەوە هەستایە سەرپێ و بە دڵێکی خۆشەوە وتی "ئەویش منی خۆشدەوێت". گوێی نەدایە جلە تەڕەکانی و بەرەو ئوتێلەکە گەڕایەوە.

– هانس گیان ئەوە چییە هەموو گیانت تەڕبووە؟

– کەوتمە ناو ئاوەکەوە. بەڕوویەکی خۆشەوە ئەمەی گوت و چووە حەمامەکە. لەبەر خۆشیەوە دەیگوت، ئەویش منی خۆشدەوێت. ساراش دڵی خۆشبوو، پێی وابوو خەمەکەی بەریداوە و هاتووەتەوە سەرخۆی. گوێی نەدایە ئەوەی چۆن کەوتووەتە ناو ئاوەکەوە.

– هانسی خۆشەویست جلی ترت بۆ بێنم تاخۆت بگۆڕی؟

هانس بەلوعەکەی بەردابووە و گۆرانی دەوت و گوێی لە سارا نەبوو. ئەمیش دڵی خۆشبوو مێردەکەی وەک جاران لە حەمامدا گۆرانی دەڵێت.

کاتەرینا هات و لە دەرگاکەی دا.

– دایە ئامادەن بچین نان بخۆین زۆر برسیمانە.

– باوکت خۆی دەشوات. چاوەڕوانی دەکەین؟

– نا دایە گیان زۆرمان برسیە. با ئەو پاشتر بێت.

سارا لە دەرگاکەی داو پێی ڕاگەیاند کە ئەوان لە خوارەوە چاوەڕوانی دەکەن. بەمەزەندە هانس ئەمەی پێخۆشبوو، کە هاتە دەرەوە خێرا تەلەفۆنی بۆ نەخۆشخانەکە کردو قسەی لەگەڵ ئێڤا کرد.

– ئێڤا چۆنی. دەزانی زۆر گرنگە قسە لەگەڵ ئەو کچە بکەم کە ژوورەکەم پاک دەکاتەوە، ئەرێ بیرم چووەتەوە ناوی چیبوو؟

– ناوی شیرینە، هەرچ کارێکت هەبێ بە منی بڵێ پێی ڕادەگەیەنم.

– نا نا دەمەوێ خۆم قسەی لەگەڵ بکەم و پێی بڵێم هەندێ شتم داناوە فرێی نەدات. سوێدی تێدەگات؟

– خەمت نەبێ من پێی دەڵێم، کچێکی گورجە و سوێدیش تێدەگات، هەرخۆم پێیدەڵێم.

– نا نا تکایە ژمارەی تەلەفۆنەکەم بنووسە، پێی بڵێ پاش سەعاتێکی تر چاوەڕوانی تەلەفۆنی دەکەم.

ژمارەکەی بۆ خوێندەوە و تەلەفۆنەکەی داخست، بەدڵێکی خۆشەوە جلەکانی لەبەرکرد و چوو نانی بەیانی لەگەڵ منداڵەکانیدا خوارد.

هەستیان کرد دڵی خۆشە و دەم بەپێکەنین و بزێوە. ئاننا لێی پرسی:

– بابە ئەمڕۆ لەگەڵمان دێیتە سەر دەریا ؟

– بێگومان دێم. تەنیا چاوەڕوانی تەلەفۆنێک دەکەم، ئێوە بچن. منیش پاش تەلەفۆنەکە دێم.

سارا و منداڵەکان خۆیان کۆکردەوە و تا بچنە سەر دەریا ئەمیش لە ژوورەکەیدا مایەوە خواخوای بوو بەزووترین کات بڕۆن نەوەکا لەو کاتەدا شیرین تەلەفۆنی بۆ بکات. چووە باڵکۆنەکە و لەوێش خۆی پێڕانەگیراو هاتەوە ژوورێ. لەسەر جێگاکە پاڵکەوت و سەیری سەعاتەکەی دەستی کرد. ترسی لێنیشت ئێڤا بیری چووبێ پێی بڵێ.

لەناکاوا هانس بەرەو تەلەفۆنەکە ڕایکرد.

– بەڵێ. هانس، فەرموو،

– من شیرینم. داوات کردبوو تەلەفۆنت بۆ بکەم.

– شیرین. من ئەم بەیانییە تۆم بینی.

– لەکوێ؟ تۆ لەوێ و من لێرە.

– ئەم بەیانییە کە لەسەر دەریا بووم، تۆم بینی. بەسەر شنەی شەماڵەوە بوویت، هاتی و بەمنت وت: بەقەد قوڵایی دەریاو بەقەد شینی ئاسمان، بەقەد گەرمی هەتاوو ساردی سەهۆڵبەندان...

– خۆشەویستییەک کە هیچ ڕۆمان نووسێک نەینووسیبێت. تۆ زەوی و ئاسمانی ڕۆحی منی.

– کەواتە ئەوە ڕاستی بوو.

– وایە ڕاستی بوو. تۆ ئەو هەوایەی کە من هەڵتدەمژم.

– تۆش منت خۆشدەوێت. تۆش وەک من ئۆقرەت لێبڕاوە؟

– لە تۆ زیاتر کەسی تر نابینم. ئەمڕۆ کە ئێڤا پێی وتم دەتەوێ قسەم لەگەڵ بکەی یەکسەر تێگەیشتم.

– گەر ئەم قسەیەم لەگەڵ نەکردیتایە لەوانە بوو دڵم بوەستێ و نەگەڕێمەوە.

– ئەوە مەڵی چونکە دڵی منیش دەوەستێ. چەند ڕۆژی تر دەگەڕێیتەوە؟

– حەوت ڕۆژی تر. پاش حەوت ڕۆژی تر یەکتر دەبینین، ئەو ڕۆژە نەڕۆیت هەتا من نەتبینم.



چاوەڕوان بە. منت خۆش دەوێت شیرین وانییە ؟ڕاستیم پێ بڵێ.

– بەقەد ژیانم تۆم خۆشدەوێت. لەو ڕۆژەوە هەردەم بیر لە تۆ دەکەمەوە، هەردەم لە پێش چاومی.

– هەموو گیانت ماچ دەکەم. تێر تێر لە ئامێزت دەگرم.

تەلەفۆنەکەی داخست و ئوتێلەکەی بەجێهێشت و چوو بۆ سەر دەریا. سارا هەوڵی دەدا ڕووی تێنەکات و خۆی لێ لادات. جارانیش کە لەسەر دەریا دەبوون لە تەنیشت ئەمدا پاڵدەکەوت و زۆرجاریش سەری دەخستە سەر سنگی، کەچی ئەمڕۆ لە نێوان منداڵەکانیدا خاولییەکەی ڕاخستووە و سەیریشی ناکات. سارا پەرێشان بوو دەیویست بزانێ هۆی ئەم گۆڕانکارییە چییە کە ڕوویداوە. بیری لەخۆی دەکردەوە و دەیوت لەوانەیە من هەڵەیەکم کردبێ و هانس نەیەوێ پێم بڵێ.

سەری دێنا و دەبرد هیچ هەڵەیەکی لە خۆیدا بەدی نەدەکرد کە بەرامبەر ئەو کردبێتی، لەو باوەڕەشدا نییە کەسێک شتێکی خراپی لەسەر باسکردبێ، "بڵێی ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ مامۆستاکاندا دەرچووین و نانمان خوارد پاشان من و "هۆکان" ماوەیەک پیاسەمان کرد، خۆی یان کەسێکی تر ئێمەی بینیبێ، لەو باوەڕەشدا نیم چونکە ئەو هیچ کاتێک گومانی لە من نەدەکرد" ئەم بیرۆکەیە و چەندانی تر لە مێشکی سارادا دەهاتن و دەچوون و ئەم گرێیەی بۆ نەدەکرایەوە.

هانس لەگەڵ منداڵەکاندا ئاسایی ببووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمدا تەواو گۆڕابوو، تەنانەت نزیکی نەدەکەوتەوە، جلی نووستنی دەپۆشی و ماچێکی ڕومەتی دەکرد و شەوباشی لێدەکرد و ڕووی وەردەگێڕا و دەخەوت. ساراش نەیدەوست لەم ڕووەوە قسەی لەگەڵ بکات، چونکە دەیزانی شتێ ڕوویداوە، هیچیشی لەخۆیدا شک نەدەبرد، ئەمەش بۆ سارا هەزم نەدەکرا چونکە پێشترگرفتی وایان نەبووە. هەرچۆنێ بێ سارا بڕیاری دا تا دەگەڕێنەوە ماڵێ لەم مەسەلەیە بێدەنگ بێت، بۆ ئەوەی سەفەرەکەیان لێ تێک نەچێت و منداڵەکان بێزار نەکەن.

هانسیش هەموو بەیانییەک دەچووە سەر دەریا و بەجلی تەڕەوە دەهاتەوە، دوا بەیانی وەک جاران لە خەو هەستاو جلەکانی لەبەرکرد و چووە دەرەوە، ساراش بڕیاری دا بە دزە دوای بکەوێ. نهێنی ئەم جل تەڕبوونەی بۆ ئاشکرا بێت.

بە کەناری دەریاکەدا ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە هەموو بەیانییەک شیرینی تێدا دەبینێ. بەڵام ئەو ڕۆژە شیرین دەرنەکەوت. تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد بینی کاتی نانی بەیانییە، پێش

ئەوەی بڕوات وەک عـادەت خـۆی فـڕێ دایە ناو ئاوەکـەوە، کـە سـارا چاوی لەم دیمەنە بوو وایزانی مـێـردەکـەی دەیەوێ خـۆی بکوژێ، بۆیە قـیـژاندی و تا لای ئاوەکـە ڕایکرد تانەیەڵێت خـۆکـوژیی بکات، هانس گیان، خۆشەویستەکەم زیاتر مەڕۆ ئاوەکە قوڵ دەبێتەوە هانس... هانس.

کە هانس لای کردەوە سارای بینی، شڵەژا، ئاخۆ سارا هەموو ڕۆژێ دوای کەوتبێ. هەموو ڕۆژێ کە دەگەڕایەوە بۆ ئوتێل ئەو خەوتبوو. بلێیی ڕۆژەکانی تر هاتبێ و شیرینی بینیبێ. ئەمڕۆ شیرین نەهات چونکە ئەمی لێرە بینیوە. هانس نەیدەزانی توڕە بێت یان کارەکەی خۆی پاساو بدات، سارا لەوە نەدەگەیشت کە بۆ مێردەکەی بە جلەوە دەچێتە ناو ئاوەکەوە. کە سارا بەرەو ڕووی ڕایکرد، هانس سارای ڕاکێشا و خستیە ناو ئاوەکەوە و دەستی کردە پێکەنین، "تاقیکەرەوە کە مەلەکردن بەجلەوە تامـێکی تری هەیە". کـەوتنە شـەڕە ئاو. هەردووکـیـان بەجلی تەڕو بە پێکەنین گـەڕانەوە ئوتێلەکە.

بایەک هەڵیکرد. ئەو چەند لاپەڕەیەی کە بە دەسـتـمـەوە بوون، لەگـەڵ خـۆی بردنی و کـەوتنە ناو دەریاکەوە. لەسەر ئاوازی سیمفۆنیای دەروون کەوتنە سەما. پێشتر سەمای وشە و پەڕەم بە سەر باڵی شەپۆلەوە نەدیبوو. بەلامەوە هێندە جوان بوو، بیری ئەوەم نەما خۆم فڕێ بدەمە ئاوەکەوە و ئەو بەشە نووسراوەی ڕۆمانەکەم بهێنمەوە.



# 7

دوێنێ شەو من و شارا هەر نەخەوتین. منداڵەکەمان خەواند و بێدەنگ بووین ئەوجا سەیرێکی یەکـتـرمـان کـرد و دامانە پرمەی گـریان. لێک وردبووینەوە و دەسـتـمـان کرد بە پێکەنین و پاشان باوەشمان بەیەکتردا کرد. باری خەممان ئەوەندە گران بوو توانای هەستانیشمان نەبوو.

– دەهەستە بچۆ بخەوە، سبەی کاردەکەی.

– خەوم نایە. چایەک سازدەکەم ؟

– چای چی، هەر خەومان لێناکەوێ. مەگەر تۆزێ شەراب بخۆینەوە گێژمان بکات. دڵنیام تۆش شەرابت نییە.

– شەرابی چی. یەکجار تامم کرد دڵم خەریکبوو دەهاتە دەرەوە.

– کچێ نەوعی خۆشیان هەیە. تۆزێ سەرگەرمت دەکات.

– دیارە مەیخۆرێکی ئەسڵیت نەمانناسیووی.

– کچێ نەوەڵا. هەندێ جار بەدزییەوە تامم دەکرد بەتایبەت کە جەژنی لەدایکبوونی قوتابییەک بوایە. بە هەزار شەرەشەق ڕێگایان دەدام بچوومایە.

– چەند ساڵە لێرە دەژیت؟

– حەوت ساڵە.

– حـەوت سـاڵە لێـرە دەژیت و کـەچی واشت بەسـەر هاتووە. باشـە کـە دەتدەزانی ئامـۆزاکـەت کابرایەکی وا قەڵبە بۆ شووت پێکرد.

– بەزۆر، ئەویش چیرۆکی خۆی هەیە.

شارا سیانزده ساڵ دەبێ کە دێنە سوێد، دوو خوشک و سێ برا دەبن. ئەم لە هەموویان بچوکتر دەبێ. فێری زمان دەبێت و حەزی لەم ژیانەی ئێرە دەبێت. کە دەبێتە پانزده ساڵ ئێتر دەستوورێکی تایبەتی بۆ دادەنرێت. چوونە دەرەوە قەدەغەیە، دوای قوتابخانە دەبێت بگەڕێتەوە ماڵێ، گەرچی باوکی پیاوێکی سیاسی بوو لە ئینتەرڤیوشدا لای پۆلیس جەختی لەوە کردبوو کە ئەم بۆ داکۆکیکردن لە زمان و کولتوور و ئازادی و ئیدنتیتێتی گەلەکەی پەراگەندەی ئێرە بووە، کەچی ڕێگایان بە کچەکەیان نەدەدا زمانی دایک بخوێنێت چونکە ئەو دەرسە دەکەوتە پاش دەوامی ئاسایی و درەنگ دەگەیشتەوە ماڵێ. گەر یەک دەقە لە قوتابخانە دوابکەویت قاچت دەبڕم. لەگەڵ براکەشتدا ناچیتە دەرەوە، دەزانم دوا جار چوویتە سینەما. بۆ نازانم تەماشای چ جۆرە فیلمێک دەکەی. ئێستا لەگەڵ کچدا دەچیتە سینەما دوایی دەبێتە کوڕ. ئێستا براکەت هەڵدەخەڵەتێنیت و لەگەڵ خۆتدا کێشی دەکەی بۆ ئەملاو ئەولا. دەتەوێ ئەویش بەدخوو بکەی. لەمەودوایش تەلەفۆن بۆ هیچ هاوڕێیەکت ناکەیت و تەلەفۆنیش هەڵناگریت.

هەر هاوینی ئەو ساڵە بەسەردان گەڕانەوە وڵاتی خۆیان و لە ئامۆزاکەی مارەیان بڕی و ئەوکات شارا لە پۆلی دووەمی ئامادەیی بوو. بەنیاز بوو نمرەیەکی باش بهێنی و لە بەشی مافناسیی بخوێنێ. ئەو ساڵە ساڵێکی پڕ نەهامەتی بوو، توانای خوێندنی نەما، حەزی نەدەکرد بچێتە قوتابخانە و لە ماڵەوە دەمایەوە. تۆزقاڵێ ڕووناکیت لە ڕوویدا بەدی نەدەکرد، کز و مات دەهات و دەچوو، قسەی لەگەڵ هاوڕێکانیشیدا نەدەکرد. مامۆستاکانی داوای بینینی دایک و باوکیان کرد. وا باسیان کرد کە کچەکەیان کەوتۆتە خۆشەویستی ئامۆزایەکییەوە، ئێستا بەڕێوەیە بۆ سوێد و ساڵێکی تر شوو بەو دەکات. هەڕەشە لە شارا دەکرێ کە نابێت بەهیچ شێوەیەک ئەم درۆیە ئاشکرا بکات.

یەکێک لە مامۆستاکانی و سیکۆلۆگێک بەڵێن دەدەن ئەوەی لە توانایاندا بێت دەیکەن تا ئەو کوڕە زوو بگاتە سوێد. ئەم کارە شارای تورەکرد. ڕێگایان لێگرت بچێتە قوتابخانە، دایکی بە دیارییەوە دەمایەوە بۆ ئەوەی نەچێتە دەرەوە یان تەلەفۆن بۆ کەس نەکات. بەرلەوەی ئەم فریا بکەوێت و خۆی لەم قۆرتە ڕزگار بکات، بردیانەوە بۆ وڵات و لەوێ هێشتیانەوە. پاش ساڵێک شارا بە خۆی و مێردەکەی و سکێکی پێنج مانگانەوە هاتەوە بۆ سوێد. هەوڵیدا منداڵەکەی لەباربچوێنێت، بەڵام بێ کەڵک بوو.



شاراو مێردەکەی تا دوو مانگێ لەماڵی باوکیدا مانەوە، پاشان خانوویەکی بچووکی یەک ژووربیان بۆ پەیدا کردن. داوای یارمەتی سۆسیال کراو ئیتر بەم شێوەیە ژیان بەسەربرا تا منداڵەکەی بوو. بە بڕیاری باوکی، مێردەکەی کرابووە حەرەسی شاراو ڕێگەی پێنەدەدا یەک هەنگاو لە ماڵ دوور کەوێتەوە. هاوڕێکانی شارا هەموو ئامادەییان تەواو کردبوو. شاراش هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ قوتابخانەدا نەمابوو لەبەر ئەوەی تا ئەمان لە وڵات هاتنەوە، ماڵی باوکی لە ناوچەیەکی تر خانوویان کڕیبوو. شارا چەند جارێ هەوڵیدا پەیوەندی بە قوتابخانەکەی جارانی بکات، بەڵام سەری نەگرت چونکە لەو ناوچەیەدا ناژین. باوکی شارا چەند سەعاتێک کاری ڕەشی بۆ زاواکەی دۆزیبیەوە. ئەویش پاش کۆرسی زمان دەچووە کار. باوکی یان براکەی بە ئۆتۆمبیل دەهاتن بە دوای شارادا، تا مێردەکەی لە کار دەهاتەوە، لەماڵی باوکی دەمایەوە.

شارا تەواو لەم ژیانە بێزار بوو، نەیدەزانی چی بکات. ڕۆژێک هەرچۆنێ بوو توانی قسە لەگەڵ سیکۆلۆگی قوتابخانەکەی بکات و هەموو شتەکانی بۆ بگێڕێتەوە. ئەو نەیتوانی یارمەتی بدات لەبەرئەوەی ئێستا لای ئەوان ناخوێنێت. ڕێگای پیشاندا کە خۆی بگەیەنێت بە پۆلیس. شاراش لە پێوەندی کردن بە پۆلیس زۆر دەترسا، باوکی هەڕەشەی ئەوەی لێکردبوو هەر کارێکی لەم چەشنە بکات خۆی و دایکی دەباتە سەفەر و زیندە بەچاڵیان دەکات. بۆیە نەیدەوێرا کارێکی وا بکات و ببێتە هۆی ئەزیەتدانی دایکی. شارا دایکی زۆر خۆشدەویست، دەیزانی ئەویش لە باوکی زۆر دەترسێ، ئەم بۆ خۆی بینیبووی کە باوکی چەندان جار دایکی دارکاری کردووە. ئەو ڕۆژانەی کەدایکی بەدیار شاراوە دادەنیشت هەزار تکاو ڕجای لێدەکرد کە باوکی تورەنەکات.

ئەمە بوو چیرۆکی ئەو کچەی لاتەوە دانیشتووە وباش دەیناسی.

– زۆر بەزەییم بە دایکمدا دێتەوە، تەنیا بیری دایکم و توانای برام دەکەم، ئەو لەگەڵم باشبوو، زۆرجاریش بەدزییەوە یارمەتی دەدام. زۆر حەز دەکەم لە کونێکیشەوە بێت دایکم ببینم.

– تۆ دەتوانی بەدزییەوە دایکت ببینی. من هەوڵدەدەم بۆت ڕێکبخەم.

– بیر لە شتی وامەکەرەوە، لەوانەیە دایکیشم توشی گرفت ببێ. خۆ بزانن لە پشتی ئەوانەوە منی بینیوە باوکم دەیکوژێ. حەزم دەکرد بزانم ئێستا چی بەسەر هاتووە، پاش ئەوەی من ئەم کارەم کرد. فێڵم لە دایکم کرد. ڕۆژێک دەبوایە بهاتایە بە شوێنمدا، بە تەلەفۆن قەناعەتم پێکرد کە پێویست ناکات ئەزیەتی خۆی بدات و "دەریا" تۆزێک نەخۆشە دەیبەمە لای دکتۆرو پاشان خۆم

دەچمە وێندەر. ئەو ڕۆژە فرسەتم هێناو چوومە پۆلیس و هەموو شتەکانم بۆ گێڕانەوە. ئیتر ئەوەبوو منیـان لەو شوێنە دانا. تەنیـا داوای ئەوەم لێکردن ئاگـاداری مـاڵەوەمـان بکەن کە بەدوای مندا نەگەڕێن. جا نازانم چییان لە دایکم کرد پاش ئەو ڕۆژە. هەوڵیشم دا تەلەفۆن بکەم، کەچی دایکم تەلەفۆنی هەڵنەدەگرت.

– دوای ئەوە هیچ هەواڵێکت نەزانی؟

– تەنیا جارێک ئەو ژنەی کاری لەگەڵ دەکردین وتی هەواڵم زانیوە دایکت هەر لە ماڵەوە دەژی، من ترسی ئەوەم لێنیشتبوو باوکم بردبێتییەوە و کوشتبێتی.

– باوەڕناکەم بتوانێ کارێکی وا بکات، تەنیا ویستوویەتی ئێوە بترسێنێ.

– شتی وا زۆر کراوە بێ ئەوەی کەس پێی زانیبێ. هەر دایکم باسی کچێکی بۆم کرد باوکی زانیبویەتی لە قوتابخانە پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکدا هەبووە، زۆر بە نەرمی قسەی لەگەڵ کردووە و بەڵێنی پێداوە کە گەڕانەوە لە سەفەرەکەیان زەماوەند بکەن. هاوینەکەی سەفەریان کردووە. دواتر بەبێ کچەکە گەڕاونەتەوە و کەسیش نازانێ کچەکە ماوە یان نا.

– باوەڕناکەم، لەوانەیە بۆ ترساندنی تۆ ئەم چیرۆکەی ڕێکخستبێ.

– نا نا ڕاستـە. گـوایە کـوڕەکـە سـۆراخی کـچـەکـەی کـردووە و وتوویانە لە وڵات تووشی نەخۆشییەکی کتوپڕ بووە و مردووە. تەنانەت باوکەکەی وەفاتنامەشی هێناوەتەوە بۆ سوێد. بەڵام دەنگ و باسێکی واش بڵاوە کە بەشوویانداوە و لەوێ بەجێیان هێشتووە.

– بڵێیم چی. بڵێی باوک هەبێ بتوانێت کچی خۆی بکوژێت؟

– ئاخر بۆیە منیش زۆر دەترسێم کە دایکم شتێکی لێکرابێت. لەوانەیە بە یاخیبوونەکەی من تاوانباریان کردبێت.

– گەر ناونیشانەکەیم بدەیتێ من دەتوانم هەواڵێکی بزانم.

– نا دەترسم. لەگـەڵ ئەوەی زۆر بیـری دەکـەم دڵم خـەریکە دەتەقێ. هەندێ جـاریش دەڵێم نەدەبوایە ئەو کارەم بکردایە. گەر چاوەڕوانم بکردیا تا ماوەیەکی تر لەوانەیە کابرا بگۆڕابایە و لە ژێر دەسـەڵاتی باوکم دەرچوایە. ئەو یەک هەنگاوی بەبێ باوکم نەدەنا. زۆرجـاریش هەوڵم دەدا قسـەی لەگەڵ بکەم بۆ ئەوەی بۆ خۆمـان بژین نەک بۆ باوکم. یان ڕێگەی منی بدایە بچـومـایەتە دەرەوە. دەزانی ڕێگای نەدەدام تەلەفۆنیش بەکاربهێنم.



– دەڵێی هەمـویان لەیەک قـوتابخـانە دەرس دراون، ئەوەی منیش وای لێکردم. تەلەفـۆنکردن قەدەغە بوو لە دەرەوەش دەرگـاکەی دادەخست. لەسەرەتادا کە هاتم یەک دوو مـانگ ڕێگەی دام زمان بخوێنم. دوایی ئەوەشی قەدەغەکرد. دووجار لە شەودا هەوڵی ڕاکردنم دا، بە داخەوە سەری نەگرت.

– تۆش کەمت بەسەر نەهاتووە، بەڵام بۆ بێدەنگ دەبوویت، ئامادە نەبوویت باسی ژیانی خۆت بکەیت.

– وابزانم کەستان وەک من توشی ئازار و چەرمەسەری نەبوون، هەر هیچ نەبێ هەریەکە لە ئێوە کەسێکتان هەبووە لێرە یان فریا کەوتوون فێری زمان بن، بەڵام من هەر پاش چەند مانگێ خرامە زیندانەوە. نەدەمتوانی پەیوەندی بە کەسەوە بکەم نەشمدەزانی چی بکەم.

– ئەی چۆن ڕزگارت بوو.

– ئەوەش چیرۆکی خۆی هەیە. ئەو شەوەی کە ویستم ڕابکەم پێی زانیم و زۆری لێدام. منیش ئەوەندەی لە توانامـا بوو قیـژاندم و هاوارم کرد، یەکسـەر دەمی بەستم بۆ ئەوەی دەنگم نەڕوات. ئیتر تا بەیانی نوزەم دەهات. بەیانی خۆی هەستاو چوو بۆ کار. گوێم لێبوو کەسێک لە دەرگای دا بەهێواشی چووم و لە چاوی دەرگاکەوە تەماشا بکەم.

سەیرم کرد ژنێکی پیربوو. خۆ نەشمدەتوانی دەرگاکە بکەمەوە. تەنیا لە کونی پۆستەکەوە پێم گوت:

– من سوێدی تێناگەم، ئینگلیزی دەزانی؟

– ئا دەزانم. دوێنێ شەو گوێم لێبوو دەگریای لەوەی دەکرد مێردەکەت لێتبدات. ئەوە چەند جارێکە گوێم لە دەنگە دەنگ دەبێت. مەترسە قسە بکە بەڵکو من بتوانم یارمەتیت بدەم.

لە سەرەتاوە نەموێرا وەڵامی بدەمەوە، نەوەک هەر خۆی ناردبێتی و بیەوێ تاقیمبکاتەوە، دوای نیو دەقیقەیەک گوتم لەوە زیاتر دەبێ چیم لێبکات.

– مێردەکەم دەرگای لەسەر داخستووم ناتوانم بچمە دەرەوە.

– ئەی ناتوانی تەلەفۆن بۆ کەسێکت بکەی.

– کەسم لێرە نییە، ناشزانم چی بکەم. من چەند مانگێکە لێرەم.

– دەتەوێ یارمەتیت بدەم؟

– گەر بتوانی یارمەتیم بدەی هەموو تەمەنم سوپاست دەکەم.

– هەوڵدەدەم بۆ چەند لایەک تەلەفۆن بکەم بۆ ئەوەی بزانم بە چ جۆرێک ڕزگارت بکەین. سبەینێ وەڵامت دەدەمەوە.

ئەو ژنە منی لەو دۆزەخە ڕزگار کرد. هەموو کات تەلەفۆنی بۆ دەکەم و سوپاسی دەکەم. بەنیازم لە سەری ساڵدا دیارییەکی بۆ بنێرم. تا ئێستا ئەو کەربابەی مێردم نەیزانیوە چۆن ڕزگارم بووە. لەوانەیە گەر بیزانیایە ئەو ژنە یارمەتی داوم شتێکی لێبکردایە. ئێستاش هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە گەر ڕێککەوتی ئەو ژنەم نەکردایە دەبوو چیم بەسەر بهاتایە.

– کەواتە من دەبێ شوکری خوا بکەم کە ژیانم وەک تۆ نەبووە. خۆ زیاتر تەحەمولم بکردایە ڕەنگە بمتوانیبا کار لەو کەرەی مێردم بکەم.

– وا مەڵێ. کێ دەڵێ خراپتر نەدەبوو، هەر ڕۆژێک دەبوو بتەقێیتەوە و کێش ئەڵێ ئەنجامەکەی لەمە خراپتر نەدەبوو. خۆ بە دووری مەزانە بیانبردیتایە بۆ سەفەر، لەو سەریشەوە وەفاتنامەیەکیان بۆ سازکردیتایە.

– نازانم چی بڵێم. زۆرجار بەزییم بە "دەریا" دا دێتەوە. چۆن بێ باوک گەورە ببێ. یان تاکەی بەم شێوەیە بژیم. لێیان دابڕێم و دایکم و توانای برام نەبینم. هەندێ جار پەشیمانم لەوەی بەم شێوەیە هەڵسوکەوتم کرد، ئێستاش ناوێرم بگەڕێمەوە. چونکە نازانم چیم لێدەکەن.

– دەزانی گەر تۆ وابیر بکەیتەوە ژیانت مەحاڵ دەبێت. تۆ بڕیارت دا لە خێزانەکەت دابڕێیت، دەبوایە پێش وەخت بیرت لە هەموو ئەنجامەکانی ئەم کارە بکردایەتەوە.

– ئاخر کارەکان زۆر بە خێرایی ڕوویاندا. تەنیا بیرم لە دەرچوون دەکردەوە لەو زیندانە بێ ئەوەی بزانم دابڕان لە خێزان بۆ من چ دەگەیەنێ.

– وا بیر مەکەرەوە. ئەگینا ژیانت لێ تاڵتر دەبێت و ناتوانیت بەرەنگاری ئەو گرفتانە بببیتەوە کە ڕووبەڕووت دەبنەوە.

– ئەمانە هیچی چارەسەر نین. من وا ماوەیەکی تریش لێرەبووم، یان شوێنێکی تریان بۆم دۆزیبیەوە. گرفتی ئێمە بەمجۆرە چارەسەرناکرێ. تاکەی من وا بژیم، لەوانەیە گەر ئەم منداڵەم نەبوایە باوکم بکوشتایە، چونکە لەم هەموو کارەساتانەی بەسەرمدا هاتوون، تەنیا ئەو بە تاوانبار



دەزانم. ئەوبوو ئێمەی گەیاندە سوێد. لێرەش نەیدەهێشت وەک منداڵی ئەم وڵاتە منداڵێتی خۆمان بژین. خۆ من داوای شتی گەورەم نەدەکرد، دەمویست وەک هاوڕێکانم بژیم و دەشت و دەر بکەم، بچمە سینەما. من هیچ کاتێک بیرم لەوە نەدەکردوە، کە ئەو لێی دەترسا. ئەو وایدەزانی گەر من بچمە دەرەوە یەکسەر خۆم فڕێ دەدەمە باوەشی کوڕێکەوە. ئاخر وانییە. تەنانەت کچە سوێدییەکانیش وا نین، ڕاستە هەندێکیان بێ گوێدانە هیچ سنوورێک خۆیان دەدەن بەدەستەوە. بەڵام ئەوانەی لە خێزانێکی ڕێکوپێکن هەموو شتێ لەکاتی خۆیدا دەکەن.

– ئێ وایە لە هەموو ئەو کارەساتانەی بەسەرماندا دێن پیاوەکان خەتاباری یەکەمن، بەڵام خۆشمان دەورمان هەیە. من بەشبەحاڵی خۆم خەتامی تێدابوو. بڵێ بۆ بەگوێی دایکم کرد و شووم کرد بە کابرایەک کە نەمدەناسی. لە وڵات هەرچۆنێ بێ دەمتوانی کارێک بدۆزمەوە خۆمانی پێ بژێنم. کەهاتیشمە ئێرە بەهیچ جۆرێ چارەسەرێکی ترم نەبوو لەم ڕێگایە زیاتر. پەشیمان نیم لەوەی کە ئێستا کردوومە، لەوە پەشیمانم کە شووم بەم کابرا نەخۆشە کرد. منیش بیردەکەمەوە بگەڕێمەوە بۆ وڵات، بەڵام هێشتا نە ئیقامەی هەمیشەییم وەرگرتووە نە پاسپۆرتم هەیە. من وەک تۆ گرفتی خێزانم نییە، ئەوەندەش بواری نەدامێ تا کەسانێک بناسم و دۆست و برادەرم هەبێ.

– تۆ لێرە خەڵک ناتناسێ، بەڵام ئێمە لە زۆربەی شارەکاندا دۆست و ناسیاومان هەیە. مەگەر بچمە کوێرە دێیەک. ئاخر من و کچەکەم تاوانمان چییە تا بەو شێوەیە بژین. سەیرکە وەک لقێکمان لێ هاتووە کە لە دار بڕابێتەوە.

– تاوانی تۆ ئەوەیە کە کچیت و لە یاساو ڕێسای باوک و براکەت لاتداوە.

– تا مردنیش نامەوێ بەپێی یاساو ڕێسای ئەوان بژیم.

– ئێ وا بڵێ، مادام ناتەوێ بەو جۆرە بژیت دەبێت ئامادەبی بۆ هەموو قوربانیەک تا وەک مرۆڤێکی کامڵ بژیت.

سەیرێکی یەکترمان کرد و بێ دەنگ بووین، لە سەر قەنەفەکە پاڵکەوتین و تەماشای گڵۆپە هەڵواسراوەکەمان کرد. بێدەنگی وەک ڕەشماڵێک خۆی دا بەسەر بیرکردنەوەماندا، وەنەوز دەیبیردینەوە و خەومان لێنەدەکەوت. دەمانویست لەگەڵ خەمەکانماندا بژین و لەیادیان نەکەین و لێیان جیانەبینەوە. هەرچۆنێ بوو من باشتربووم، منداڵم نەبوو کە خەمی بخۆم. بیرۆکەیەکم بۆ هات.

– دەڵێی چی پەیوەندی بەو ژنە سویدییەی ئەو شارەوە بکەم کە پێشتر لێی بووم، بەڵکە یارمەتیت بدات و دەست بکەیتەوە بەخوێندن.

– بۆ وادەزانیت ئەوە هێندە ئاسانە.

– قسەی لەگەڵ دەکەین بەڵکو بتوانێ یارمەتیت بدات، بێگانەشی خۆشدەوێت.

– ئێ باشە قسەی لەگەڵدا بکە، با هێندەش قورسایی نەخەمە سەر تۆ.

– دەزانی دڵگران دەبم گەر وا بیربکەیتەوە، تۆ هەرگیز بارگرانیی نییت بەسەرمەوە، بە پێچەوانەوە دڵم زۆر خۆشە کە دەگەڕێمەوە کەسێک لە ماڵەوەیە قسەی لەگەڵ بکەم.

دووبارە بێدەنگ بووینەوە، ئەمجارەشیان ئەو دەستی کرد بەگریان و من بەدوایدا و باوەشمان بەیەکتردا کرد.

– وەختە سوێم بێتەوە بۆ دایکم، نازانم ئەویش وایە بۆم.

– شارا خەم مەخۆ، ئەمشەو بخەوە، سبەی بیرێکی لێدەکەینەوە.

ئەو چووە ژووری نووستنەکە و لەپاڵ کچەکەیدا خەوت، منیش هەر لە هۆڵەکەدا پاڵکەوتم. خەوم لێنەدەکەوت، بیرم لە هانس دەکردەوە. ئاخۆ ڕێکبکەوێ و بیبینم، ئاخو چیم پێ بڵێ، ئاخۆ ئەویش بیر لە من دەکاتەوە. ئەی ئەگەر سبەی گەڕایەوە و هەر سەیریشی نەکردم چیبکەم! ئەویش خۆی لە خۆیدا ئازارێکی گەورەم بۆ دەخوڵقێنێ. کەسێکت خۆشبوێ کە بیر لە تۆ نەکاتەوە، ئەو کات دەبێت واز لە کاریش بێنم. یان لە شوێنێکی تر کاربکەم، تەماشاکردنەکەی ئەو ڕۆژەی تەنیا نیشانەی خۆشەویستیم تێدا دەبینی. خۆزگە ئەو ڕۆژە وەنەوز نەیدەبردمەوە، گەر وانەبوایە ئەوم نەدەبینی. ئەم خۆشەویستییەش لەدایک نەدەبوو.

ئای دایە ئەم شووەی پێت کردم چەند گیرۆدەیی بۆ هێنام. تۆ نازانی ئەم شووە چ برینێکی قوڵی لە دەروونمدا هەڵکۆڵیوە. برینێک مەگەر مەرگ سارێژیبکاتەوە. ئێستاش بە جیدی بیر لەوە دەکەمەوە هەرچۆنێ بێت بگەڕێمەوە، هەرکە پاسپۆرتەکەم وەرگرت بە یەکجاری دەچمەوە و تا بە ئازادی هەناسە بدەم و خوێندنەکەشم تەواو بکەم. بەڵام ترسی ئەوەم هەیە ئەو خوێڕییە لەوێش وازم لێنەهێنێ و حەقی ئێرەم لێبکاتەوە، حەقی ئەو چەند ڕۆژە زیندانیبوونەی ئێرە و بە گوللەیەک ساردم بکاتەوە، خۆ کەس یەخەی ناگرێ، لەوانەیە هەر بە پارە بەکەسێکی تری بکات. دایکم دەیوت کچم مەگەڕێوە ئەوێت سەلامەتترە. هیچ نەبێت لەوێ کەسێک هەیە دیفاعت لێبکات و



یارمەتیت بدات.

ئاخر تاکەی دایە گیان وەک سیاسیە کۆنەکانی لای خۆمان شار بە شار بکەین و خۆمان لە ناسیاو و دۆست بشارینەوە. ئێمە ساویلکەین بە قسەی پیاو هەڵدەخەڵەتێین، بەرەنگاری ناهەقییەکانیان نابینەوە، ئەوان پلانی ژیان بۆ ئێمە دادەنێن و ئێمەش لەسەر قسەکانی ئەوان دەڕۆین. پیاوێکی حەقانی وەک باوکم وا زوو مرد. پیاوێک کە هەرگیز خراپەی بۆ من و دایکم نەبوو، کەچی کەسانێکی مێشک کرماویی وەک ئەم مێردانەی ئێمەمانان دەژین.

هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە گەر پیاوان تۆزێ عاقڵانەتر بیر بکەنەوە، ژیانمان مانایەکی قوڵتری ئینسانی وەخۆوە دەگرت. ئەو کەربابە بۆ وای لێکردم، کە هاتمە ئێرە وام نیاز بوو ژیانێکی ئاسوودە دابین بکەم، هەوڵیشم زۆردا بێ کەڵک بوو، هەرچی توانا و عەقڵم هەیە بەکارم هێنا نەمتوانی کاری لێبکەم و واز لە بیرە دۆزەخاوییەکانی خۆی بێنێ. هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە ئەو بەو شێوەیە هەڵسوکەوتم لەگەڵ بکات، ئەو سۆز و پەیمانەی لە وڵات پێیدام لە سەدا سەد جیاواز بوو لە کردەوەکانی ئێرەی. خۆ گەر لە سەدا پەنجاشی ڕاست بوایە ژیانم لەگەڵ دەبردەسەر.

زۆرجاریش ئەو قسانەی نەورۆزم بیر دێتەوە کە بۆی باسکردم و من بڕوام پێنەدەکرد. ئەوەی تۆ دەتگوت زۆر کەمتر بوو لەچاو واقیعی ئەم کابرایە. ئەوەی بەسەرم هات لە ڕۆمان و فیلمە خەیاڵیەکانیشدا ڕوونادەن. وەک ژن... وەک مرۆڤ بێزم لە خۆم دێتەوە. ئەوا دەریا دەگری، دیارە شارا خەبەری نابێتەوە، بابچم ژیری بکەمەوە، لەوانەیە برسی بێت و کاتی ئەوە بێت شیرێکی بۆ ئامادە بکەم.

بێ ئەوەی شارا خەبەری بێتەوە دەریام هێنایە هۆڵەکە. هەر کە منی بینی کەوتە گڕوگاڵ و شنەشن. چوومە موتبەخەکە و مەمکە شووشەکەم پڕ لە شیر کرد و لەگەڵیدا کەوتمە قسەکردن، وەک ئەوەی لێم تێبگات جوان جوان گوێی بۆ دەگرتم و چرکەی لە خۆی بڕیبوو، تەنانەت هەندێ جاریش لە مژینی مەمەکەی دەوەستا و زۆر بە سەیرەوە تەماشای دەکردم، وا هەستم کرد لەقسەکانم دەگات، بۆیە بڕیارمدا نهێنییەکەی خۆمی بۆ باسبکەم. خۆ ئەو گەر بشزانێ ناتوانێ بۆ کەسێکی تری بگێڕێتەوە.

دەریا گیان دەزانی چی، لەڕاستیدا ناوم شیرین نییە ناوی ڕاستیم "هەتاو"ە من لە دەست مێردەکەم هەڵاتووم و لە ترسی ئەو ناوی خۆمم گۆڕیوە، ڕەنگی چاوم دەبینی سەوزە، بەڵام کە

دەچمە دەرەوە لینزی ڕەش لەچاو دەکەم بۆ ئەوەی کەس نەمناسێتەوە. هەروا کەوتومەتە داوی خۆشەویستی دکتۆرێکی سویدی کە ژن و منداڵی هەیە، جاران قسەم بەو کچانە دەوت کە شوویان بە پیاوی ژندار دەکرد و دەچوونە سەر ژنێکی تر. من مەبەستم ئەوە نییە شوو بەو کابرایە بکەم، بەڵام ئەمە خۆی لە خۆیدا کارێکی سەمەرەیە. خۆ ئەگەر ئەو منی خۆشنەوێ ئەوە هەر باشترە، من دەتوانم ملم بشکێنم و لەم ناوە دووربکەومەوە. گرفتەکە لەوەدایە گەر ئەویش منی خۆش بوێ، ئەو کات دەستبەرداربوون لەو هەستە گرانترە، خۆت دەزانی گەر پیاوێک ژنێکی خۆشبوێ ئەوا ئامادە نییە لەبەر ژن و منداڵ واز لەو خۆشەویستییە بهێنێ، پیاوان وا دروستکراون کە تەنیا خۆیان ببینن. ئەم خۆشەویستییەی من مێرد و ژنێک لەیەک جیا دەکاتەوە. دوای ئەوە خەتای من نەبوو کەوتمە خۆشەویستی کابرایەک کە نایناسم، لەوانە بێ خەتای هەستم بێت. یان خەتای ئەو هەموو فەنتازیایەی کە هەمە، خەوم بەوەوە دەبینی شوو بە پزیشکێکی لێهاتوو بکەم و پێکەوە ببینە باسکار و لە جیاوازی پێکهاتەی پیاو و ژن بکۆڵینەوە، ئایا ئەم جیاوازییانە لە جەستەماندا کار لە بیرکردنەوەو هەڵسوکەوت و کەسایەتیمان دەکات، بۆ دەبێت پیاو لە ژن بدات و داهاتووی دیاریبکات، بۆ دەبێت پیاو بڕیاربدات کەی لەگەڵ ژنەکەی دەخەوێت و بەچ شێوەیەک، بۆ دەبێت بڕیاری هەموو شتێک بدەن لەژیانی ئێمەدا. بۆ دەبێ بمانکوژن و کەسیش نەتوانی قسەیەک بکات. بۆ ئەبێ پیاو پەردەی نەبێت و هیچ ژنێکیش لەیەکەم شەوی بووک و زاوایەتیدا ئەوە نەزانی چەند جار پەردەی مێردەکەیان دڕیوە. من دەمویست لەگەڵ دکتۆرێکی زیرەکدا ژیان دەست پێبکەم و بەدوای نهێنییەکانی پیاودا بگەڕێم، من دەمویست پیاوێک بدۆزمەوە وەک خۆم بیربکاتەوە، من باوکم بەشووی نەدام، لەو باوەڕەشدام گەر باوکم بمابا ڕازی نەدەبوو شوو بەکابرایەکی وا بکەم، من جیا لە کچانی شار دایکم بەشووی دام. بەڵام دایکم لێم تووڕە نەبوو تێلای لێم هەڵنەگرت و بەزۆر بە شووم بدات دایکم گریاو تکای لێکردم کە شوو بەم کابرایە بکەم. تەنیا بۆ ئەوەی لەو ژیانە پڕەردەسەرییە نەجاتمان بێت. من شووم بەپارە کرد بۆ نەجاتدانی دایک و دوو کوڕە سەقەتەکەی. ئەی تۆ دەڵێی چی دەریا خۆ تۆش وا شوو ناکەی.

دەریا مەمەکەی لە دەمی لابرد: من وەک ئێوە شوو ناکەم. ئێوە دەبێت ئەو ئاوێنانە بشکێنن کە پیاوەکان تەنیا خۆیانی تێدا دەبینن.

ئەبڵەق بووم و هەڵبەزیمەوە. چۆن دەبێ منداڵێکی وا وەک ئێمەی گەورە بیر بکاتەوە، چۆن



دەتوانێ قسە بکات. دەستم خستە سەرگوێچکەم بۆ ئەوەی بزانم ئەوە ڕاستی بوو، ئەوە دەریا بوو یان عەقڵی ناوەوەی خۆم. نا ڕاستی بوو ئەوە هەر دەریا بوو ئەو قسانەی دەکرد. دەنگە ناسکەکەی خۆی بوو. دەنگەکەی هەروەک دەنگی گریانەکەی بوو.

– مەترسێ و شپرزە مەبە من دەریام، تۆ باوەڕت بە زیندووبوونەوەی ڕۆحەکان هەیە؟

– مەبەستت چیە؟

– کە ئێمە دەمرین، ڕۆحمان نامرێت لە کەسێکی تردا زیندوو دەبێتەوە. منیش هەرچەندە گیانم بچووکە، بەڵام ڕۆحی کەسێکی ترم تیا زیندوو بووەتەوە، ئێستا ئەو ڕۆحەیە لەگەڵ تۆ قسە دەکات.

# 8

ئەو بەیانییە وەک بەیانییەکانی تر نەبوو. شیرین و هانس نانیان پێنەخورا. هانس کەچووە دەرەوە کلیلی ئۆتۆمبیلەکەی بیرکرد و شیرینیش جانتاکەی بیرچوو. دەبوایە سواری پاسی ژمارە ١٠ بێت خۆی کردبوو بە پاسی ژمارە ٤ دا، هانسیش لە شەقامێکی هەڵەوە لای دایەوە. هەردووکیان بە ترسێکی سەیرەوە ڕێگای کاریان گرتە بەر. هانس نەیدەزانی کەی لە ژوورەکەیدا بێت تا شیرین ببینێ، شیرینیش نەیدەزانی کەی ژوورەکە پاکبکاتەوە تا ئەو ببینێ. ئەم دوو بیرۆکەیە مێشکیانی جەنجاڵ کردبوو. هەردووکیان لە کارەکەیان دواکەوتن.

لە سەرەتادا دەبوو ئامادەی کۆبوونەوەی ڕۆژانە بێت و زانیاری سەبارەت بە نەخۆشەکان وەرگرێت، کە گەیشت ئێڤا بەرەو رووی ڕۆیشت و لێی پرسی:

– دوا کەوتی، پێش تۆزێ تەلەفۆنم بۆ ماڵەوەتان کرد، وتیان دەرچووی. سارا نیگەران بوو، وتی کە گەیشت با تەلەفۆنم بۆ بکات.

– ڕێگا قەرەباڵغ بوو، تکایە تۆ تەلەفۆنێکی بۆ بکە با فریای کۆبوونەوەکە بکەوم.

ئێڤا دەیوست هەواڵی سەفەرەکە لە هانس بپرسێ، کەچی هەر ڕێک نەدەکەوت. ئەمڕۆش بواری پرسیاری پێنەدا و یەکسەر چووە ژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی جلەکانی بگۆڕێ. هانس دەیزانی ئەمڕۆ شیرین دێتە کار، بۆیە هەموو مێشکی لای ئەوە بوو ببیبینێ. نەشیدەوێرا هەواڵی بپرسێ نەوەک سەرە دەزوویەک بە دەستەوە بدات.

شیرینیش ئاگای لە خۆی نەبوو، لە ژوور و قاوشەکانەوە زووزوو سەری لە دەرگاوە دەردەهێنا.



ئەمڕۆ وەک ڕۆژانی تر بەدەم نەخۆشەکانەوە پێنەدەکەنی، قسەی لەگەڵ نەدەکردن. یەکێ لە نەخۆشەکان پرسی:

– کچە جوانەکە خۆ نەخۆش نیت؟ ماندوو دیاری، دیارە باش نەخەوتووی.

– ڕاست دەکەی، نەخۆش بووم، دوێنێ شەویش تووشی شەونخوونی بووم، خەوم لێ نەدەکەوت.

– ئێ دەباشە بە دکتۆر دەڵێم حەبێکی خەوت بۆ بنووسێ تاخەوت لێبکەوێ.

شیرین پێکەنی و هیچی نەوت. ژوورەکەی پاککردەوە و چووە دەرەوە. لە ڕاڕەوەکەدا تۆزێ خۆی خەریک کرد، بەڵام بێ کەڵک بوو.

ئەویش بەهەمان شێوە ئەمڕۆ زیاتر لە ڕاڕەوەکەدا خۆی خەریک دەکرد، دووراو دووریش بیبینێ لە تەلیسمی چاوەکانی دەگات. چاوەکانی هێندە گەشن وەک تیشکی ڕۆژ شەوق دەدەنەوە.

گەرمی خۆشەویستی لە دوورایی هەزاران میللەوە دەگات، ئەی ئەوە نەبوو هەموو ڕۆژێ تیشکی خۆشەویستی شیرین خۆی دەگەیاندە شەپۆلەکان و لەهەموو شوێنێکی ئەو وڵاتە دەنگی ئەوی دەبیست. دیارە شیرین ئەمی زۆر خۆشدەوێت.

هانس دەیویست لەگەڵ نەخۆشەکانیدا وەک جاران بێت، بەڵام بۆی نەدەکرا، نەخۆشی تازەشیان بۆ هاتووە، دەبوایە بەوردی تەماشای ڕاپۆرتەکانیان بکات. بەڵام بێ هوودە بوو، بڕیاری دا لەکاتی پشووی نانخواردندا هەڵێک بدۆزێتەوە ببیبینێ.

نزیکی سەعات یانزە و نیو بوو کە هاتەوە ژوورەکەی خۆی بە ئێڤای وت.

– ئێڤا یەکێ لە نەخۆشەکان داوای لێکردم ئەو کچە ببینم کە ئێرە پاکدەکاتەوە، گوایە نەخۆشە.

– منیش هەستم بەوە کردووە، ماندوو دیارە. چەند ڕۆژێکیش نەهات بۆ ئیش.

– دەتوانی بیدۆزیتەوە. من نیازم نییە نان بخۆم، پێویستە تۆزی کەمتر بخۆم.

– ئەوە چ دەڵێیت. لەم سەفەرەتدا پێچەوانەی سەفەرەکانی تر لاواز بوویت، چەند کیلۆ کەمتکردووە؟ تۆش ماندوو دیاریت.

– ئەمشەو خراپ خەوتووم. بیرت نەچێت پێش ئەوەی بچی بۆ نانخواردن ئەو کچەم بۆ بنێرە.

هانس چووە ژوورەکەیەوە، تەنیا بیری بەو کچەوە خەریک بوو. زوو زووش سەیری سەعاتەکەی دەکرد و دەچووە دەرەوە و دەهاتە ژوورەوە، ئۆقرەی نەدەگرت. دەیویست بزانێ کەی ئێڤا دەڕوات بۆ نانخواردن.

– هانس دەتەوێ شتێکت بۆ بهێنمە سەرەوە لەگەڵ خۆمدا؟

– نا سوپاس، هەست بە برسێتی ناکەم، دەبێ هەندێ کار تەواو بکەم و دوایش گەر ئەو کچە زوو بنێریت بۆلام باشە، بۆ ئەوەی زۆر کاری ترم بەدەستەوەیە.

– خۆ گەر دەتەوێ دەتوانم قسە لەگەڵ دکتۆر ئولێ بکەم بیبینێ.

– نا... نا بەڵێنم بە ئینگرید داوە کە خۆم بیبینم، دیارە نەخۆشەکانمان زۆریان خۆش دەوێت.

– هەر نەخۆشەکان خۆشیان ناوێ، ئاگات لە چییە.

– مەبەستت کێیە؟

– ئەی نەتزانیوە؟ ئێوە کە ژنتان هەیە ئاگاتان لە بێژنەکان نییە. "بوسێ" زۆر بەدوایدا ڕادەکات و دەیەوێ پەیوەندی لەگەل ببەستێ، بەلام ئەو گوێی ناداتێ. دەڵێن کچی بێگانە مافی ئەوەیان نییە یان ناوێرن شوو بە پیاوی سوێدی بکەن. گرنگ ئێستا دەچم بانگی دەکەم، بەلام تۆش ئاگات لە خۆت بێت. نەوەک وابزانێ حەزت لێیەتی، ئەگینا بەلای ژوورەکەی تۆشدا نایەت.

لە ژوورەکەی دانیشتبوو، ڕووی کردبووە دەرگاکە و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد لەناکاوا لە دەرگاکەی بدات. بیری لەوە دەکردەوە گەر خۆی بکات بە ژووردا چیبکات، پەلاماری بدات و لە ئامێزی بگرێ، یان جوڵە لە خۆی ببڕێ و بزانێ ئەو چیدەکات.

بەشەرمێکەوە هاتە ژوورەوە و سەیرێکی هانسی کرد و بزەیەک گرتی، بزەیەکی پڕ عیشق و ناز، دەیویست تەماشای نەکات بۆ ئەوەی نیگای خۆشەویستی لە چاوانیدا دەرک پێ نەکات. بەلام خۆشەویستی وەک چرایەکی نەکوژاوە لە دڵیدا دەسوتا و بە هیچ ڕەشابایەک نەدەکوژێنرایەوە.

– داوات کردبوو ببینی.

– فەرموو دانیشە لێرە، ئینگرید وتی نەخۆشی.

بۆ ماوەیەک دەستی خستە سەر دەمووچاوی بۆ ئەوەی هێمن بێتەوە و شیرین گوێی لە ترپەی دڵی نەبێ و بە سەر ئەو هەستەی کە دەیویست شیرین لە ئامێزی بگرێ زاڵبێ، شیرینیش ئەو هیوایەی کە لە دەروونیا گڕی گرتبوو خەریک بوو دەکوژایەوە، شیرین ترسی ئەوەی لێنیشت کە هەمان هەستی خۆشەویستی لای هانس نەبێ. ئەویش سەیرێکی عاشقانەی شیرینی کرد.

– ئەو ڕۆژە چاوەکانت سەوزبوون کەچی ئێستا ڕەشن.

–ئەم ڕەنگەی ئێستا لینزە. سەری دانەواند و پێکەنی.

– دەتەوێت فەحسێکت بکەم بۆ ئەوەی بزانین چیتە.

شانێکی هەڵتەکاند و قسەی نەکرد.



– دەتوانی لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵبکەوی.

هەردووکیان بەرەو قەرەوێڵەکە چوون، دەڵێی موگناتیس لە گیانیاندایە، بەرەویەک ڕۆیشتن. خۆیان فڕێ دایە باوەشی یەکترەوە و پێکڕا گرمۆڵە بوون. هەرچەندیان دەکرد لێک جیانەدەبوونەوە. شیرین ویستی لەباوەشی دەرچێ، بەلام ئەوەندە توند لەئامێزی گرتبوو نەیتوانی.

– گەر ئەمڕۆ وا لە ئامێزم نەگرتیتایە دەمردم.

– تکایە بەرم بدە نەک کەسێک بێتە ژوورەوە.

– دەمەوێ هەمیشە لە ئامێزمدا بمێنی، دەمەوێ لەگەڵتا تێکەڵ بم و بە هیچ جۆرێ لێت جیانەبمەوە.

– منیش هەروا بەلام تکایە لەسەرخۆ بە، ترسی ئەوەم هەیە کەسێک بێتە ژوورەوە.

– نا مەترسە هەموو لە نانخواردنن، دەوەرە لەبەردەممدا دانیشە با تێر سەیرت بکەم. یان باشترە ڕێککەوین ئێوارە پاش کار لە شوێنێک یەکتر ببینین. قسەم زۆرە. دەمزانی تۆش منت خۆش دەوێت. ئەگینا لە هەموو شوێنێک گوێم لە دەنگت نەدەبوو.

شیرین بەو قسانە پێکەنی، شەرم دایگرت.

– کەی لە کار تەواو دەبیت؟

– سەعات شانزدە.

– سواری پاس ببە تا دەگەیتە لای قاوەخانەکەی سەر سوچەکە. لەوێ دابەزەو چاوەڕوانم بکە. گەر دوا کەوتم بچۆ قاوەخانەکە، من بۆ چوارو نیو لەوێ دەبم، گەر دواش کەوتم... هەرچەندە دوا ناکەوم، بەسەر دەرزییەوە دەبم هەتا دەتبینم.

هانس بەخێرایی ماچێکی کرد و لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت و شیرینیش لای قەرەوێڵەکە وەستابوو. نەیدەتوانی لەجێگەی خۆی بجولێتەوە. ئا لەو کاتەدا ئێڤا لەدەرگای داو هاتە ژوورەوە.

– ئەوە قاوە و پارچەیەک کێکم بۆ هێناوی. ها شیرین ئەوە هاتی. ئەی ئەم کچە جوانە چیی بوو.

– ئەم کچە جوانە دەبێ ئیجازە وەرگرێ و ماوەیەک پشوو بدات، پێویستی بە هەندێ ڤیتامین و حەوانەوە هەیە.

شیرین هیچ قسەی نەکردو چووە دەرەوە. ئێڤا سەیری هانسی کرد، هەستی کرد شتێک ڕوویداوە. چییە نازانێ. لە هانسەکەی سەر لە بەیانی نەدەکرد. دڵی خۆشە و چاوەکانی

دەبریسکێنەوە. بۆ ئەوەی خۆی لە پرسیارەکانی ئێڤا لادا وتی:

– دەزانی ئەو ماوەیەی لێرە نەبووم، دەترسام کارەکان باش ئەنجام نەدرابن، بەڵام دیارە هەموو شت ئاسایی بووە.

– دەزانی گەر هەموو دکتۆرەکان وەک تۆ خەمی نەخۆشەکانیان بوایە ئەوا دەنگی نارەزایی بەرز نەدەبووەوە. بەڵام دەبێ بیر لەوەش بکەیتەوە کە ئیشەکەت کار لە ژیانی تایبەتیت نەکات، سنوور دابنێ، قسەم لەگەڵ سارا کرد کە تۆ چۆن بەردەوام بیرت لای نەخۆشەکان و کارەکانی ئێرە بووە. دەزانی واش باش نییە.

– ڕاست دەکەی، هەندێ شت هەیە لەدەسەڵاتی خۆماندا نییە.

ئێڤا چووە دەرەوە و هانس لەسەر کورسییەکەی مایەوە، چاوەکانی نوقاند تا کەمێک وەنەوزەخەو بکات. بەڵکە جارێکی تر شیرین بێت و لە دەرگا بدات، ئەمجارەیان بەبێ شەرم بێتە ئامێزی، باشترە لە شوێنێک بێت کە کەسی لێ نەبێ لە هاتنە ژوورەوەی کەس نەترسن. بیری لەوە کردەوە لە کوێ بیبینێ باشە. خۆ نازانی شووی کردووە یان نا. تەنیا ئەوەندە دەزانێ کە خۆی ژنێک و سێ منداڵی هەیە. هێشتا فریای ئەوە نەکەوتووە لە خۆی بپرسێ بەم تەمەنەوە چۆن کەوتۆتە داوی خۆشەویستی کچێکەوە کە زۆر لەو منداڵترە، بەڵام بۆ ئەو گرنگترین مەسەلە ئەوەبوو بزانێ شیرینیش ئەمی خۆشدەوێت. ئەمەی زانی، ئێستا دەبێت بیر بکاتەوە چ بکات. واز لە ژنەکەی بێنێ کە تەمەنێکە یەکتر دەناسن و پێکەوە دەژین، ئەی منداڵەکانی؟ ئەی چۆن دەتوانێ کەسێکی خۆش بوێ و لەگەڵ کەسێکی تردا بژی. ئەی چۆن شیرین بەو ژیانە ڕازی دەبێت. ئاخۆ بزانێ کە ئەم ژنداره. ئەم هەموو پرسیارانە وەڵامیان دەوێت. بەڵام هیچ یەکێ لەو پرسیارانە لەمێشکی ئەودا جێگەی نەدەبوویەوە، تەنیا شتێ کە بیری لێ دەکردەوە، دۆزینەوەی شوێنێک بوو بتوانی بەئارامی شیرینی لێ ببینێ. بچن بۆ دەرەوەی شار یان لە یەکێ لەهوتێلەکاندا ژوورێک بەکرێ بگرێ. یان لە چێشتخانەیەکدا شوێنێکی تایبەت بۆ دووکەس کە بتوانن ئازادیی خۆیان وەرگرن. تەلەفۆنێکی بۆ سارا کرد، وەڵامی نەدایەوە. ڕاسپاردەیەکی بەجێهێشت " سارا گیان ئەمڕۆ زۆر کارم هەیە و درەنگ دەگەڕێمەوە. ئاگات لە منداڵەکان بێت، هەوڵدەدەم پێش خەوتنی ئەوان بێمەوە، دەتوانی تەلەفۆن بۆ مۆبیلەکەم بکەیت"

لە خەیاڵی سارادا نەبوو مێردەکەی لەگەڵ کچێکی تردا کات بەسەر بەرێت.



ئەو ڕۆژە کات نەدەڕۆیشت. کات وەستابوو. هەر سەیری سەعاتیان دەکرد، ئەوان تەنیا ئەوە دەزانن کە یەکتریان خۆشدەوێت، خۆشەویستییەکی بێسنوور، بیریان لەوە دەکردەوە چۆن یەکتر لە ئامێزبگرن و ئەمجارەیان بەبێ شەرم و دوودڵی دەم بخەنە ناو دەمی یەکترەوە.

لە دوو شوێنی جیاوازدا بوون، بەڵام لەگەڵ یەکدابوون. هەر یەکەیان کارێکی دەکرد، بەڵام لەئامێزی یەکتردا بوون. کات نەدەڕۆیشت، دیوارەکانی نێوانیان تەنک ببوونەوە و یەکتریان دەبینی.

هەرچۆنێ بێت چوار و نیو هات و شیرین لەبەردەمی قاوەخانەکەدا چاوەڕوانی دەکرد و هانسیش بەپەلە لەکار دەرچوو، بەرەو گەراجەکە ڕۆیشت و، خۆی گەیاندە بەردەم قاوەخانەکە، شیرین وەستابوو، دەرگای ئۆتۆمۆبیلەکەی بۆ کردەوە.

– بۆ کوێ دەڕۆین؟

– شوێنیک کەمتر خەڵکی لێبێت، شوێنێکی هێمن.

پێکەنی و چاوەکانی خەریکبوون شیرینیان قوتدەدا. شیرینیش هەموو گیانی دەلەرزی، لۆمەی خۆی دەکرد، چۆن لەگەڵ کابرایەکی نەناسدا سواری ئۆتۆمبیل ببێ لە کاتێکدا نازانێ بۆ کوێی دەبات. سەیرێکی ئەوی کرد و دەستی کرد بەگریان، لە پەنایەکدا ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت.

– بۆ دەگری؟

– بۆ کوێ دەچین.

– دەزانم دەترسی، وایە. مەترسە لە چاوانی خۆم زیاتر خۆشمدەوێیت. نهێنی ئەم خۆشەویستییەش نازانم چییە. ئەوەی چاوەڕوانم نەدەکرد لە ژیاندا ئەمە بوو، دڵنیابە کارێک ناکەم ئازاری تۆ بدەم. بێ بیرکردنەوە و پلان یەکترمان خۆشویست. ئەم خۆشەویستییەمان لە دەستەڵاتی کەسماندا نەبوو. دەبێ دانیشین و قسەیەک بکەین. شوێنێکم دۆزیوەتەوە تۆزێ دوورە، لەوێ دەتوانین بەهێمنی دانیشین و قسەبکەین، هەر ئێمە لەوێ نابین، خەڵکی تریشی لێیە، بەڵام باوەڕناکەم کەسێکی ناسراوی من یان تۆی لێبێ.

ئەمەی وت و ئۆتۆمبیلەکەی خستەوە کار و دەستێکی بەڕومەتە سورهەڵگەڕاوەکانی شیرین دا هێنا. شیرین تۆزێ هێمن بووەوە. بەڵام گیانی وەک تەنوور گڕی گرتبوو. پڕ بەدڵ حەزی دەکرد وەک کەشتییەک لە ئامێزیدا لەنگەربگرێ.

چێشتخانەکە ڤیللایەکی کۆن بوو لەسەر ڕۆخی دەریاچەیەکی دەرەوەی شار. پێش سەد ساڵێک

دروستکرابوو. چەند ژوورێکی بچووکی تێدابوو. لە هەر ژوورێکدا مێزێک و چوار کورسی دانرابوو. چوونە یەکێک لەو ژوورانە، لەسەر مێزی ژوورەکە دوو مۆمی بۆندار داگیرسابوون. چاکەتەکەی لە شانی شیرین کردەوە، کورسییەکەی بۆ ڕاکێشا تا دابنیشێ.

- شتێک دەخۆیتەوە؟

- نا سوپاس.

- ماسی دەخۆیت.

- بەڵێ.

- ماسیم داواکردووە، هیوادارم بە دڵت بێت.

هانس بیری لەوە کردەوە کە کچانی بێگانە هەندێ داب و نەریتی خۆیانیان هەیە. ڕەنگە پێی خۆش نەبێ کتوپڕ ماچی بکا یان لە ئامێزی بگرێ. بەڵام دەیزانی کچانی ڕۆژهەڵات پێش شووکردن پەیوەندی سێکسی لەگەڵ کەسدا نابەستن. بە هێمنی سەیرێکی دەستەکانی کرد و بینی هیچ ئەڵقەیەکی لە پەنجەدا نییە. دەستی شیرینی گرت و ماچی کرد.

- شووت نەکردووە؟

- بەڵێ! جیابوومەتەوە. کەسمانیش بیرمان لەوە نەکردەوە کە تۆ ژنت هەیە. ئەمەی وت و سەری داخست.

- ئەو هەستەی ڕۆحمانی داگیرکرد بواری ئەوەی پێنەداین بیر لە شتی وابکەینەوە، ئێستاش جارێ کاتی ئەو باسانە نییە. ئەم ئێوارەیە تەنیا باسی خۆشەویستی دەکەین. ئەو خۆشەویستییەی دەروونی داگیرکردوین. ئەو ڕۆژەی کە من هاتمە ژوورەوە و تۆ لەسەر کورسییەکە دانیشتبووی دەتزانی دەکەوینە داوی یەکترەوە؟

- پێم وانەبوو جارێکی تر پیاوم خۆشبوێ، یان حەز بە بینینی پیاوێک بکەم، ئەو بیرۆکەیە بۆم نامۆ بوو.

- منیش هەروا، سارا ژنمە و سێ منداڵم لێی هەیە و لە باخچەی ساوایانەوە یەکتر دەناسین و هەر پێکەوەبووین، بووین بە ژن و مێرد. کەس باوەڕ بەوە ناکات پاش ئەم هەموو ساڵە من بکەومە داوی خۆشەویستی کچێکەوە کە نەشمدەزانی شوویکردووە یان نەء... زۆر شتی تر. من و تۆ دەبێ ئەم خۆشەیستییە بپارێزین...



- ئاخر تۆ ژنێک و سێ منداڵت هەیە.

- ئەوە کێشەی منە و چارەی دەکەم، گرنگ ئەوەیە تۆ مێردت نییە.

- ئاخر من دەبمە هۆی دابڕانی تۆ لە خێزانەکەت.

- با جارێ واز لەو کێشانە بێنین. من زۆر شتم هەیە پێت بڵێم. جارێ ئەتوانی لینزەکانت لاببەی. بۆ ڕەنگی چاوت گۆڕیووە؟

- ئەی خۆت نەتوت جارێ باسی ئەو کێشانە ناکەین.

- ڕاست دەکەیت. دەبێ شتەکان بە شێوەیەکی مەنتیقانە چارەسەر بکەین. بە تەنیا دەژیت؟

- ئێستا کچێکی برادەرم لام دەژی لەگەڵ منداڵەکەیدا.

- خۆت منداڵت نییە؟

- نەخێر. باشتر نییە هەر لێرەدا کۆتایی بەهەموو شتێک بێنین.

هانس هەستایە سەرپێ و بەدەنگێکی بەرز وتی:

- هەرگیز. کەسەیری شیرینی کرد و هەستی کرد دەنگە بەرزەکەی ترساندوویەتی، لەبەردەمیدا دانیشت و سەری خستە سەر کۆشی و بێدەنگ بوو. کەسێک لە دەرگاکەی داو خەبەری کردنەوە.

- بۆ ئێستا ئەم خواردنەیان هێنا ! خۆ برسیمان نەبوو. شیرین ئەمەی وت و دەستی کرد بە پێکەنین.

- نا دەبێ خواردن باش بخۆیت، عەشقێکی وا مرۆڤ دادەهاڕێ، گەر ئاگات لە خۆت نەبێ و باش نەخۆیت هێزت لێدەبڕێت.

سەری مەنجەڵەکەی کردەوە و زەڵاتە و خواردنی خستە سەر قاپەکەی شیرین. تەلەفۆنەکەی زەنگی لێدا.

- ها سارا تۆیت. بۆ سەعات چەندە. بۆ سەعاتێکی تر لە ماڵەوە دەبم. خواحافیز. ویستی بەزووترین کات قسەکانی لەگەڵ سارادا ببڕێنێتەوە، بواری ئەوەی نەداتێ پرسیاری لێبکات.

شیرین زیاتر لەجاران سوور هەڵگەڕا.

- بابڕۆین باشترە. ڕێگەکەش کاتی دەوێت.

- با تۆزێکی تر دانیشین و خواردنەکەمان تەواو بکەین. من دەبێ چارەی ئەم کێشانە بکەم، بەڵام وەختیان دەوێت، بەشێوەیەک کە کەس بریندار نەکەین، من بەهیچ شێوەیەک واز لە تۆ ناهێنم، بۆیە تکایە بەڵێنم پێبدە کە جێمنەهێڵی، بەڵێنم پێبدە کە نەهێڵی بەخەمی خۆشەویستی

تۆوە ونبم.

ڤیللاکەیان جێهێشت و سواری ئۆتۆمبیلەکە بوون. تا گەیشتن کەسیان قسەیان نەکرد. هانس شیرینی لەنزیک ماڵەکەی دابەزاند و ماچێکی گۆنای کرد.

هانس ڕۆیشت و شیرینش گەڕایەوە ماڵێ. شارا نیگەران بوو، چونکە هەموو ڕۆژێ بۆ سەعات پێنج دەگەڕایەوە کەچی ئەمڕۆ نزیکی سەعات نۆیە... هەر کە شیرین خۆی کرد بە ژووردا شارا باوەشی پیاکرد و دەستی کرد بەگریان.

– چی ڕوویداوە شارا گیان، چی ڕوویداوە؟ دەریا چۆنە؟

– هیچ شتێک ڕووینەداوە، بەڵام تۆ بۆ وا درەنگ گەڕایتەوە، شتێک ڕوویداوە.

– ئۆی ببوورە دەبوایە تەلەفۆنم بۆ بکردیتایە. ببوورە، نەمزانی وا درەنگ دەگەڕێمەوە.

– گرنگ نییە گرنگ ئەوەیە بەسەلامەتی گەڕایتەوە. دەترسام کابراکەی مێردت شتێکی لێکردبێتی.

– نا خەمت نەبێ، وا زوو نامدۆزێتەوە. خۆت دەزانی ئەو لە شارێکی تر دەژی و تازەش لە زیندان دەرچووە، هەرچۆنێ بێ داوای لێبووردن دەکەم کە بیری ئەوەم نەبوو تەلەفۆنت بۆ بکەم.

– خواردن دەخۆی ؟ خواردنم ئامادە کردووە؟

– نا سوپاس نانم خواردووە.

– چییە شتێکی تازە ڕوویداوە؟

– لەگەڵ پیاوێکدا نانم خوارد!

– پیاوی چی شیرین ماڵت ئاوابێت. خۆ خەڵکی لای خۆمان نەبوو؟

– حەیفت نەکرد، ئەوەم بەس نەبوو پێیان کردم.

– بۆ لەگەڵ چەند پیاودا ژیاوی، دیارە زۆرت لەژێر سەردایە و کەمی دەردەخەی.

– نا بەخوا هەریەک پیاوم ناسیوە، بەڵام بۆ هەموو تەمەنم تۆبەی پێکردووم. لەگەڵ پیاوێکی سوێدیدا بووم.

– ئێ دەئاوها بڵێ کچی باش. ئەم پیاوە سوێدییەت چۆن دۆزییەوە؟

– دکتۆرە. بەڕێکەوت چاومان بەیەک کەوت و عاشقی یەک بووین.

– ئەوها زوو؟

– جاران بڕوام بە خۆشەویستی یەکەم سەرنج و نیگا نەبوو، ئەمگوت ئەو جۆرە خۆشەویستییە



تەنیا نووسەرەکان دەتوانن دروستی بکەن، دەبینی خۆم بەسەرم هات. ئەوەش هەر قەیناکە، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە کاتێ عاشقی یەکتر بووین کەسمان ئەوی ترمان نەدەناسی.

– جا توخوا عەقڵت هەیە، چۆن کاری وا دەکەیت. کێ دەڵێ پێت ڕانابوێرێ. ئەی نازانی زۆربەی پیاوی سوێدی لە ژێرەوە لە گەڵ ژنێکی تردا ڕادەبوێرن و ژن و منداڵیشیان هەیە.

– کچێ هەر پیاوی ئەوان وا نین، ئەوانەی خۆشمان وان، خۆ بەدزییەوە بیکەن قەیناکە، نەک ژنەکان بهێننەوە ماڵەوە و لەسەر جێگەکەی تۆ لەگەڵی بنوون.

– دەوسبە مەعقولە شتی وا هەبێ. بڕوا ناکەم شتی وا ڕوویدابێت.

– بەداخەوە.

– باشە با واز لە پیاوی لای خۆمان بێنین. باسی ئەم سوێدییەم بۆ بکە کە عاشقی تۆ بووە.

– کارێکی سەیرە، هەرگیز هەستم بە شتێکی وا نەکردووە. هەر کە دەیبینم یان نزیکی ژوورەکەی دەبمەوە هەموو گیانم دەلەرزێ و دڵم دەکەوێتە لێدان، وا هەست دەکەم هەموو ئەوانەی بەلامدا تێدەپەڕن گوێیان لە ترپەی دڵمە. زۆریش بیرم لێکردووەتەوە، نابینی ئەم ماوەیە چەند ماندووم. شەوانیش خەوم لێناکەوێ. زۆرجاریش بیرم لەوە کردووەتەوە کە خۆم لەم ئەڤینە بدزمەوە. دەبێ واز لە کارەکەم بهێنم و بە دوای کارێکی تردا بگەڕێم. نە کار دۆزینەوە ئاسانە نە وازهێنان لەو. خۆشم نازانم چی بکەم، بەڵام بەجۆرێکی وا خۆشم دەوێت کە زەحمەتە بەبێ ئەو ژیانم مانای هەبێ. قەد کەسێکت خۆشویستووە؟

– بۆ فریای خۆشەویستی کەوتم. لەو کاتەی سنوورەکان دیاریکران مانای ژیانیشم لە دەست دا، من لە خودی خۆشم بێزاربووم. ژیان لای من مانای نەما، بۆیە بەلامەوە گرنگ نەبوو بمکوژن یان خۆم بکوژم، تەنیا ئەوەی ئەم بیرۆکەیەی لە مێشکم دەرکرد دەریا بوو. تۆ قەت بیرت لە خۆکوشتن کردووەتەوە؟

– جارێک بیرم لەوە کردەوە کە خۆم بکوژم بەڵام باوکم... ئا ئیتر خۆم نەکوشت، بۆچوونم بۆ ژیان گۆڕا، وا بیرم دەکردەوە... لەگەڵ ئەوەی زۆر ئازاردیدەم، هەردەم وا هەستم دەکرد کە ڕۆژێ دەبێ ڕزگارم بێت و سەر لەنوێ ژیانێکی تر دەستپێبکەم.

– دەی خۆت مەدزەوە لەوەی باسی ئەم خۆشەویستییە تازەیەم بۆ بکەی.

– دەبێ بیری لێبکەومەوە، نازانم داهاتووی چۆن دەبێ، ئەوەش گرانە. لەوێ دانیشتبووین، ژنەکەی تەلەفۆنی بۆ کرد. وا هەست دەکەم ئەویش منی زۆر خۆشدەوێت.

– کێ دەڵێت گاڵتەت پێناکات.

– نا لەو باوەڕەدانیم، بڕوا بە قسەکانی دەکەم، هەرچەندە فریا نەکەوتین باسی زۆر شت بکەین. تەنیا دەمانویست دڵنیابین لەوەی کە ئەمە ئێمەین بەرامبەر یەک دانیشتووین.

– شیرین تۆ لە من گەورەتری و لە من زیاتر دنیات بینیوە بەڵام وا باشترە زیاتر بیر لەم مەسەلەیە بکەیتەوە.

– نازانم، سەرم لێشێواوە. نەشمزانی بۆ سبەی پێویستمان بەچی دەبێت تا بیکڕم. شیر بۆ دەریا ماوە؟

– تەنیا بەشی بەیانییەکەی ماوە.

– ئێستا درەنگە. سبەی پێش ئەوەی بچم بۆ کار دەچم لەو بەنزیخانەیەی نزیکمانەوە بۆت دەکڕم.

– لەوێ شت گرانە.

– دەزانم. با ئەمجارە وابێت. سبەی کە لە کار هاتمەوە چەند کارتۆنێکی گەورەت بۆ دەکڕم. باشترە هەندێ "دایبی"شت بۆ بکڕم، ئێستا با هەستین بیکەین بەخەو.

– جا خەومان لێدەکەوێت.

– هەوڵێک دەدەین.

شارا ڕاست دەکات کەسیان خەویان لێنەدەکەوت. شارا خەمی شیرینی بوو، گەر ئەم پیاوە درۆی لەگەڵ بکات، تەواو تێکدەچێ و گەر ڕاستیش بکات ئەوا لە کیسی ئەم دەچێت. هەرچەندە تا سەریش ناتوانێ لەگەڵ ئەمدا بمێنێتەوە. شارا تا دەهات باری دەروونیی خراپتر دەبوو. بیری لە داهاتووی خۆی و کچەکەی دەکردەوە، تاکەی خۆیان بشارنەوە، خۆ گەر وەک شیرینیش خۆی بشارێتەوە و بچێتە شارێکی تر هەر زەحمەت دەبێت، چونکە بەبێ بینینی دایکی و برا بچووکەکەی ئیدارە ناکات، گەڕانەوەش بۆ ژیانی پێشتری کارێکی دژوارترە. هەموو شەوێک بیری دەکردەوە چی لەم ژیانەی خۆی بکات، هەموو دەرگاکانی لەسەر داخرابوون. بڵێی گەر بڕواتەوە لێی ببوورن و وازی لێبێنن بەئاسایی بژی. لەو باوەڕەدا نەبوو کە کارێکی وا بکەن، بەر لەم یاخیبوونەی هەڕەشەی کووشتنیان لێدەکرد، ئینجا ئێستا پاش ئەم هەموو بەزم و ڕەزمە لەوانەیە بیسوتێنن. ئەی دەریا تاکەی بەم جۆرە بژی، ئێستا منداڵە ماوەیەکی تر دەبێ بچێتە باخچەی ساوایان، ئەمیش خۆ تا سەر ناتوانێ لەسەر کۆمەک و یارمەتی سۆشیال بژیت.



لەولاشەوە شیرین هەر ئەمدیوو ئەو دیوی دەکرد، ئەویش بە درۆوە چاوەکانی نوقاندبوو. دیارە دەیویست بەتەنیا بیر لە وەزعی خۆی بکاتەوە. شارا ڕاست دەکات کێ دەڵێت هانسیش درۆی لەگەڵ ناکات، یان گەر درۆیشی لەگەڵ نەکرد ئەی چی لەخێزانەکەی دەکات، جیابێتەوە، ئەمەش زەحمەتە چونکە دەبێتە هۆی تێکدانی خێزانێک، ئەمە جگە لەوەی منداڵیشیان هەیە.

شیرین بیری لەوە دەکردەوە چۆن بە زووترین کات کۆتایی بەم پەیوەندییە بهێنێ. بەڵام چۆن، لەکاتێکدا ڕووبەڕوو دانی بەوەدا نا کە ئەمیش ئەوی خۆشدەوێت، گەر بە ئاشکراش ئەمەی نەگوتبا خۆ لە ئامێزگرتن و ماچەکانی ئەمەی بۆ دەرخست. هانس زۆر بە دڵنیایی باسی خۆشەویستی خۆی بۆ کرد. ئەی باشە چۆن، ئەی ژنەکەی. چۆن کەسێکی ژندار یان بەمێرد دەتوانن کەسێکی تریان خۆشبوێ، دیارە ئەمەش هەر لەڕۆمانەکاندا هەیە. دایکم باوکمی بەدڵ و گیان خۆشدەویست، کە مردیش هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە شوو بکات، یان لەگەڵ پیاوێکی تردا بژی. شیرین پێویستی بە باوکی هەیە.

لەوەتی شارا لای دەژی باوکی دەرنەکەوتووە، ئەمیش بیری دەکات، مەگەر لەگەڵ باوکی بتوانێ باسی هەموو شتێ بکات، ئەی باشە جاری پێشوو کە باوکی بینی، بە خۆشەویستییەکەی ئەمی زانیبوو، بەڵام پێی نەگوت ئەمە کارێکی نەشیاوە، پیاوێکی ژنداری خۆشبوێت. دیارە باوکیشی وەک هەموو پیاوەکانی تر بیر دەکاتەوە، ئەو مافە بە پیاو دەدات ژنێکی فەرمیی، لەلاشەوە، خۆشەویستێکی قاچاخی هەبێت.

# 9

بەیانی زوو جلەکانم لەبەرکرد تا فریا بکەوم شیر و هەندێ خواردن بۆ شارا و دەریا بکڕم. تاقە شوێنێک کە بەو بەیانییە کرابێتەوە دوکانی بەنزینخانەکەی نزیکمان بوو. ئەو شەوە زۆر درەنگ خەوم لێکەوتبوو، هەستم بە ماندوو بوون دەکرد.

هەر کە دەرگای دەرەوەم کردەوە چاوم بە باوکم کەوت خەریکبوو لە خۆشیا باڵ بگرم. باوەشم پیاکرد.

- بابە گیان! دەمێکە دەرناکەوێ، بۆ؟
- کچم تۆ گەورە بووی تازە منت بۆ چییە، بەڵام بەم بەیانی زووە بۆ کوێ دەچی؟
- دەچم بۆ ئەم بەنزینخانەیە، شیر بۆ کچەکەی شارا دەکڕم.
- شوێنی وا باش نییە بۆ تۆ. هەرگیز مەچۆ بەنزینخانە. لەوێ هەموو جۆرە ئۆتۆمبیلێکی لێ دەوەستێ. ترسی ئەوەت نییە تووشی مێردەکەت بیت؟
- نا بابە گیان مەمترسێنە، تازە خەریکە دێمەوە سەرخۆ.
- کچم دەبێت ئاگات لە خۆت بێت، ئەو پیاوە وا بە ئاسانی وازت لێناهێنێ، تا ئەو ڕۆژەی دەمرێ بیر لە تۆڵە دەکاتەوە.
- بۆ کاممان مافی تۆڵە سەندنەوەمان هەیە بابە گیان؟



- ئەو پێی وایە تۆ کڵاوت کردووەتە سەری.

لەناکاوا هۆڕنی ئۆتۆمبیلێک بەخەبەری هێنام و هەر هێندەی نەمابوو بمکات بەژێرەوە. لەم کەین و بەینەدا باوکیشم ون بوو. دەڕۆیشتم و بیرم لەوە دەکردەوە گەر پێشبینییەکەی باوکم ڕاست بێت، چبکەم.

هەرچۆنێ بێ خۆم گەیاندە بەنزینخانەکە، هەر کە لە دەرگای دوکانی بەنزینخانەکە نزیک کەوتمەوە ئۆتۆمبیلێک لامەوە وەستا.

- ئەوە تۆی هەی قەحبە ؟ پێم نەوتی لە کونی ماریشدا بی دەتدۆزمەوە.

منیش خۆم تێنەگەیاند، هەروەک ئەوەی لەگەڵ منی نەبێت، تەماشای شتێکی ترم دەکرد. هەرچۆنێ بێ خۆم کرد بە ژووردا. دەمزانی لە دوکانەکەدا ناتوانی هیچم لێبکات. ماوەیەک لەناو ڕەفەکاندا خۆمم ون کرد، بەڵام کە سەیرم دەکرد ئەو هەر لە دەرەوەیە، خێرا بەیەکێ لە ئیشکەرەکانی ئەوێم وت "تکایە یارمەتیم بدە، تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکەم". کابرا لێم تێنەگەیشت " وتی: ئەوە لە دەرەوە تەلەفۆنی ئۆتۆمات هەیە.

"ناتوانم بچمە دەرەوە تکایە پێویستم بە یارمەتی هەیە. کەسێک لە دەرەوە وەستاوە، هەوڵی کوشتنم دەدات".

هەر کە ئەمەم وت بردمیە ژووری ئیشکەرەکانەوە و تەلەفۆنەکەی بۆ هێنام، خێرا تەلەفۆنم بۆ ماڵی ژنان کرد و پێم ڕاگەیاندن کە کابرای مێردم لە دەرەوەی بەنزینخانەکە وەستاوە. داوایان لێکردم چاوەڕوانی ئەوان بکەم و نەچمە دەرەوە.

لە ژوورەوە دانیشتم بیرم لەوە دەکردەوە چۆن منی ناسییەوە، خۆ ڕەنگی قژو چاوم گۆڕیوە. ڕەنگە بەڕۆیشتن و باڵامدا ناسیبێتمی. بەڵام باشبوو من خۆمم لێ گێلکردو ڕۆیشتم. خۆشم سەرم لەخۆم سوڕما چۆن تێکنەچووم. هەرچەندە پێشتر لە فەنتازیاکانی خۆمدا پرۆڤەخەیاڵی ئەم جۆرە ڕووداوو ڕێککەوتانەم کردبوو.

هێندەی نەبرد ئیلێنا گەیشت، لەهەمان کاتدا ئۆتۆمبیلێکی پۆلیسیش گەیشت. ئیلێنا لە دەرگای پشتەوە منی گەیاندە ناو ئۆتۆمبیلەکەی خۆی، پاش ئەوەی زانیمان کە ئەو دوامان نەکەتووە بردمیەوە ماڵێ.

کە شارا ئێمەی بینی شپرزە بوو.

– چیبووە ؟ شتێک قەوماوە؟

– نا مەترسە، کەربابەکەی مێردمم تووشبوو.

– ئەی چیبوو تۆی ناسییەوە؟

– بەتەواوەتی نا، لەو باوەڕەدام تەنیا شکی کرد. بەڵام خۆم تێنەگەیاند کە لە بانگکردنەکەی تێدەگەم یان دەیناسم.

– ئەی چۆن توانیت، چۆن زراوت نەچوو، خۆ من بومایە لەشوێنی خۆمدا وشک دەبووم.

– ماوەیەکی زۆرە خۆم بۆ شتێکی وا ئامادەکردووە، بەڕێککەوتیش کە دەڕۆیشتم بۆ ئەوێ بیرم لە شتێکی لەو بابەتە دەکردەوە.

– دیارە فریشتە دەستی بە باڵتەوە گرتووە. بزانە چیمان بەسەر هاتووە. بەختی من، بۆ ئەوەی دڵم لە خۆم دانەمێنی کە هەر تەنیا من وام لێنەهات و دۆزرامەوە. باشە بە جووتە لە ماڵەوە دادەنیشین شتمان زۆرە باسی بکەین. خەمی ئیشەکەمم نەبوو، بەڵکو خەمی هانسم بوو، ئەو بەتەما بوو ئەمڕۆ یەکتر ببینین و زیاتر قسەبکەین، خوا دەزانێ ئەم نەچوونەی من چۆن لێکدەداتەوە، ژمارەی تەلەفۆنەکەشم پێی نەدا، جا هانس چۆن دەمدۆزێتەوە. منیش بەنیاز نیم تەلەفۆن بۆ نەخۆشخانە بکەم.

ژیان بۆ من بووەتە سەحرایەک لە خەڵووز، ئێستا ڕۆژە، تیشکی هەتاو پانتایی زەوی و ئاسمانی تەنیوە. لە شەقامەکانی شاردا هەزاران کەس دێن و دەچن و لەو باوەڕەدانین کەسانێکی وەک من و شارا هەن کە مافی چوونە دەرەوەمان نییە، نەک هەر هێندە، بەڵکو مافی ژیانێکی ئاساییشمان نییە. ئەوەی لەسکی دایکماندا وەک کچ دروست کراوین بۆتە سەرچاوەی بەدبەختییەکانمان. ئەگەر بمزانیبا دەکەومە ئەم دۆزەخەوە، براکانیشم لەبرسانا بمردنایە ئەم شووەم نەدەکرد، باشە ئەوە من نەزان بووم ئەم کابرایەم نەدەناسی، ئەی ئەوانی تر بۆ وایان بەسەرهاتووە. ئەی خۆ لە سەنتەری ژنان ژنە سوێدیشی لێبوو، جیاوازییەکەمان تەنیا هەر ئەوەبوو ئەوان زۆر چاوەڕوان ناکەن و جیادەبنەوە، هەر زوو پەتەکە دەپچڕن.

– شارا تۆ بۆ ئەوەندە چاوەڕوانت کرد تا لە مێردەکەت هەڵاتی؟

– بڵێم چی چاوەڕوانی ئەوە بووم گۆڕانکارییەک ڕوویدات و ژیانم بەرەو باشی بڕوات، لەلایەکی ترەوە باوکم هەڕەشەی لێکردبووم هەرچ کارێک بکەم بەدڵی ئەو نەبێ، دایکم دەکوژێ. ژیانی من





زۆر ئاڵوز بوو، جگە لە هەڵاتن و خەبەردانی پۆلیس ڕێگەیەکی ترم لەبەردەمدا نەمابوویەوە. ئێستاش لەهەموو کەس و کار دابڕاوم، بۆ توانای برام وەختە دڵم بێتە دەرەوە، هیچیشم پێناکرێ. ئێستاش دەبینی بە خۆم و منداڵێکەوە هەڕەشەی مردنم کەوتۆتە پێش، بۆ کوێ بڕۆم، دەبێ داهاتووم چی بێ، بۆ تۆ وا دەزانی ژیانی من هێندە ئاسانە. تەماشاکە تەنیا بیرکردنەوەم لە داهاتووی منداڵەکەم بەسە بۆ ئەوەی مێشکم تێکچێ. هیچ نەبێ تۆ منداڵت نییە. ئێستا دەزانم ئەوانەی هەموو زوڵمێکی پیاوەکانیان قەبووڵدەکەن ژیانیان لە ئێمە ئاسانترە. بزانە پۆلیس چی بۆ ئێمە دەکات، من و تۆ پێبزانین یا نەزانین زیندانی کراوین، بۆ ئێمە چیمان لەوانەی زیندانی کراون زیاترە. ئەوان لە ژوورێکان و خواردن دەخۆن و سەیری تەلەڤزیۆن دەکەن و دەخەون. هەرهیچ نەبێ ئەوان ناترسن، ئێمە هەردەم پیاوەکانمان وەک مۆتەکە بە دوامانەوەن، فەرموو تۆ ناوی خۆتت گۆڕیوە، ڕەنگی قژو و چاوت گۆڕیوە کەچی دەبینی هەر بە دواتەوەیە و تووشی دەبی، چۆن لەوێوە گەیشتە ئێرە، یان کەس وکاری من چۆن زانییان لە سەنتەری ژنانی ئەو شارە خۆم شاردووەتەوە.

– ڕاست دەکەی شارا. نازانم چی بڵێم، کە لەوێ بووم گەلێک جار دەمویست خۆم بکوژم، بەڵام کە بیرم لە دایک و براکانم دەکردەوە پەشیمان دەبوومەوە.

– منیش هەروا پاش ماوەیەک کە زانیم دووگیانم، بیرکردنەوە لە کۆرپەیەکی ناو منداڵدانت زۆر نەخشەت پێدەگۆڕێ. کە دەریاش لەدایکبوو بە تەواوی وازم لەو بیرە هێنا، هەرچەندە ئەوە ماوەیەکی زۆرە بە جیدی بیر لە شتێکی وا دەکەمەوە.

– وا بیر مەکەرەوە. ئێستا چایەکی خۆشت بۆ لێدەنێم و هەندێ پیسکیتیشمان هەیە، پاشان دەتوانین کێکێکیش دروست بکەین.

– دە وەرە دانیشە، تۆش تۆزێ بیر لە خۆت بکەرەوە، دەتەوێ وای نیشان بدەی کە خەمت نییە، دەزانم جگە لە خەمی خۆت خەمی ئێمەش دەخۆیت. ماوەیەکە وازت لە هەموو شت هێناوە. باشە وەک ڕێککەوتین دەبێ دەست بە خوێندن بکەیتەوە، ئەی خۆ بڕیارت دا بخوێنی کەچی وازت هێنا، لە کوێ مامۆستای وەک منت دەست دەکەوێ، لەم زیندانەدا دەرست پێ بڵێت.

– ڕاست دەکەی وایە. نەمدەزانی سوێدییەکەت وا باشە.

– هەرچۆنێ بوو هەوڵم دەدا بخوێنمەوە و زۆربەی کاتیش سەیری تەلەڤزوێنم دەکرد.

– ئەمڕۆ کە ئیلێنا هات داوای لێدەکەین چەند کتێبێکی ترمان بۆ بێنێ.

شارا چوو تۆزێ پشوو بدات و دەریاش خەبەری بووەوە، منیش چاکەم برد بۆی، دەریام لێوەرگرت و هێنامە هۆڵەکەو بەباوەشمەوە دەمگێڕا و بیرشم لای هانس بوو.

ئەو چەند ڕۆژەی کە لە کار دابڕام و هیچ هەواڵێکم نەدەزانی، حەزم لە کتێب خوێندنەوە دەکرد تا بەناوی کتێب خوێندنەوەوە ئازادانە بیر لەو بکەمەوە. دەمزانی ئێستا سەری سوڕماوە، دەبێ چۆن بیربکاتەوە، دەشزانم ناتوانێ ناونیشانم پەیدا بکات. هەندێ جاریش دەمگوت ڕەنگە ڕێکەوتێکی باشبووبێ تا لێی داببڕێم و هەرلەسەرەتاوە کۆتایی بەهەموو شتێک بێت. لەم بیرکردنەوەیەدا بووم و بەرەو پەنجەرەی هۆڵەکە ڕۆیشتم کۆنترۆڵی ئەو دەور و بەرە بکەم، چیم بینی! بە شەقامەکەدا دێت و دەچێ. ئەو شەوە منی گەیاندەوە و لەوێندەر دایبەزاندم، بەڵام نازانێ لە کام ئاپارتماندا دەژیم. دیارە بە نیازە بەڕێکەوت مببینێ. نازانی لە ژوورەوە بەندم. ئەرێ بۆ نەچم و بیهێنمە سەرێ.

– بۆ ناچی؟ ئەی تۆ ناڵێی خۆشمدەوێ. بڕۆ بیهێنە ماڵەوە.

– دیسانەوە ئەوە تۆی قسە دەکەیت. دەمەوێت بە دایکت بڵێم کە ئەم دەریا بلیمەتەی تۆ قسە دەکات و لە هەموو شتێک دەگات. بەڵام ناوێرم چونکە لەوانەیە بروام پێنەکات. خۆ تۆ لە بەردەمیدا هیچ قسە ناکەیت.

– نا هیچ قسە ناکەم، بەڵام هەندێ جار کە خەو دەیباتەوە قسەی بە گوێدا دەچرپێنم. شتی فێردەکەم و هێمنی دەکەمەوە، ئەویش وادەزانێ خەو دەبینێ.

– نەتدەتوانی یارمەتی باوکت بدەی تۆزێ بگۆڕایە و وای لە دایکت نەکردایە.

– با هەوڵمدا، بەڵام باوکم خوێنی شەیتانی تێدا بوو، من نەمدەتوانی کاری لێبکەم. ئەوەی توانیم کردم و نەمهێشت دایکم بکوژێ. جارێ چەقۆکەم لەدەستی خستە خوارەوە. ئیتر پاش ئەوجارە ترس کەوتە دڵییەوە و چەقۆی لێهەڵنەگرت.

– دەبێ ڕۆحی چ مرۆڤێ لە جەستەتدا زیندوو بووبێتەوە؟

– من ڕۆحی کەسێکی بە ئەزموونم تیدایە. بۆیە هەر کە شتێک دەبینم یەکسەر دەتوانم هەڵوێست وەربگرم و چارەسەری خێرا بدۆزمەوە. ڕەنگە ئەم بارەی کە دایکمی تیایە وای کردبێ زووش بکەومە قسەکردن، یارمەتیدانی دایکم بەشێکی بیرکردنەوەی منە، لەوانەیە هەر ئەو



حەزەش بێت زمانمی کردبێتەوە.

– دەریا ڕەنگە لە تۆ باشترم دەستنەکەوێ سەبارەت بەم خۆشەویستییەم شتێک بڵێ.

– دیارە تۆش مافی ئەوەت هەیە کە کەسێکت خۆش بوێ. هەندێ جاریش هەستی خۆشەویستی وەک بورکانێک وایە، لەناکاوا دەتەقێتەوە، شوێن و کاتی تەقینەوەکەش تەنیا کەف و کوڵی دەروون دیاری دەکات. تۆ دەبوو کەسێکت خۆشبوویستایە هێزێکی خودایی پێببەخشیتایە. قەڵایەک بوایە، تۆی لە میحنەت و ئازار دوور خستایەتەوە. لێرەدا خۆت گرنگی، ئایا ئامادەی بۆ ئەو ئەڤینە قوربانی بدەی؟ لەو بڕوایەدایت کە ئەو پیاوە دەیەوێت لەگەڵ تۆدا ژیان بەسەرببەرێت و واز لە ژن و منداڵەکانی بێنێ.

– دەڵێ کە مەسەلەی ژن و منداڵەکانی کێشەی خۆیەتی و چارەسەری دەکات.

– لەوانەیە لەبەرئەوەی پیاو بەشێوەیەکی گشتی...

– دەریا ئەو قسانەی کە تۆ دەیکەیت دەڵێی لە کتێبەوە وەرگیراون.

– تاقیکردنەوەکانی ژیان سەرچاوەی ئاماژە پێنەدراوی هەموو کتێبەکانە.

– باشە هەرکەس لە ئێمە ڕۆحی کەسێکی تێدا زیندوو دەبێتەوە؟

– لەو باوەڕەدام. ئیتر لەسەر کەسەکان وەستاوە.

– من هەرگیز هەستم بەوە نەکردووە ئەو کەسەی کە ڕۆحی لە مندا زیندووبووەتەوە ڕۆڵی لە ژیانمدا هەبووبێ.

– ئەی ئەوە نییە کاتێ کابرای مێردت لە بەردەم بەنزینخانەکەدا بینی خێرا و بێ بیرکردنەوە هەڵوێستت وەرگرت. گەر ئەوە نەبوایە ڕەنگە ڕات بکردایە یان لات بکردایەتەوە، یان وەڵامت بدایەتەوە.

– ڕاست دەکەیت. بەڵام من زۆر جار بیرم کردۆتەوە کاتێک ئەو ببینم چیبکەم.

– بەڵام تۆ بۆ کارێکی وا لەو ساتەدا ئامادە نەبووی. بێدەنگ بە وا دایکم خەبەری بووەوە.

شارا هاتە ژوورەوە.

– ئەوە چییە لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت ؟

– نا لەگەڵ کچەکەی تۆدا قسە دەکەم، مرۆڤ کە سەیری چاوەکانی دەکات گومانی ئەوەی لا دروست دەبێ کە ئەم منداڵە تێدەگات.

– ڕاست دەکەیت وایە، منیش واهەست دەکەم لە هەموو شت تێدەگات، دەڵێن منداڵ زۆر بەهەستە، لە شتەکانی دەوروبەری دەگات. دەزانی جارێکیان خەریک بوو خۆم بکوژم، کەسەیریم کرد لە چاوەکانیدا ئەوەم خوێندەوە کە دەڵێت نا دایە گیان خۆت مەکوژە.

شارا بەرەو دەریا چوو لە باوەشی گرت و چەند جارێک ماچی کرد. ئەویش لە پشتی سەری دایکییەوە چاوێکی لە من داگرت.

چوومە موتبەخەکە و بەجێم هێشتن و بیرم لە قسەکانی دەریا دەکردەوە. دەبێ واز لەو عەشقەم بێنم. هەر مایەی سەربەشەیە، بەتایبەتی خاوەن ژن و منداڵە. ئەو بەهیچ جۆرێ نیازی نییە واز لەو هەستەی خۆی بێنێ. چەند جارێ دووپاتی کردەوە کە بە هیچ جۆرێ نایەوێ کۆتایی بەم پەیوەندییەی بێنێ. من فێربووم چۆن حەزەکانی خۆم لە پێناوی کەسانی تردا زیندەبەچاڵ بکەم. ئەی بەرژەوەندی دایک و براکانم نەبوو منی گەیاندە ئەم ژیانەی ئێستام. دایکم وایدەزانی تا من خوێندنەکەم تەواو دەکەم ئەوان لە برسا دەمرن. ئێستاش بۆ منداڵەکانی هانس وا باشترە واز لەم خۆشەویستییەم بهێنم. لەسەر ئەویش وەستاوە خۆ گەر نەیەوێ کۆتایی بەم پەیوەندییە بهێنێ و ئامادەبێ بۆ قوربانیدان، ئەوا منیش بێگومان حەزدەکەم لەگەڵ کەسێکدا بژیم کە خۆشم بوێ، من هەموو تەمەنم خەوم بەوەوە دەبینی کە شوو بە کەسێک بکەم خۆشمبوێ. لە وڵات بڕیارم دا شوو بەم کابرایە بکەم، بەبێ ئەوەی خۆشمبوێ، هیوام وابوو کە پاش شووکردن ئەو هەستە لە نێوانماندا دروست ببێ، بڕیارم دابوو کە بەئەمەک بم لەگەڵی و تامردنیش ژیانی لەگەڵ ببەمەسەر، بەتایبەتی ئەو لەوێ بەرامبەر دایک و براکانم ماریفەتێکی زۆری نواند، کە هەمووشی درۆ دەرچوون.

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم زەنگی تەلەفۆن لێیدا، دڵم کەوتە لێدان، شارا هاواری کرد بە سەرمدا کە هەڵیبگرم، هەرچەندم کرد نەموێرا، پاشان خێرا بڕیارمدا و وەڵامم دایەوە، ئیلێنا بوو، ئەو پێی ڕاگەیاندم کە پۆلیس ئاگاداریان کردۆتەوە مێردە تەرسەکەم گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خۆی، گوایە لە سبەینێوە دەتوانم دەست بەکاربکەم. ئەمەم زۆر پێخۆشبوو لەلایەکەوە سبەی هانس دەبینم و لەلایەکی ترەوە دەبوو ئەو مانگە هەندێ پارەی ترم بۆ دایک و براکانم ڕەوانە بکردایە. لەهەمان کاتدا ڕێزان قسەی لەگەڵ کردم کە دەیەوێ بێت سەرێکمان لێبدات.

هەر کە گەیشتن داوام لە ئیلێنا کرد یارمەتیم بدات بە ئۆتۆمبێلەکەی بچین بازارێک بکەین. ئەویش لەبری ئەو ماوەیەی شارا و دەریام لابووە بڕێک پارەی پێدام. نانمان ئامادەکرد و



منداڵەکانمان تێرکرد، ئەوجا کەوتینە چەنەبازیی، بە منداڵەکانی ڕێزانمان وت بچنە ژوورەکەی تر و ئاگایان لە دەریا بێت.

– تەلەفۆنم بۆ ماڵەوە کرد و ئاگادارم کردنەوە کە نیازی سەردانم هەیە، دایکم پێی خۆشبوو، بەڵام باوکم تا ئێستا تووڕەیە لێم، کە وازم لەو ملئەستورە هێناوە.

– بۆ تووڕەیە لێت. بۆ بەلایەوە ئاسایییە کە ئەو هەموو بەزمەت پێبکات، بۆت باس نەکرد کە چەند جارێک لە ئەنجامی لێدانی ئەو کەوتوویتەتە نەخۆشخانە.

– باوکم دەڵێت ژن و پیاو هەر شەڕیان دەبێت و دەمیان دەگیرێتە یەک، دەزانی لە تەلەفۆندا چی دەوت. دەیوت جا با لێتبدات خۆ ئەوە مێردتە پیاوێکی غەریبە نییە. منیش پێمگوت بابەگیان ئەگەر دایکم ئەو هەموو ساڵە تەحەمولی شەقی تۆی کردووە ئەوا من ئامادەنیم لەوە زیاتر تەحەمولی ئەو بکەم. من لەوڵاتێکدا دەژیم ئەو زوڵمە بەرامبەر بە ژن قەبوڵناکرێ، جا کە پێمگوت پیاو لە ژن بدات دەخرێتە زیندانەوە، هەر زۆری بەلاوە سەیر بوو وتی ئەمە بۆیە هەر ژنێک دەچێتە ئەوروپا هێندە نابات جیادەبێتەوە.

– ئێدەوایە خۆ ئەگەر لای ئێمەش یاسایەکی وا دەبوو ئەوا پیاوەکانمان نان و شەقیان نەدەدا بە ژنەکانیان. ژنیش ئەو زوڵمەی قەبوڵ نەدەکرد.

– خۆ دایکی من چەند ساڵێکە لە سوێد دەژی کەچی تا ئێستاش کە باوکم مۆڕەیەکی لێبکات لەرزی لێدێت، ناوێرێ بڵێ لەل. هەموو زوڵمێکی باوکمی قەبووڵ کردبوو لەو باوەڕەشدا بوو کە دەبێ وابێت. لەبەرئەوە هەردەم بەگوێی مندا دەیخوێند کە زوڵمەکانی باوکم قەبووڵبکەم. لە سەرەتاوە هەوڵمدا تۆزێ کاری لێبکەم تا کەمێک یارمەتیم بدات، بەڵام ئەو ترسەی باوکم لە دڵیدا کەم نەدەبووەوە، هەردەم لە من دەپاڕایەوە تا لە قسەکانی باوکم دەرنەچم، ئێستاش حاشای لێ کردووم و لە ترسی باوکم ناوێرێ قسەم لەگەڵ بکات، خۆ هەموو کات باوکم لە ماڵ نییە، دووجار تەلەفۆنم بۆکرد، کەچی نەیدەوێرا قسەبکات، پاش ئەو جارە هەوڵم نەدا تەلەفۆنی بۆ بکەم. ئێستاش وا هەستدەکەم من بەخۆم و منداڵێکەوە لە کونی دارێکەوە هاتووینەتە دنیاوە. ئێوە هەرچۆنێ بێت لە من باشترن.

– دڵت لەخۆت دانەمێنێ کەسمان لە کەسمان باشتر نیین ئەوە نییە منیش بە خۆم و دوو منداڵەوە دەگەڕێمەوە ماڵی باوکم، ناشزانم هەڵوێستی ئەوان و خەڵکەکە چۆن دەبێت.

– خۆ خەڵک بەم بەزمەی نەزانیوە، تۆش هەر باسی مەکە.

– هەی بێقەزا بیت بۆ بەزمی ئەم تەلەفۆن و تەلەفۆنکارییە، ئێرە و ئەوێی هێشتوەتەوە، خۆ من لە سەرەتاوە ئەمەم بۆ دایکم باسنەکرد، کەچی ئەو لە منی پرسی. جا خۆزگە شتەکان وەک خۆی دەگەیەندران، هەزارو یەک درۆی پێوە دەکەن. دایکم هەر باشترە، بەڵام باوکم خەمی ئەوەیەتی من بە دوو منداڵەوە بچمەوە سەریان و حەیایان بچێت. منیش پلانی خۆمم هەیە.

– پلانی چی؟ بۆ هیچی ترت پێیە و نەمانزانیبێت

– دەچمەوەو بەدڵی خۆم پیاوێکی باش دەدۆزمەوە و لەگەڵ خۆم دەیهێنم بۆ ئێرە، تازە من پاسپۆرتی خۆمم وەرگرتووە. جاران هەڕەشەی ئەوەی لێدەکردم کە نایەڵێ ئیقامەکەم درێژبکرێتەوە. بەڵام ئێستا ناتوانێ هیچ بکات.

– کچی باش هەڵە بەهەڵە چارەسەرناکرێ، بیریشت نەچێ تۆ دوو منداڵت هەیە، کێ دەڵێت پیاوێکی باشت دەست دەکەوێت. لەوانەیە ئەویش وەک تۆ بیەوێ تەنیا بگاتە ئەورووپا.

– ئێ کچێ ژیان وایە، کەسێک ئەورووپای بووێت دەبێ دوو منداڵەکەشم قەبوڵبکات. شۆخی دەکەم ئەگەر پیاوێکی باشم دەستبکەوێت، لە سەرەتادا جڵەوی کارەکە لە دەستی خۆمدا دەبێت و نایەڵم وەک ئەمیتر خوێڕی بێت.

– ئاخر تۆ پیاوێکت بۆ چییە تۆی بە ئەورووپاوە بووێت. خۆ ڕەنگە ئیقامەکەی وەرگرێ وازت لێبێنێ. یان ئەویش پەنێکت پیابدات.

– ئەی لەوانە، ئەوە چیتانە خەریکن دەمخۆن. وەی وەی ئەمە بۆ واتان لێهاتووە خۆ دەمتان دەڵێی مەقەستە. بابە گوومخوارد و هەرگیز شوو بەپیاو ناکەم.

– ئەی خۆ بەمنیشی ناکەی.

– بۆچی نا لەوانەیە باشتر بێت. ئەرێ بۆچی عەمەلیاتێک ناکەیت و خۆت بکەی بە پیاو. ئەوە ئێمە منداڵمان هەیە و خۆ تۆ جارێ منداڵت نەبووە، بەخوا ئەو کاتە هەردووکمان شووت پێدەکەین و لای خۆشمان شەرع ڕێگەت دەدات دوو بەدبەختی تری وەک ئێمەش بە کۆڵە ڕاگریت.

– سەرو دوو منداڵیش لە تۆ دروست دەکەین.

– جا منداڵەکانیشمان وەک باوکیان چاو سەوز و جوان دەردەچن.

– ماڵتان ئاوابێت بەسە بیبڕنەوە ئەم هەموو قسەیە چییە دەیکەن، تۆ ڕێزان ئەوەندە دەڵێیت



ڕێگات دەکەوێتە هەموو قسەیەک.

– خۆ پێت ناخۆش نییە، بەخوا گەر ڕازی بی من هەر لە ئێستاوە سەفەرەکەم هەڵدەوەشێنمەوە. جا لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە تۆش لێمان بدەیت و هەموو سەرە سەعاتێکیش دەستوورێکمان بۆ دەربکەیت.

– وەڵا تۆ زمانت ئەوەندە درێژ بێت، لەوانەیە پڕ شەقیشت بکەم.

– ئەی نەیخۆی تاڵە جا ئێمە بۆ شوو بە کۆسەیەکی بە زۆر بە پیاوکردوو دەکەین.

لەم قسەو باسانەدا بووین خەندەی کچی ڕێزان هاتە ژوورەوە و وتی ئەو منداڵە (دەستی بۆ شارا درێژکرد) دەڵێ دایکت کەرە کەر. ئەوانیش دەستیان کرد بەپێکەنین و شارا وتی :

– مەبەستت منداڵەکەی منە؟ خەندەش سەرێکی ڕاوەشاند و وتی ئا.

هەردووکیان بڕوایان بە قسەکەی نەکرد، منیش وتم بزانە گوێی زرنگاوەتەوە و خێرا چوومە ژوورەکەی تر بینیم دەریا چاوی زیتەی دەهات و کوڕەکەی ڕێزانیش خەوتبوو، ویستم قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام لەو کاتەدا ڕێزان و شارا هاتنە ژوورەوە، ئیتر منیش هیچم بۆ نەهات تەنیا ئەوەندەم وت :

– ڕێزان سەیرکە کوڕەکەت چەند جوان خەوتووە. بەڵام دەریا بەخەبەرە. ئێوە بڕۆن ئێستا ئەمیش دەخەوێنم.

– نا بڕۆ من دەیخەوێنم.

– تۆ بڕۆ شیرێکی بۆ بکە، من لە لای دەبم خۆ لای من باشتر دەخەوێ.

– تۆ ناترسی وا قسە لەگەڵ ئەو منداڵە دەکەیت.

– وامزانی لە قسەکانم تێناگات. دەبێ ئاگام لە خۆم بێت. نەمزانی یەکسەر قسەکەم هەڵدەگرێتەوە.

شارا بە خۆی و شووشەیەک شیرەوە هاتەوە، شیرەکەم لێوەرگرت و ناردمەوە لای ڕێزان، تا پێی بڵێت هەوڵدات کچە عەیارەکەی بخەوێنێ. تا بە ئیسراحەت دانیشین.

هەر کە شارا چووە دەرەوە دەریا دانیشت.

– بەو ژنە بڵێ هێندە بێعەقڵ نەبێ بچێتەوە وڵات، لەوێ چی دەکات. دەبێت چاوەڕوانی دەستی باوکی بێت، خۆ بە دوو منداڵەوە ناتوانێ کار بکات.

– نا نا هەر بەسەردان دەچێتەوە، پاشان دێتەوە. ئەویش ئەوە دەزانێ کە لەوێ ئیدارە ناکات. بەڵام ئەمانیش تا ئێستا شوێنێکیان بۆ نەدۆزیوەتەوە تا دوور لە مێردەکەی بگیرسێنەوە. چونکە گەر نزیک بێت نایەڵێ بە ئاسودەیی بژی. هەموو ڕۆژێ دێتەسەری.

– ئێدەوایە، ئەو ڕێزان بە موڵکی خۆی دەزانێت، تاگەیاندیە ئێرە پارەیەکی زۆری خەرجکرد، بۆیە تا لێیەوە نزیک بێت نایەڵێ ئاسودەبێت.

– ئەویش نیازیە بچێتە شارێکی تر، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە منداڵیان لە نێواندایە.

جارێکی تر شارا هاتە ژوورەوە و وتی: ئەوە چییە هێشتا نەخەوتووە، منیش وتم چیرۆکێکم بۆ گێڕایەوە. ئەویش وتی: بۆ دایکی لە چیرۆک حاڵی دەبێ تا ئەم مەیمونە تێبگات.

شارا زۆر درێژەی نەداپێی و چووە دەرەوە. دەریام لە سەر جێگەکەی پاڵخست و ماچێکم کرد و ئەویش ماچێکی منی کرد و پێکەنی و هاتمە دەرەوە.

هەتا من هاتمە هۆڵەکە خەندەش خەوی لێکەوت، ئەویشم لە دایکی وەرگرت و بردم لەو لای براکەیەوە پاڵمخست، تا ئەو کاتەش دەریا خەوی لێنەکەوتبوو، بە ئەسپایی پێم وت: کچە بخەوە ئەوە چییە ئەمشەو خەوت لێناکەوێ. ئەویش وتی حەزدەکەم بمبەیتە لای خۆتان گوێم لە قسەکانتان بێت، هیچ ناگریم. ئیتر منیش گرتمە باوەشەوە و بردمە هۆڵەکە.

– کچەکەت خەوی نایە بۆیە هێنامە ئێرە تا منداڵەکانی ڕێزان خەبەرنەکاتەوە. چووم چایەکی نەعنام بۆ لێنان، شاراشم فێری چا خواردنەوە کردبوو.

– چا مەکە، من شتێکی ترم پێیە. ڕێزان هەستاو شووشەیەک شەرابی هێنا.

– کچی باشی ئەمە لە کەیەوە فێری شتی وابووی.

– بۆ چییە خۆ حەرام نییە. ئاوی ترێیە.

– ئەو ترێیەی لە ڕەزەکەی باوکت چنراوە.

– لە ڕەزی هەرکێیەکەوە بێت گرنگ نییە، با تۆزێک سەرمان گەرم بکەین.

– جا بلێیت بووتلێک سەری سێ کەس گەرم بکات. لەولاوە شارا هەڵی دایە.

– دادە گیان دیارە زۆرت لێتاقیکردوەتەوە.

– نەخێر، وامەزانە لە بەر ئەوەی چەند ساڵێکە لێرە دەژیم هەر خەریکی خواردنەوە بووم، تەنیا یەک دوو جار لە جەژنی لەدایکبووندا کۆکتێلم خواردوەتەوە، ئەگینا من هەر خۆم حەزم لە



خواردنەوە نییە. وا مەزانە ژیانی من لەگەڵ کچانی هاوتەمەنی وڵاتانی لای خۆمان جیاوازی زۆری هەبوبێت، بگرە ژیانی ئەوان باشتربووە، هیچ نەبێت ئەوان هەموو وەک یەک دەژین. من لێرە هەردەم هەستم بەوە دەکرد کە زوڵمێکی گەورەم لێدەکرێ. ئەوان منیان هێنا بۆ ئێرە. تێکەڵ ئەو هەموو کچ و کوڕە گەنجانە بووم بێ ئەوەی مافی ئەوەم هەبێ وەک ئەوان بژیم. جارێکیان بەدایکمم گوت بۆ ئێمەتان هێناوەتە ئەم وڵاتە، خۆ هەر لە کاولەکەی خۆمان بوینایە باشتر بوو. باوکم دەیوت لەبەر ژیانی ئێوە هاتووین بۆ ئێرە، هەرگیز ڕاست ناکات، بۆ ڕەحەتی خۆیان هاتوون، ئەوە باوکم چەند ساڵە لەم وڵاتە دەژی لە ئیشی ڕەش زیاتر هیچی نەکردووەو هەر کۆمەک و سەدەقەی سۆشیال وەردەگرێ. هەر بەم پارەیەش لە وڵات دوو خانوو ڕیزە دوکانێکی کڕیوە. کەچی رازی نەدەبوو بە دڵی خۆمان جلێک لەبەربکەین یان ڕۆژێ لەڕۆژان بچینە شوێنێک. براکانم هەرچۆنێ بوو باشتربوون، باوکیشم لە ئەوان نەدەترسا ئاخر ئەوان پەردەی کچێنیان نییە تا لە حەیا چوون بترسێ.

– شارا گیان توخوا وسبە، برینم مەکولێنەوە و باسی پەردەی کچێنی مەکە.

– بۆ خوانەکەران بێ پەردە شووت کرد.

– بۆ گەر شتی وام بکردایە ئێستا لە ژێر خاکدا نەدەبووم، ئەوە چی دەڵێیت. کە شووم بەم کەربابەی مێردم کرد. هەر لە وڵات شەوی بووکێنیم بەسەربرد، بۆ بەیانییەکەی دەستەسڕی خوێناویم خستە بەردەم دایک و خوشکەکانی، نەوەک دوایی وەک ئەو ملئەستوورەی دراوسێمان بکات.

– ئەو چی کردبوو؟

– ژنی هێنا و بردیە ئەوروپا و ماوەیەک پێکەوە ژیان و پاشان نەگونجان و تەڵاقی داو ناردیەوە، بەو بیانووەی کە کچ نەبووە، باوک و برا و ئامۆزا خوێڕییەکانیشی بڕوایان بە کابرای ئەوروپانشین کرد و کچەکەیان کوشت تا عاری خێزانەکەیان بکڕنەوە. هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم ڕاستیکردبێت، چونکە ئەو کچە بەستەزمانە هێشتا شانزە ساڵیشی پڕ نەکردبووە و لە شوناسنامەدا گەورەیان کرد بۆ ئەوەی بتوانێ بیهێنێ بۆ ئێرە. دایک و باوکیشی ڕێگایان نەدەدا سەر لە دەرگاوە دەرهێنێت. هەر زووش لە قوتابخانە دەریانکرد. ئیتر ئەم کچە بەستەزمانە لەگەڵ کێدا بووبێ تا پەردەی کچێتی لەدەست دابێت.

– دەزانی کە بیردەکەمەوە لە ژیان بێزار دەبم، چونکە زوڵمێکی زۆر دەرهەق بەژن دەکرێ و

هەست ناکەم هیچ گۆڕانکارییەکیش لە ژیانماندا ڕوویدات. تەماشاکە زۆڵمی پیاو ئێمەی گەیاندوەتە کوێ.

– ئاخر ئەوەشت لەیاد نەچێ ئێمە ئەو زوڵمەمان قەبووڵ نەکردووە بۆیە وامان لێهاتووە، خۆ ئەگەر وەکو ئەوانی تر بێدەنگ بووینایە ئەوا ئێمەش لەژێر سایەی مێردەکانماندا دەژیاین. لە هەمان کاتدا کەرێتی خۆشمانی تێدایە.

– ئاخر ئەو زوڵمانەی لێمان کراون ئەوەندە بێشومار بوون، ئیتر لەوە زیاتر تەحەممولمان نەماوە.

شارا قسەکەی پێبڕیم و ویستی شتێک بڵێت، ڕێزان نۆرەبڕی کرد.

– شارا گیان قوربانت بم بێدەنگ بە با شیرین قسەیەک بکات، من و تۆ باسی مێردەکانی خۆمان کرد، بەڵام ئەو تا ئێستا شتێکی نەدرکاندووە. دەی توخوا شیرین گیان باسی زۆڵمێکی مێردەکەی خۆتمان بۆ بکە.

– ئەوەندە زۆرە کە باسناکرێ.

– یەک شت، تاقە یەک شت.

– پیاوی بۆ ئەهێنامەوە، برادەرەکانی خۆی.

ئەمەم وت و دامە پرمەی گریان وەک بورکان تەقیمەوە لە هەنیسک دان نەدەوەستامەوە. ئەوانیشم خستە گریان شارا باوەشی پێدا کردم و ڕێزانیش وەک ئەوەی پەشیمان بووبێتەوە کە ناچاری کردم ئەمە بگێڕمەوە وتی:

– شیرین گیان مەگری هەموومان زوڵمی زۆرمان لێکراوە، هەر یەکە بەجۆرێک. هەرگیز بیرمان ناچێتەوە، گرنگ ئەوەیە ئێمە ئەو زوڵمەمان قەبووڵ نەکرد و بۆ ئەوانیش ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو کە ژنەکانیان وازیان لێهێناون، وا هەست دەکەن پیاوەتی خۆیان لە دەست داوە نەک هەر هێندە لە پۆلیس شکاتمان لێکردوون و لە دادگاش ڕووبەڕوویان بوینەتەوە. ملپانەکەی من سێ مانگیشی لە زینداندا بەسەربرد.

– بۆ من گرنگ نییە چەند لە زینداندا دەبەنە سەر. ئەوان بەو کردەوانەیان مانای ژیان لە ئێمە زەوت دەکەن، ئێمەش پێویستمان بە کاتێکی زۆرترە تا دێینەوە سەرخۆمان. زۆر بریندار دەکرێین، زامەکانمان ئەوەندە قوڵن کە سارێژبوونیان گرانە. نرخ بۆ ژیانی خۆت دانانێیت، دەبێ بوونی خۆت لەودا ببینیتەوە ئەگینا هەموو ڕۆژێ هەناسەت خەفە دەکرێت.



– شیرین گیان گرنگ ئەوەیە کە تۆ ڕزگارت بووە لە دەستی، هەر هیچ نەبێ شوێنت هەیە و کار دەکەیت.

– ئیشی چی ئەوە نییە لە هەموو چوونە دەرەوەیەکماندا دڵە ڕاوکێمانە. لەم شارە خۆشەدا دەژین کەچی مافی چوونە دەرەوەمان نییە.

– ئەویش هەر ماوەیەکە و ماندوو دەبن، خۆ ئەو کەربابەی مێردی من هێنامی پاش ماوەیەک لەگەڵ ژنەکەی تریدا خۆی سازکردەوە، بە بیانووی دیتنی منداڵەکانی دەچووە لای. هێندەی نەبرد لەگەڵ مندا کردیە هەراو بەزم و ڕەزم و دواتریش کەوتە ئازاردان و لێدانم، تا گەیشتە ئەوەی تەحەممولم نەماو لە ڕێگەی مامۆستاکەی خەندەوە لە پۆلیس شکاتم لێکرد و ڕامکرد لە دەستی، لە زیندانیشەوە هەڕەشەی ئەوەی لێدەکردم هەر کە بەربێ دەمکوژێ. پاشانیش هێندەی نەبرد بیستم لەگەڵ ژنەکەی پێشوویشی تێکیداوە و ژنێکی تری فریوداوە.

– ئاخر لە زۆر شتدا خەتای خۆمانیشی تێدایە. باشە ژنێ بزانێ پیاوێک لەگەڵ دوواندا نەگونجاوە بۆ ئامادەیە ژیانی لەگەڵ دەست پێبکات، یان ژنەکەی پێشووتری بۆ وازی لەم نەهێنا، تا ژیانی لەمیش تێکنەدا وازی نەهێناو ئێستاش خۆی باری کەوتەوە لێژی.

– ئێ دە ژیان هەروایە. خۆمان خۆشباوەڕین و هەڵدەخەڵەتێین، بەوەی چاکدەبن یان منداڵمان بێت دەگۆڕێن... یان... هەرخۆمان بیانوو دەدۆزینەوە کە لەگەڵیاندا بمێنینەوە.

– هەر خەتای خۆمانی تێدا نییە. لەوەتی بە بیرم دێ دایکم شەقی باوکمی خواردووە و هەردەم لێی ترساوە، ئیتر ئەو ترسە بەرامبەر بە پیاو لە دڵی منیشدا دروست بووە. ڕۆژێک لە ڕۆژان لەو باوەڕەدا نەبووم کە بەرەنگاری باوکم یان برایەکم یان پاشتر مێردەکەم ببمەوە. وا تێگەیشتبووم دەبێ هەروابێت. نەشمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە بڕۆمە پۆلیس و شکاتی لێبکەم. خۆ گەر لێرە نەژیابایین هەر بیریشمان لە شتی وا نەدەکردەوە.

– من بەپێچەوانەوە، دایک و باوکم یەکتریان زۆر خۆشدەویست. هەرگیز دایکمم نەبینیوە لە باوکم دڵگران بووبێ. نەشمبینیوە لێیدابێت. بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆریش زۆڵمی مێردەکەمم قەبووڵکرد.

– دیارە تۆ لەبەر خاتری دایک و براکانت ئەمەت قەبووڵکردووە. دوای ئەوە هەموو کات بیر لە عەیبە دەکەینەوە. بیر لە ڕای کەسانی دەوروبەرمان دەکەینەوە.

– ئەو عـەیبـانەش هەر پیـاو دروسـتی کـردوون، ئەوان بۆ بەرژەوەندی خـۆیان کـۆمـەڵە عـەیبـە و سنووریکیان داناوە بۆ ئەوەی ئێمەی ژن لە چوارچێوەیدا ببەستنەوە.

– ئیتر بەسە هەر خەریکی فەلسەفە ڕستنین، با سەرو قومی لێدەین.

– دەوازبێنە ئێمەو شەراب کوجا مەرحەبا. خەمەکانمان بەسە ئەم بەدبەختییەی ئێمە حوشتریش سەرخۆش دەکات.

– دەی هەر یەکە قومێکی لێدەدەین بەڵکو بمانخاتە هەلەکە سەما. هیچ نەبێ تۆزێ دڵمان خۆشکات.

– بەپێچەوانەوە دەڵێن ئەوانەی کە دەخۆنەوە زیاتر بیر لە ناوەوەی خۆیان دەکەنەوە.

منیش پەرداخم هێناو بڕیارم دا قومێکی لێبدەم و تاقیبکەمەوە. چیدەبێ هەر زۆر زۆر سبەیش ناچم بۆ ئیش. چۆن نەچم بۆ ئیش. لە سبەی زیاتر ناتوانم تەحەممول بکەم و هانس نەبینم. هەرچەندە قسەکانمان وای لێکردم بە وردی بیر لەو پەیوەندییە بکەمەوە، ئێمە هەر خۆمان دەبینە هۆی کێشە بۆ یەکتری. ئەوە نییە هانس بەتەمایە لەبەرخاتری من واز لە ژنەکەی بێنێ. بۆیە دەبێت بە جیدی بیر لەم مەسەلەیە بکەمەوە.

ئەو شەوە هەریەکە تۆزێ شەرابمان خواردەوە. هەر زووش خەومان لێکەوت. هەموو لە ژووری نووستنەکەی من خەوتن و منیش لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە چەرچەفێکم دا بەخۆمدا و خەوم لێکەوت، بەیانی زوو خەبەرم بوویەوە. بە بێدەنگی خۆم کۆکردەوە و نامەیەکم بۆ نووسین و داوام لە ڕێزان کرد نەڕواتەوە تامن دێمەوە. خواردنمان هەبوو، بەڵێنم پێدان کە لە کارەوە تەلەفۆنیان بۆ بکەم، هەروا هەوڵدەدەم کەمێک زووتر بێمەوە، بێ ئەوەی بیرلەوە بکەمەوە گەر ئەمڕۆ هانس ببینم چی دەڵێت و هەڵوێستی چ دەبێت. بڕیارمدا خۆمی لێبدزمەوە تا نەیبینم. ئیتر بیرم لەوە نەکردەوە ئەو ڕۆژە چی چاوەڕوانم دەکات.



# 10

هەفتەیەک بوو گەڕابووەوە سەر کار. بە هیچ شێوەیەک بواری پێنەدا قسەی لەگەڵ بکات، باری ڕەوانیی هانس خراپ بوو. ئێڤا و نەخۆش و سیستەرەکانیش هەستیان بەوەکردبوو، کەسیش نەیدەزانی هۆی چییە. تەنیا ئەم دەیزانی بەشێکی پەیوەندی بەو ئێوارەیەوە هەیە کە یەکتریان بینی. بەڵام لەوە تێنەدەگەیشت بۆ قسەی لەگەڵ ناکات. یەک دووجار هەوڵیدا بچێتە ژوورەکەی، بەڵام خۆی بە شتێکەوە خەریک دەکرد بۆ ئەوەی بواری نەدا قسە بکات. شیرین دەیوت ئەگەر پەشیمانە لەو هەستەی دەربڕیبوو بەرامبەر بە من ئازادە و من ڕێزی ئەو هەڵوێستەی دەگرم و مافی خۆیەتی پاش ئەو هەموو ساڵە نەیەوێ لە ژن و منداڵەکانی جیابێتەوە. هەرچەندە ئەو ئێوارەیە بەشێوەیەک باسی خۆشەویستی خۆی کرد کە ناتوانێ دەستبەرداری بێت و داوای لەم دەکرد بەڵێنی بداتێ کە بەجێی نەهێڵێ، ئێستاش ئەم هەڵوێستەی جێگای سەرنجە.

بڕیاریدا هەوڵبدا بەسەر ئازاری ئەم عەشقەیدا سەربکەوێ. ئەڤینێک کە تازە لەدایکبوو لەباربچوێنێ. لە سەرکار هێندەی تر نیگەران دەبوو. بیری دەکردەوە شوێن بگۆڕێ. هیچ نەبێت بچێتە قاتێکی تری نەخۆشخانەکە و لەو دوورکەوێتەوە. دە ڕۆژێکی برد تا توانی لەگەڵ کچێکی تر کارەکەی بگۆڕێتەوە. شیرین دوا ڕۆژی کارەکەی خواحافیزی لە ئێڤاو نەخۆشەکان کرد.

– ئەمڕۆ سەعاتێک خەریکی ژوورەکەت بوو، دەیگوت خوا دەزانێ ئەوەی پاش من دێت چۆن ژوورەکەی پاکدەکاتەوە.

– وتت چی...؟

– شیرین لێرە نامێنێ، لە شوێنێکی تر کاردەکات.

– بێ زەحمەت بانگی کە بێتە لام.

خێرا چووە ژوورەکەی خۆی و بەپەلە پەرداخێ ئاوی خواردەوە. چ هەواڵێکی دڵ تەزێن بوو، چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. کە دەهاتە ژوورەکەی هەستی دەکرد شوێن دەستی شیرین بە شتەکانییەوەیە. ئەوەش جۆرە ئارامییەکی پێدەبەخشی.

هاتە ژورەوە، هەموو گیانی دەلەرزی و وشەیەکیش چییە لە دەمی نەدەهاتە دەرەوە، دەیویست شتێ بلێ، بەڵام هەستی دەکرد لاڵبووە و زمانی ناجوڵێتەوە. هانسیش رووی کردبووە پەنجەرەکە و سەیری دەرەوەی دەکرد، دیاربوو ئەویش دەیویست هێز لە خۆیدا کۆبکاتەوە بۆئەوەی بتوانێ سەیری شیرین بکات، هەرچەندی کرد نەیتوانی، ویستی قسە بکات، قوڕگی گیرابوو. شیرین وەستابوو و چاوەڕوانی نیگایەکی بوو تا لە چاوەکانی بگات و خۆی فڕێ داتە باوەشییەوە، ئەویش رووی لێنەکرد. پێی گوت " سەعات پێنج لە شوێنەکەی جاری پێشوو چاوەڕوانم بە". شیرین نەیزانی چاوەڕوانی قسەیەکی تری بکات یان بڕوات. چەند چرکەیەک ڕاوەستا، هانس لەشوێنی خۆی نەجوڵا. ئەمیش بەئەسپایی چووە دەرەوە و دەرگاکەی داخست.

ئۆتۆمبیلەکەی وەستاند و شیرین سواربوو، بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوون.

– پاش دیدارەکەمان خۆت شاردۆتەوە، پێم ناڵێی بۆ؟

– نەمتوانی. توشی گرفتێک بووم.

– ئەی نەتدەتوانی تەلەفۆنم بۆ بکەی؟

– تەلەفۆنی ژوورەکەی خۆتم نەبوو، حەزیشم نەدەکرد لە ڕێگەی ئێڤاوە داوات بکەم.

– ئەی نەتدەتوانی سەرێکی خێرا بدەی؟

– نا.

دووبارە بێدەنگ بوونەوە. شیرین هەستی بە ئارامییەک کرد چونکە بۆی دەرکەوت کە تەنیا لێی عاجزبووە و شتێکی تر ڕوووینەداوە. دەبوایە ئەو ئێوارەیە ژمارە تەلەفۆنەکەی خۆی بدابایە پێی.

– چی ڕوویداوە؟

– بۆ ئەوەی بزانی چی ڕوویداوە دەبێ باسی هەموو شتێکت بۆ بکەم.



– ئەی بۆ نایکەی؟

– ئێستا نا. تۆ نەتگوت بەرەو کوێ دەڕۆین.

– خۆشم نازانم.

– ببوورە، نەمزانی ئەوەندە دڵگران دەبی، بەڵام چارەم نەبوو، دەبوو هەر لەماڵەوە بوومایە.

– بۆ؟

– دەتوانین لە شوێنێک دانیشین.

– دەتوانین بچینە لای تۆ؟

– جارێ کچەکەی برادەرم هەر لام دەژی.

دەیویست تۆزێ خۆی هێمن بکاتەوە و بێتەوە سەرخۆی لە هەمان کاتدا پەلەی بوو کە شوێنێک بدوزێتەوە، لە پەنایەکدا ڕاوەستاو بیرێکی کردەوە. زەنگێکی بۆ ژنەکەی لێداو پێی ڕاگەیاند کە درەنگ دەگەڕێتەوە.

ئەو ئێوارەیە هەر ئەوەندەی بۆ باسکرد ئەم خۆی لە مێردە کۆنەکەی شاردۆتەوە، چەند ڕۆژێک پێش ئێستا بە ڕێکەوت بینیویەتی. شیرین بەلایەوە سەیربوو کە پاش ئەو چەند ڕستە کورتە، لە پرسیارکردن کەوت و بێدەنگ بوو.

– من نەمزانی زروفی تۆ بەم جۆرەیە، یەکەم جاریش کە یەکترمان بینی باسی هیچت نەکرد.

ئیتر کەوتە دەربڕینی هەست و نەستی خۆی، کە چۆن هەموو ڕۆژێ چاوەڕوانی ئەوی کردووە. زۆریش دڵگران بوو کە لەم ماوەیەدا فەرامۆشی کردبوو.

– بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئێوارەیەک چاوەڕوانم دەکردی تا تەواو دەبویت. پاشان بە هێواشی دوات دەکەوتم. تەنیا ئێوارەیەک بۆم ڕێککەوت تاماڵەوە دوات بکەوم.

ئێستا دەزانێ شیرین لە کوێ دەژی.

– ئەی بۆ سەرێکت لێنەدام.

– من ئەو کاتە لێت تووڕەبووم، دەمگوت ڕەنگە ئێستا لەگەڵ کەسێکی تردا بیت.

– ناحەقت ناگرم هێشتا نامناسی. ئێستا دەڵێی چی دەتەوێ بچین لە شوێنێک دانیشین.

– دەڕۆینە ناوچەیەک شوێنی نانخواردنیشی لێیە.

– چاکە، دەمەوێ هەندێ شتت بۆ ڕوونکەمەوە.

– منیش قسەم زۆرە باسی بکەم. من زۆر بەجیدی بیر لەم پەیوەندییە دەکەمەوە. دەبێ یارمەتی یەکتربدەین، بۆ ئەوەی کار نەکاتە سەرمنداڵەکانم و ژنەکەشم زۆر بریندارنەبێت، من نامەوێ درۆی لەگەڵدا بکەم، نیازم بوو هەر لە سەرەتاوە ڕاستییەکانی بۆ باسبکەم، ئیتر تۆ ونبووی. من نامەوێ درۆی لەگەڵ بکەم، نەمدەویست خۆشەویستییەکی وا لە دەروونمدا دروست ببێ، کە دروستیش بوو ڕێگەی لێناگرم. دیارە بۆشاییەک لە نێوان من و سارا دروست بووە، بۆیە بواری سەرهەڵدانی هەستێکی وا مەحاڵ نەبوو.

بەم قسانە ئەوەندەی تر نیگەران بوو. نەیدەزانی مەبەستی چییە لە سویدییەکەشی بە باشی نەدەگەیشت، ترسی لەوەبوو کە بیەوێ بەشێوەیەکی تر لەگەڵیدا بژی کە ئەم نایەوێت. ئێوارەیەکی سەخت بوو. هەرچ بڕیارێکیان بدایە چەند کەسێک بریندارەبوون. شوێنێکی پەنایان بۆخۆیان دۆزییەوە، بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوون و جارجارەش تەماشایەکی یەکتریان دەکرد، ئیتر هەریەکەیان بیری دەکردەوە چ بڵێ و چۆن دەست پێبکات.

– ئەم هەستەی کە لە دڵما پەیدابووە بەرامبەر بە تۆ هەستێکی یەکجار بەهێزە، لە دەستەڵاتی عەقڵیش تێپەری کردووە، بیرم لەوە نەدەکردەوە بکەومە داوی خۆشەویستی پیاوێکی ژندارەوە، چجای تۆ کە باوکی سێ منداڵیشی، ئەوەی کە ببمە هۆی تێکدانی خێزانێک زۆر ئازارم دەدات، بۆ ساتێکیش ئەم بابەتە یەخەم بەرنادات.

– ئەو چەند ڕۆژەی کە ونبووی، منیش بیرم لەوە دەکردەوە ئەم هەستەم بخەمە قاڵبی خەوێکەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم، ویستم تۆ لە بیری خۆم بەرمەوە، کارێکی مەحاڵ بوو. ئێستاش سارا هەستی بەوە کردووە کە من وەک جاران نەماوم، ئەو مەسەلەیەشی بەئاشکرا پێ گوتم و منیش پێم گوت ماوەیەکم بداتێ تا بیربکەمەوە، پاشان هەموو شتێکی بۆ باسدەکەم، پێشتر کێشەمان هەبووە، بەڵام هیچ کاتێ بیرم لە جیابوونەوە نەکردووەتەوە. گەرچی لەم ساڵانەی دواییدا تا دەهات لێک دووردەکەوتینەوە، ئەو گەرم و گوڕییەی نێوانمان بەرەو کزبوون دەچوو، هۆی ئەم سارد و سڕییەی نێوانمان زۆر پێ گرنگ نەبوو. جارجاریش بیانووم بۆ خۆم دەهێنایەوە و دەمگەڕاندەوە بۆ تەمەن و گۆڕانکاریی هۆرمۆنات. بە بیرم نایە کاتی خۆی لەگەڵ سارا هەستم بەم گەرمییەی ناو



دەروونم کردبێ، ئێستا واهەست دەکەم لە ناوەوە دەسوتێم.

دەیویست خۆی فڕێداتە باوەشی و دەروونی کڵپەگرتووی دامرکێنێت، ناتوانێ یان باشترە بووترێ ڕێگە بەخۆی نادات، لە شوێنێکی واگشتیدا کارێکی وابکات.

– ئەمە یەکەم خۆشەویستیمە، تا ئێستا هەستم بە شتێکی وانەکردووە بەرامبەر کەسێکی تر. لەوانەیە بپرسی ئەی چۆن شوومکردووە، من شووم بە کابرایەک کرد پێشتر نەمبینیبوو،، دایکم ویستی شووی پێبکەم تا بتوانم یارمەتیان بدەم. کابرای کە شووم پێکرد ڕێگای نەدام یارمەتی کەسوکارم بدەم و نەک ئەوەش ڕێگای نەدام زمانی سوێدیش بخوێنم. چەند مانگێک لە ماڵ نەیهێڵا بێمە دەرەوە.

– ئەی چۆن ڕزگارت بوو ؟

– لە ڕێگای ژنێکی سوێدی دراوسێمانەوە، بەیارمەتی ئەو چوومە سەنتەری ژنان، لەوێش وازی لێنەهێنام تا ناچاربووم بێمە ئەم شارە و ناوم بگۆڕم و قژم بۆیە بکەم.

– هەربۆیە "لینز" بەکاردەهێنی. ڕێگام دەدەی ماچێکت بکەم، مەترسە کەس لێرە نییە. لێرەش تاقە ماچێ ئاساییە.

ماچێکی ناودەمی کرد و دەستەکانی شیرینی خستە ناو دەستی.

– بەڵێن بێ ژیانت بۆ بگۆڕم، ئەو ئازارانەت لە بیربەرمەوە.

– دەزانم هەموو ژیانم گۆڕاوە، بەڵام نازانم بەرەو کوێ دەڕوات. ترسی ئەوەم هەیە کە بەرگەی ئازارێکی تر نەگرم.

– خەمی ئەوەت نەبێت. من هەوڵدەدەم بەزووترین کات ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە منەوە هەیە چارەسەریان بکەم. دەبێ بگەین بەیەک.

– ئەی ئەگەر لەسەر حیسابی خۆشی کەسانێکی تر بێ چبکەین.

– دیارە دەبێ وابێت. ژیان خۆی لە خۆیدا ئاڵۆزە و زۆر شت هەیە لە دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە. من هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە لەم تەمەنەدا لە باری ڕۆحییەوە بتوانم بەکەسێکی تر ببەسترێمەوە.

– کە تۆ باسی ئەم شتانە دەکەیت هەست بەئازار دەکەم، پێش ئەوەی بتبینم هەستم بە

خۆشەویستی دەکرد، هەموو جارێ کە دەهاتمە ژوورەکەت ئارام دەبوومەوە، تەنانەت پێم وابوو ژوورەکەت لە شوێنەکانی تر ڕووناکترە. نەمدەزانی هۆی ئەو هەستەم چیبوو، دەمگوت لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە من هەردەم بە ئاواتەوەبووم ببمە پزیشک. ئەوەش ژووری پزیشک بوو، بۆیە هێندەش لە ژوورەکەتدا دەمامەوە، زۆریش دەترسام بتبینم. هەربۆیە لە سەرەتادا خۆم پیشان نەدەدای یان نەمدەویست بتبینم، لە یەکەمین دیدار و یەکەمین سەرنجی تۆ دەترسام.

– سەیرە منیش ئەو ماوەیە هەستم بەشتێکی نائاسایی دەکرد، دڵم لەجاران خۆشتربوو، تەنانەت منداڵەکان و سارا هەستیان بەوەکردبوو، سارا زۆر دڵی خۆشبوو، باسی ئەوەت کرد کە لە کۆلێژی پزیشکی دەتخوێند؟

– سێ ساڵم خوێند. پاشان هاتمە ئێرە.

– گوێ مەدەرێ هێندە نابا دەستپێدەکەیتەوە. سەرەتا دەبێت زمان بخوێنیت، خۆ گەر واز لە کارەکەت بێنی باشترە.

– نامەوێ واز لە کارەکەم بێنم. هەرچەندە لە سبەینێشەوە دەچمە بەشێکی تر. بە ئێوارانیش زمان دەخوێنم، بەڵام زۆر ناچم بەتایبەتی لەو کاتەوە ئەو کچەی هاوڕێم لام دەژی.

– ئەوەش ئارەزووی خۆتە، کە پێکەوە ژیاین من هەموو شتت بۆ مسۆگەر دەکەم خەمت نەبێت.

هەر ئەکەوتنە باسکردنی داهاتوو شیرین تێکدەچوو، بیری لە دوو شت دەکردەوە. هەر ئەو دوو شتە مێشکی جەنجاڵکردبوو. ئەو ئێوارەیە زوو تێپەڕی و بوو بەسەعات نۆ. هەردووکیان پەلەیان بوو بگەڕێنەوە. ئەو دەیویست فریابکەوێ شەوباش لە منداڵەکانی بکات، ئەمیش دەیویست نهێنییەکانی دڵی بۆ شارای هاوڕێی باسبکات، دەبوو بۆ یەکێکی باسبکردایە، نەیدەتوانی ئەو هەموو شتە لێکبداتەوە.

هانس زۆر بە بێدەنگی گەڕایەوە ماڵێ. یەکسەر چووە ژووری منداڵەکانی و شەوباشی لێکردن، گەرچی منداڵەکانی گەورە بوون، بەڵام پێیان گران بوو بەبێ بینینی باوکیان بخەون. ساراش لە هۆڵەکە دانیشتبوو تەماشای تەلەڤزیۆنی دەکرد. چوو شووشەیەک شەرابی هێنا و پێکێکی بۆ تێکرد، سارا بەمە دڵی خۆشبوو و هاتەلایەوە و ویستی باوەشی پێدابکات و لە ئامێزی بگری، بەڵام ئەو خۆی دوورخستەوە، بە ئەندازەیەک لێک دوورکەوتوونەتەوە تەنانەت شەوانیش پێکەوە



ناخەون، هانسیش هەر لە ژووری کارکردندا دەنوێت، هەوڵیان دەدا منداڵەکان بەمە نەزانن. دیاربوو هەر یەکەیان چاوەڕوانی ئەوی تر بوو دەستپێشخەری بکاو بیرێک لە کێشەکانیان بکەنەوە کە بەرینتر دەبووەوە.

سارا پێکی شەرابەکەی لە سەر مێزەکە دانا.

– تۆ زۆر گۆڕاوی، ئایا هیچ شتێک ڕوویداوە، دەزانم من و تۆ ماوەیەکی زۆرە لەیەک دوورکەوتوینەتەوە، کەسیشمان هەوڵی ئەوەمان نەداوە بەجیدی بیری لێبکەینەوە بۆ دەبێ پاش سێ منداڵ پەیوەندیمان بەم بنبەستە بگات. دەبێ بەجیدی بیر لە چارێک بکەینەوە.

– سارا داوای لێبووردن دەکەم، تازە درەنگە.

– مەبەستت چییە؟

– من... پەیوەندی خۆشەوستیم لەگەڵ ژنێکی تردا هەیە.

ویستی بقیژێنی، خێرا دەمی خۆی گرت بۆ ئەوەی منداڵەکان خەبەرنەکاتەوە. دایە پرمەی گریان، هانس هات باوەشی پێدابکات و هێمنی بکاتەوە. بەڵام ئەو بەبێ ئەوەی سەیری بکات پاڵێکی پێوەناو لێی دوورکەوتەوە.

– بڕوا بکە هەرگیز نیازی ئەوەم نەبووە بریندارت بکەم یان خیانەتت لێبکەم، بڕوابکە بەبێ نەخشە و پلاندانان کەوتمە خۆشەویستی کچێکەوە. هەربۆیە وا زووش پێت دەڵێم، چونکە ئێمە پەیمانمانداوە خیانەت لەیەک نەکەین. گەر یەکێکیشمان کەوتە داوی خۆشەویستی کەسێکی تر ئەویترمان ئاگاداربکاتەوە.

– ئەمە لە کەیەکەوە ئەم کچەت خۆشویستووە. خۆ هێشتا نەبووی بە پەنجا ساڵ تا جارێکی تر هەرزەکار بیتەوە.

– هەر پێش سەفەرەکەمان بە یەک ڕۆژ، بەڵام هێندە یەکترمان نەبینیوە.

– دەمزانی شتێک ڕوویداوە، بەڵام خۆم گێل دەکرد بۆ ئەوەی خۆم بە درۆبخەمەوە. ئەی منداڵەکان، بەوان چی بڵێین.

سارا لە هۆڵەکەدا دەهات و دەچوو. دەیوست پڕ بە ژوورەکە بقیژێنێ، چی بکات نایەوێ منداڵەکانیان بە سەر ئەم هەواڵەدا خەبەریان بێتەوە. هەردووکیان خەمی منداڵەکانیان بوو.

– بەم زووانە لێرە دەڕۆی؟

– جارێ نا تا منداڵەکان تۆزێ هێمن دەبنەوە.

– ئەوان هەرگیز هێمن نابنەوە. ئەوەی چاوەڕوانیان نەدەکرد ئەمە بوو. ئاخر تۆ هەی دایکت... چۆن توانیت کارێکی وابکەی.

– دەزانی لەم چەند ساڵەی دواییدا...

– دەزانم هەی حیز... بۆ لەو هۆیانە نەکۆڵایتەوە کە پەیوەندی من و تۆی ساردکردۆتەوە. دیاربوو چاوەڕوانی ئەوەت دەکرد کەسێکی تر لە ژیانتا پەیدا بێ. ئەوەندە دەزانم پیاو شایانی هیچ خۆشەویستی و وەفادارییەک نییە. حەیف بۆ ئەو هەموو ساڵەی لەگەڵ تۆدا بردمە سەر.

سارا هەستاو ئەو شەرابەی لە پێکەکەیدابوو کردی بە دەموچاوی هانسدا و چووە دەرەوە. ئەمیش تا درەنگانێ هەر لە هۆڵەکە دانیشت، تەنانەت جلەکانیشی نەگۆڕی. شەرابەکەشی تەواونەکرد، ماوەیەک بەسەر ئەلبوومەکانی یادەوەرییاندا بەبێ دەنگی گریا، دەیزانی نەدەبوایە ئەمەی بکردایە بەرامبەر ئەو ژنەی کە هەر لەمنداڵییەوە پێکەوە بوون و سێ منداڵی هاوبەشیان هەیە. دەبێ بیر لەوەبکاتەوە کە ڕووداوەکە هێندە کار لە منداڵەکانی نەکات. منداڵەکانی یەکجار خۆشدەویست، ئەوەی لە توانایا بوو بۆی مەیسەر کردبوون. لەگەڵ ئەوەی سارای ژنی هەردەم گلەیی ئەوەی لێدەکرد کە هیچ کاتێ بە دیار منداڵەوە دانەنیشتووەو هەموو کاتی بۆ کارەکەی تەرخانکردووە، تەنانەت ئەو کاتانەشی کە منداڵەکانی نەخۆش دەکەوتن دەبوو سارا بۆ کار نەڕۆیشتایە، بەڵام لەبەرئەوەی هانسی خۆشدەویست نەیدەویست ئەمە بکاتە کێشە.

منداڵەکان گەورەن و دەبێ تێبگەن، هانس ترسی ئەوەی هەبوو کە نەتوانن لە خۆشەویستییەکەی تێبگەن، لەو باوەڕەدابوو منداڵەکانی لێی خۆشنابن کە ئەم لە پشت دایکیانەوە ژنێکی تری خۆشویستبێ، بەتایبەتی کاترینا کە گەورەترە و شتەکان بە ڕوونی دەبینێ. دەمەو بەیانی بوو هانس هەر لە جێگەکەی خۆی نەجولابوو، سەیری پەنجەرەکەی کرد، دنیا خەریکبوو ڕووناک دەبووەوە. هەستاو بەرەو ژوورەکەی خۆی چوو تا منداڵەکان بەم شێوەیە نەیبینن. ئەو ڕۆژە کەسیان نەچوون بۆ کار. پاش ئەوەی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە بەڕێخست، هەردووکیان چوون خەوتن.



## 11

کاتێک گەڕامەوە شارا هێشتا چاوەڕوانی دەکردم، زۆر نیگەران بوو، دەریاش لە هۆڵەکەدا سەیری تەلەڤزیۆنی دەکرد.

– بۆ درەنگ هاتیتەوە؟ دەزانی چەند ترسام. دەریاش چاوەڕوانی تۆ بوو، هەرچەندم کرد خەوی لێنەدەکەوت.

– ببوورە، ئیتر وایلێهات.

ئەمەم گوت و دەستم کرد بە گریان و لە شوێنی خۆمدا دانیشتم. شاراش شپرزە بوو هات باوەشی پێداکردم.

– چی ڕوویداوە؟ کەربابەکەی مێردت بینی؟

– نانا لەوە مەترسە. تەنیا کابرا تازەکەمم بینی.

– جا لەو خەبەرە خۆشتر هەیە، تۆ هەر دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرلە نوێ ژیانت دەست پێبکەیتەوە، بەتایبەتی هیچ شتێک بەویترت نابەستێتەوە.

– دەزانم، بەڵام ژنێک و سێ منداڵی هەیە.

شارا بێدەنگ بوو. دەریا دەستی کرد بە گریان، دەمزانی ئەمشەو دەریا خۆی ئاشکرا دەکات، خێرا لە ئامێزم گرت و بردمە ژووری نووستنەکە و پاڵم خست و پێمگوت: بێدەنگ بە جارێ دایکت خۆی لەبەر ئەم ڕاستیە ناگرێ. پاشان خۆمان قسان دەکەین، سبەی دەتبەمە دەرەوە، باسی هەموو شت دەکەین.

ئیتر ئەوم بەجێهێشت و چوومەوە لای شارا.

– شارا گیان بۆ وا یەکسەر دەستت کرد بەگریان.

– بۆ شانسی تۆ. تۆ کەسێکت خۆشویست، بەڵام بۆ دەبێت ژنی هەبێت. ترسی ئەوەم هەیە سەرکەوتوو نەبێ. زۆرت خۆشدەوێت؟

– خۆشەویستی هەستێکی سەیرە، تەواوی جەستەت داگیر دەکات، لەگەڵ ترپەی دڵ و هەناسەتدا تێکەڵ دەبێت، ئێستا ڕۆژێک نەیبینم تاڵێک ڕووناکی لە ژیاندا بەدی ناکەم. بیر لەوە دەکەمەوە گەر پەیوەندییەکەمان سەرنەگرێ دەبێ چیم بەسەربێ.

– کەخۆشتویست نەتدەزانی ژندارە.

– با دەمزانی، پلانیشم بۆ ئەوە دانەنابوو، بەڵام کە یەکەمین جار بینیم تیشکێکی ڕووناک و گەرم بەر هەموو جەستەم کەوت و لە تەوقی سەرمەوە تا بنی پێمی گرتەوە، لەو تیشکە خواییانە دەچوو کە نابینرێن و بیرو هۆشت داگیردەکەن. من لەسەر کورسییەکەی دانیشتبووم و دەگریام، کە چاوم کردەوە ئەوم بینی ئیتر نیگاکانمان تێکەڵبوون، تەنانەت ئەوەشمان بیر چوو کە زمانمان هەیەو دەکرێ قسان بکەین. شارا هەستێکی سەیر بوو ئیتر لە حاڵەتێکی وادا لە کوێ دەتوانی بیر لەوە بکەیتەوە ژنی هەیە یان نا، ماوەی ئەوەت نابێ، دەزانی وەک چی وایە، دەڵێی ڕەفتەیەکی ئاوریشمیت بە سەرەوەیە و ختووکەت دەدات.

– دەی دەی بەردەوامبە ئەمە شاعیریشی نەمانزانیوە، تەماشاکە چەند جوان شتەکانت هۆنییەوە.
ئەم کابرایە دیارە زۆرگرنگە وا تۆی کردووە بە شاعیر.

– شارا تکایە کاتی گاڵتەکردن نییە، وا هەست دەکەم خاوەنی دڵی خۆم نیم، خەریکە لەدەستم دەچێ.

– ئەوەچ دەڵێی تازە لەدەستت چووە.

– ئەی نازانم چی بکەم، لەوە دەکات کەسمان بێ یەکتر هەڵنەکەین، ئەو بە نیازە بە زووترین کات لەگەڵ ژنەکەیدا بیبڕێتەوە، ئیتر نازانم چی ڕوودەدات.

– ڕاستت لەگەڵ دەکات؟

– دڵنیام ئەویش هەمان هەستی بۆ من هەیە. پێشتریش باسی ئەوەمان کرد وابزانم. بەڵام



کێشەکە ئەوەیە کە من لەم خۆشەویستییەمدا هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەم، منێک کە هەردەم بیر لە زوڵمی پیاو دەکەمەوە بەرامبەر بەژن کەچی لەم حاڵەتەدا هاوبەشی پیاوێک دەکەم کە خیانەت لەژن و منداڵەکانی بکات.

– هەست بەو ئازارە مەکە، چونکە ئەگەر ئەوان پەیوەندییان باشبووبێ ئەم هەستەی لا دروست نەدەبوو. گرنگ ئەوەیە بە مەبەستی ڕابواردن نەبێت.

– باوەڕناکەم، تەنانەت جارێک ویستی ماچم بکات داوای ئیزنی لێکردم، ئەمڕۆش تەنیا ماچی ڕوومەتی کردم و لە ئامێزی گرتم.

– ئەی تەمەنی چەندە؟

– وابزانم نزیکەی چل ساڵێک دەبێ.

– تۆ زۆر لەو منداڵتری، دیارە ئەو بەدوای کچێکی گەنجدا دەگەڕێ. بیریشت نەچێ کە تۆ زۆر جوانی.

– نا وا مەڵێ دڵم دەوەستێ گەر ئەو بە نیازێکی خراپ منی بوێ. هەرچەند دەکەم بڕوا ناکەم. چونکە بە قسە و چاوەکانیدا هەست بە خۆشەویستی دەکەم.

– گرنگ هەستە بڕۆ بخەوە، سبەی کاردەکەی.

شارا چووە ژوورەکەی خۆی و منیش لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە پاڵکەوتم، زۆر ماندووبووم، بەڵام نەمدەویست بخەوم، پێویستم بەبیرکردنەوە بوو، وا هەستم دەکرد کات بەشی بیرکردنەوە ناکات. ویستم حەبێکی خەو لە شارا وەرگرم، کەچوومە ژوورەکەوە گوێم لە پرخەی بوو بۆیە بە هێواشی هاتمەوە هۆڵەکە و پاڵکەوتم، هێندەم زانی دەریا خۆی دا بەسەرسکما.

– چییە خەوت لێناکەوێ، چاوەڕوانی منت دەکرد.

– دەریا ئاگات لە خۆت بێت کاتی ئەوە نییە دایکت بزانێ زمانت گرتووەو قسە دەکەی.

– باسی دایکم مەکە. باسی خۆتم بۆ بکە، دیارە ئەمشەویش لای کابرا بووی.

– ئەی گوێت لێنەبوو بۆ دایکتم باسکرد.

– با گوێم لەهەموو شتێک بوو.

– ئەی تۆ ڕات چییە.

– دیارە یەکتریتان خۆشدەوێت، بەڵام زەحمەتە بۆ یەکتر بن. تا دەتوانی خۆشی و لەزەت لەم خۆشەویستییە وەرگرە. مرۆڤ هەموو کاتێ ناکەوێتە خۆشەویستییەوە. دەمەوێ شتێکت بۆ باسبکەم. دایکم ئەمڕۆ قسەی لەگەڵ نەنە کرد. دەستی کرد بە گریان، منیش بە ئەسپایی و بێ ئەوەی پێبزانێ وایەری تەلەفۆنەکەم دەرهێنا، ئەمیش وایزانی نەنە تەلەفۆنەکەی بەسەردا داخست.

– بۆچی حەزناکەی دایکت قسە لەگەڵ نەنەدا بکات؟

– نامەوێ ئەوان بزانن دایکم لە کوێ دەژی ئەگینا دەیکوژن.

– بڕوا ناکەم کاری وابکەن.

– من لەو باوەڕەدام کاری وادەکەن. بەتایبەتی پاش ئەوەی شکاتی لە باوکم کرد و ماڵی بەجێهێشت. دەیانەوێ تۆڵەی لێبکەنەوە. وازیشی لێناهێنن تا نەیکوژن. ئەوان ئێستا پلانی بۆ دادەنێن.

– ئەی چی بکەین. گەر دایکت بیەوێ بگەڕێتەوە لای باوکت کەس ناتوانێ ڕێگەی لێبگرێ.

– سبەی قسە لەگەڵ "ئیلێنا" بکە با چارەسەرێک بۆ دایکم بدۆزنەوە.

– دەزانم ژیان بەم شێوەیە سەختە، هەموو کات لە ماڵەوەیە، تەنانەت بە ئازادیش ناتوانێ بچێتە دەرەوە، هەتاکەی بەم شێوەیە بژی. ئەمە چارەسەر نییە بۆ ئێمە. من ئەمە دەزانم بەڵام ئەوانەی لەو شوێنانەدا کاردەکەن دەبێ بەشێوەیەکی تر چارەسەری ئەم گرفتانە بکەن، دەزانی دایکت خەمی تۆیەتی، خۆ تۆ ناتوانی تا سەر لە ماڵەوە لەگەڵ ئەودا بیت.

– دەزانم باری دەروونیی دایکم زۆرخراپە، من بە درێژایی ڕۆژ تا تۆ دێیتەوە هەر خەریکی گڕوگاڵم، ڕادەکەم و ئەویش بە دوامەوەیە، وای لێدەکەم کە هێندە بیر لە خەمەکانی خۆی نەکاتەوە، بەڵام هەر کەڵکی نییە، زۆر بیری دایکی دەکات.

– دەزانی ئەو حەقی خۆیەتی، بەیانی تا ئێوارە لە ماڵەوەیە، ئەمەش ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نییە، ناشزانێ تاکەی ئەم وەزعە بەردەوام دەبێ.

– گەڕانەوەی دایکم بۆ لای باوکم مانای کۆتایی هاتنە بەژیانی. دڵنیاشم کە دەیکوژن.

– ڕەنگە خۆت بۆ دایکت ئاشکراکەی و قسەی لەگەڵ بکەی بە گوێت بکات، ئەمەش پێویستی بە پلان و نەخشەیەکی باشە، نەوەکو دایکت تووشی شۆک بێت.



– جارێ زووەو ناوێرم.

تا درەنگانێ قسانمان کردو هەر بەدەم قسەکردنیشەوە خەومان لێکەوت، نەمزانی کەی و چۆن. بەیانی زوو شارا هات خەبەری کردمەوە و پێی سەیر بوو کە دەریای لە باوەشی مندا بینی.

– ئەم کچە تەواو خووی بە تۆوە گرتووە، نازانم بەبێ تۆ وەزعی چۆن دەبێت.

– جا بۆ لێرە دەڕۆن. هەر لێرە بن. دەزانی ئەمڕۆ بیرم لەچی کردەوە، ئەمڕۆ دەڕۆم عەباو پەچەیەکت بۆ پەیدا دەکەم و ئیتر بە دووقۆڵی پێکەوە دەردەچین. دەریاش بەچاوی نوقاوەوە وتی بەسێ قۆلی، بۆ منت لەبیر چوو. کە شارا گوێی لە دەریا بوو خەریک بوو بەربێتەوە و هاواری کرد.

– شیرین ئەوە دەریا بوو قسەی کرد. جا ئەو تا ئێستا فێری قسە نەبووە ئەو ڕستە ڕێک و تەواوە چیبوو.

– نازانم خۆی بوو؟

– ئەی کێ بوو؟ خۆمن شێت نەبووم.

– بە دەم خەوەوە قسەی کرد، دەڵێن منداڵ وەک گەورە خەو دەبینێ لەوانەیە لە خەوەکەشدا وەک گەورە قسە بکات.

– من شتی وام نەبیستووە. هەر لە زووەوە وا هەست دەکەم ئەم منداڵەی من ئاسایی نییە، تەنانەت بیرۆکەکانیشم دەخوێنێتەوە، هەندێ جار کە سەیرم دەکات دەنگی لە مێشکما دەزرنگێتەوە.

– بێ دەنگ بە خەبەری مەکەرەوە. وەرە بیبە سەر جێگەکەی خۆی، منیش دەبێ بڕۆم درەنگە، وابزانم فریای نان خواردنیش ناکەوم.

ئەو ڕۆژە بەو شێوەیە خۆم ڕزگار کرد، خێرا چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی لەوە زیاتر سەبارەت بە دەریا قسان نەکەین.

بە درێژایی ئەو ڕۆژە بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەم نهێنییە بۆ شارا باسبکەم، دەبێ ئەو چۆن لەم مەسەلەیە بگات، پێی دەڵێم ئەمە بەهرەیەکی خوداییە و پێویست ناکات لای کەس باسی بکات. چونکە ئەگەر کەسێک بزانێ ئەوا یەکسەر دەیگەیەنێتە ماسمێدیا، ئیتر سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ. ئەو ڕۆژە هێندە بیرم بەو مەسەلەیەوە خەریک بوو ئاگام لەکارەکەم نەبوو، یەکەمین ڕۆژم

بوو لەو بەشەدا کاربکەم. دەستم لەکار بەردا بیرم لەوە کردەوە هانس ببینم. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بێتە خوارەوە بۆ لام. هەر دیار نەبوو، بۆیە بڕیارمدا بچم بۆ بەشەکەیان، ماوەیەک لەوێ لەگەڵ ئەو کچەی لەجیاتی من کاری دەکرد خۆم خەریک کرد، بەڵام بێسوود بوو. بەلای ژوورەکەیدا تێپەڕیم و بەناوی سۆراخ کردنەوە چوومە لای ئێڤا، لێم پرسی:

– نەڕۆیشتووی؟ بۆ دکتۆر تا ئێستا نەڕۆیشتووە؟

– دکتۆر ئەمڕۆ هەر نەهاتووە گوایە نەخۆشە، ئەوەندەی من ئاگاداربم ئەوە یەکەمین جارە نەخۆش دەکەوێ.

– دیارە زۆر کاردەکات و ماندوو دەبێ. ئەمەم وت و هاتمە دەرەوە. نیگەرانبووم، هۆشم لای خۆم نەمابوو، تەنانەت سواری پاسێکی تربووم، لە دوایەمین وێستگەدا شۆفێرەکەی خەبەری کردمەوە. کە لێشی پرسیم بەرەو کوێ دەڕۆم ناوی ناوچەکەی خۆمانم بیرنەمابوو.

دوو سەعاتی ویست تا گەڕامەوە. شارا و دەریا دیسان نیگەران بوون، شارا تووڕە بوو.

– کە دوا دەکەوی بۆ تەلەفۆنێک ناکەی. دەزانی چەند نیگەران دەبین کە تۆ وا دوادەکەوی. ئەمجارە چی ڕوویداوە.

– نازانم چی ڕوویداوە. ئەمڕۆ هانس نەهاتبوو بۆ ئیش. هەروەک خۆی وتی دیارە بەژن و منداڵەکانی وتووە. گەر شتێک ڕووینەدابێ باشە.

– جا تۆ چی دەکەی. گەر ئەو بڕیاربدات واز لە ژن و منداڵەکانی نەهێنێ.

– بۆ من باشترە، ڕاستە بۆ ماوەیەک ئازار دەخۆم، گەر لەگەڵ ئەویشدا بم بەردەوام خۆم بەتاوانبار دەزانم.

– نازانم نهێنی بوونی ئێمە چییە لە ژیاندا، یان بۆ دەبێ ئێمە هەبین گەر ژیانمان بەوجۆرە بێ، بۆ دەبێ مێردەکانمان خوێڕی بن، بۆ ئەو کابرایە کەسێکی باشی لێدەرنەچوو. یان بۆ مێردەکەی من ببێ بەکەری باوکم. خۆ ئەو منی هێناوە نەک باوکم. گەر ئەو کەربابەی من بەگوێی باوکمی نەکردایە ژیانی ئێمە بەمجۆرە نەدەبوو. بۆ ناتوانن دەستبەرداری زەبر و زەنگ بن و بە ئاسودەیی بژین. لە نهێنی ژیان تێناگەم، پاش ئەو هەموو دەردەسەرییەی بەسەرتدا هاتووە بۆ دەبێ بکەویتە داوی خۆشەویستی پیاوێکی ژندارەوە.



– ئاخۆ کەسێک هەبێ لە ڕۆژی یەکەمەوە ژیانی مرۆڤ پرۆگرامێرە بکات. گەر هەبێ بۆ ناتوانین پەیوەندی پێوە بکەین، ئەی باشە بۆ پلانی ژیانی هەندێ کەس وا ئاسودە و ئاسانە. کەچی هی ئێمەمانان پڕ گرفت و دەردەسەرییە. تێناگەم، بۆ دەبێ منێک هەر زوو باوکم لە دەست بدەم و دوو برای پەککەوتەم هەبێ، ئاخر من گوناهم چییە، هەروەک دایکم دەیووت خۆ نەدزیم کردووە و نە ماڵی کەسم بڕیووە.

بێدەنگ بووم و بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشتم، دەریا بە گاگۆڵکێ بە دواما هات.

– شارا دیارە کچەکەت برسیەتی، لەوانەیە بیرت نەبووبێ نانی بدەیتێ.

– ناوەڵا ئەمڕۆ کەسمان نانمان نەخواردووە. بە درێژایی ڕۆژ گریاوە و ڕازی نەبووە هیچ بخوات.

– دیارە کارێکت کردووە ئەم بە دڵی نەبووە.

– ناوەڵا تەنیا تەلەفۆنم... بۆ دایکم کرد.

– جا بۆ شتی واتکرد، ناترسی لێرەش بتدۆزنەوە.

– کچێ دەبا بمدۆزنەوە و بمکوژن، جا بۆ ئەم ژیانەی من مانایەکی تێدا ماوەتەوە.

هەر ئەمەی وت دەریا دایە قیژە.

– چۆن ژیانت مانای تێدانییە؟ توخوا گەر هێندە بلّح بیت. تۆ منداڵێکی ئەوەندە جوان و ژیرت هەیە هەموو ژیانت بۆ دەهێنێ.

– دەزانم، بەڵام ژیانم لەویش تاڵ کردووە. ئەم بەستەزمانە جگە لە من و تۆ کەسێکی تر نابینێ. ژیانی منداڵ چۆن وا دەبێت.

– گوێ مەدەرێ ئێستا نان دەخۆین و دەچینە دەرەوە، چ دەبێ با ببێ. دەچینە ناو شار تێر تێر دەگەڕێین. بە کەسیش ناڵێین. ئەزانی چی دەڕۆین لە دەرەوەش نان دەخۆین. من شوێنێک شارەزام کە بێگانەی بۆ ناچێ تا ترسی ئەوەمان هەبێ کەسێک بمانبینێ.

شارا ئەمەی زۆر پێخۆش بوو خێرا دەریای هەڵگرت و چوون خۆیان بگۆڕن.

ئێوارەیەکی خۆشمان بردە سەر. تێر نانمان خوارد و پێکەنیین. بەڵام نەمانوێرا بە بازاڕدا بسوڕێینەوە، بڕیارماندا وردە وردە بکەوینە خۆ دەرخستن و سنوورشکاندن، مەبەستم سنوورشکاندنی سەنتەری ژنانە کە قەدەغەیان کردووە لە ماڵ بچینە دەر. نازانم ئەوان بۆ بیر لەوە

ناکەنەوە کە چۆن ژیان بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت یان تاکەی ئێمە خۆمان لە مێردەکانمان بشارینەوە. ئایا ئەوەی مێردەکانمان دەیکەن بەهۆی جۆرە نەخۆشییەکەوە نییە کە لە مێشکیاندایە، باشە چارەسەری ئەو نەخۆشییە نییە، زانست وا نەخۆشی سەرەتان عیلاج دەکات بۆ ناتوانێ مێشکی ئەو جۆرە پیاوانە بگۆڕێ و کۆتایی بە شەڕە هەمیشەییەکەیان بهێنن. ناشزانم ئەمە شەڕە یان نەخۆشییە. باشە گەر شەڕ بێ بۆ هەموو پیاوانی دونیا بەشداریی تێدا ناکەن، خۆ باوکم بەشداریی ئەم شەڕەی نەکرد. ئەو هەردەم دایکمی خۆشدەویست، لە فەزای خۆشەویستیدا دەژیا. من ڕۆژێک نەمبینی لە دایکمی دابێ، بەڵام خۆم بەقەد هەموو ساڵانی تەمەنم لێدانم خواردووە بەدەست مێردەکەم. نەدەکرا ئەو جۆرە بۆچوونانەی کە پیاو بەرامبەر بە ژن هەیانە وەک پرۆگرامی کۆمپیوتەر بسڕایەتەوە و بەرنامەیەکی نوێ لە مێشکیاندا تۆمار بکرایە. بەجۆرێک ئێتر هەستیان بە یەکسانی نێوان ژن و خۆیان بکردایە.

شارا ڕاست دەکات دەبێ نهێنی ژیانی ئێمە لە چیدابێت. باشە گەر لە کاتی خۆیدا پیاو دەسەڵاتی لێوەرنەگرتینایە، دەبوو ئێمە چۆن بوینایە بۆ پیاو، ئاخۆ ئێمەش لە پیاومان بدایە، یان یاساکانمان تەنیا بۆ بەرژەوەندی خۆمان داڕشتایە.

زۆرجار ئێمەی ژن دەبینە دوژمنی خۆمان، ئەم خۆشەویستییەی من خێزانێک تێکدەدات، ژنێک بریندار دەکات. ئاخر لای خۆشمان هەر ژنە بەسەر ژنێکی تردا شوودەکات. ئاخۆ ناتوانن سنوور بۆ خیانەتی پیاو دانێن؟ تەنیا بەوەی هیچ ژنێ پەیوەندی لەگەڵ پیاوی ژنداردا نەبەستێ. هیچ ژنێ شوو بە پیاوێکی ژندار نەکات.

هەر ماوەیەکە ئازار دەخۆم ئەویش بەسەردەچێ. سبەی دەچم چەند کتێبێک لە کتێبخانە وەردەگرم و خەریکی خوێندنەوە دەبم تا هێندە بیری لێنەکەمەوە، باشترە خۆم بە دەریا و شاراوە خەریک بکەم. شاراش پێویستی بەیارمەتی هەیە، ئەی کێشەی دەریا چۆن چارەسەربکەم.

بۆ ڕۆژی دوایی هەر زوو ژوورەکانی بەشەکەم پاککردەوە. هەوڵم دا زووتر دەرچم چونکە دەیزانی کەی لە کار تەواو دەبم. ئەو ڕۆژە یەکترمان نەبینی ئیتر نەشمزانی هاتووە بۆ کار یان نە. بەڵام هەموو بیر و هۆشم لای ئەو بوو. شەویش خەوم لێنەکەوت. بۆ ئێوارەکەی ئۆتۆمبیلەکەیم بینی لە جادەی بەردەم ماڵەکەمان ڕاوەستابوو. دەیزانی لە چ خانوویەک دەژیم بەڵام کۆدی دەرگاکەمانی



نەدەزانی. لە پەنجەرەکەوە سەیرم دەکرد زوو زوو لە ئۆتۆمبیلەکەی دەهاتە دەرەوە و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کەسێک دەرگاکە بکاتەوە و ئەویش بێتە ژوورەوە، خوای کرد ئەو ئێوارەیە تا ئەو لەوێ بوو کەس دەرگای نەکردەوە. بۆیە لێیدا و ڕۆیشت. بە ڕۆیشتنی ئەو ئاگرێک لە دڵم بەربوو، ئیتر بەبێ ئەوەی شارا بزانێ چوومە حەمامەکە و ئاوەکەم بەردایەوە و ئەوەندە گریام. وامدەزانی لەبەر دەنگی ئاوەکە گوێیان لێم نابێ.

– ئاگری دڵت کپ بوویەوە؟ وا دەریاش لە ژوورەوە وەک تۆ بەکوڵ دەگری. گوێی لە دەنگی تۆ بوو. ماوەیەک هات لە بەردەم دەرگای حەمامەکە دانیشت و پاشان چووە سەر جێگەکەی دەستی بە گریان کرد.

نەمزانی چی بە شارا بڵێم، چونکە دەمویست خەمی ئەو کەم کەمەوە نەک خەمی خۆشمی بخەمە سەر. چووم باوەشم بە دەریادا کرد و توند توند بە خۆمەوە گوشیم و پێم وت: مەگری گیانەکەم مەگری تۆش گەورە دەبێ بۆ خەمەکانی ژنایەتیت. لەوانەیە خەمی تۆ شێوەیەکی تر یان ڕەنگێکی تر بەخۆە بگری. خێرا دەمیشیم نووساند بە سنگمەوە بۆ ئەوەی قسەنەکات. چونکە دەمزانی خۆی ڕاناگرێ و وەڵامم دەداتەوە.

ئەو ئێوارەیەش چوینە دەرەوە لە قاوەخانەیەکی نزیک ماڵەکە دانیشتین، بەرامبەری قاوەخانەکە باخچەیەکی گەورەی لێبوو، بۆ دەریا خۆشبوو، ئەو ناوچەیە هێندە بێگانەی لێنەدەژیا، بۆیە بڕیارمان دا هەندێ جار ئێواران دەرچین، خەڵکانی لای خۆمان لەم وڵاتانە بە ئێواران هێندە دەرناچن و زیاتر بەدیار کەناڵە ئاسمانییەکانی تەلەڤزیۆنەوە دادەنیشن.

بۆ بەیانی ڕۆژی داهاتوو کە چوومە خوارەوە، بۆ چەند ساتێک هەڵوێستەیەکم کرد، بیرم لە باوکم کردەوە. سەیرێکی دەوروبەرم کرد، لە هیچ شوێنێکدا بەدیم نەکرد. دڵم پڕبوو، بۆ دەرناکەوێ.ئاخۆ لێم دڵگران نەبووە. چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کە کچە نازدارەکەی کارێکی وادەکات. بەرەو وێستگای پاسەکە ڕۆیشتم بینیم هانس لە ئۆتۆمبیلەکەیدا چاوەڕوانم دەکات. هاتە دەرەوە و دەرگاکەی بۆ کردمەوە. منیش ناچار سوار بووم. ماندوو دیاربوو، ڕیشی هاتبوو.

– دوو ڕۆژە کار ناکەم، ئەمڕۆش نیازم نییە کاربکەم، تەنیا هاتم بتبینم، دوا جار بیرت چوو ژمارەی تەلەفۆنەکەی ماڵەوەم بدەیتێ. دوێنێیش هاتمە ئەم ناوە بەو نیازەی بێمە لات، بەڵام

ڕێکنەکەوت و گەڕامەوە. پێری کە گەڕامەوە لەگەڵ سارا قسەم کرد، زۆر توڕەبوو، دوێنێ بە منداڵەکانمان وت. زۆر تێکچوون، دوو ڕۆژە کەسیان ناچن بۆ قوتابخانە.

نەموێرا یەک قسە بکەم، هەستم بە گوناهێکی زۆر دەکرد دەرهەق بە ژن و منداڵەکانی.

– بۆ قسە ناکەی؟

– پەلەت نەکرد؟ تۆ بەتەواوی بڕیاری خۆتت دابووکە جیاببنەوە؟

– ئەی چۆن! ئەی پێم نەوتی ناتوانم خیانەت لە سارا بکەم و بە دزییەوە پەیوەندیم لەگەڵ ژنێکی تر هەبێت.

– ئەی باشتر نەبوو من و تۆ وازمان لەم پەیوەندییەی بهێنایە؟

– ئەوەی لەنێوان من و تۆدایە پەیوەندی نییە بەڵکو خۆشەویستییە.

– بۆ تۆ زۆر زەحمەتە واز لەمنداڵەکانت بێنی.

– جا کێ دەڵێ من واز لە منداڵەکانم دێنم، من واز لە دایکیان دەهێنم. ئەوە ماوەیەکی دوورو درێژە وەک خوشک و برا دەژین.

– ئەی بۆ لەگەڵی باست نەکردووە؟

– نە ئەو باسی کردووە نەمن. ئەوەش تاوانی من نییە.

– با تاوانی هەردووکتانە. لەوانەیە تاوانی منیشی تێدابێت.

– نا ئەمە پەیوەندی بەتۆوە نییە، من کە تۆم خۆشویست هەستم کرد ئەوەی ئەم ساڵانە لە نێوان من و سارادا هەبووە، خۆشەویستی و عیشق نەبووە.

– ئەی چی بووە؟

هانس تەماشایەکی کردم، وەڵامی بۆ پرسیارەکەم پێبوو بەڵام هیچی نەوت.

– دەی زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە هەر باشە، ئێستا من و تۆ واز لە یەکتر دەهێنین و بگەڕێوە ناو خێزانەکەت.

هەرکە قسەکەم تەواوکرد ئیستۆپێکی گرت خەریکبوو ئۆتۆمبیلەکەی پشتەوە خۆی پێماندا بکێشێت.

– من واز لەم خۆشەویستییە ناهێنم، لەوەش زیاتر باسی ئەم مەسەلەیە ناکەین. من دەبێ زیاتر



قسەت لەگەڵ بکەم، ئەم ئێوارەیە دەتوانین دەرچین؟

– بۆ نایەیتەماڵەوە؟

– نا با ئەو کچەی میوانت بێزار نەکەین. سەعات چەند تەواو دەبیت؟

– باشترە تۆزێ درەنگتر یەکتر ببینین. سەعات هەشت باشە.

– باشە. لەبەر دەرگاکە چاوەڕوانت دەکەم.

داوام لێکرد پێش ئەوەی بمگەیەنێتە شوێنی کارەکەم دامبەزێنێ تا کەس نەمانبینێ، هەرچەندە بەلای ئەوەوە گرنگ نەبوو خەڵک پێکەوە بمانبینێ.

## 12

لەناوبردنی ئەم پەیوەندییە کە مانای ژیانی بەوان دەبەخشی، مەحاڵبوو. لە هەمان کاتدا شیرین لە ململانێیەکی بەردەوامدا بوو، دەیویست ئەم عیشقە لەبار بچوێنێ، بەڵام هانس بواری نەدەدا.

خۆشەویستی و ئازار وەک دووانە لەدایکبوون، هەر پێکەوەش گەورە دەبوون، فێری گرۆگاڵ و گاگۆڵکێ بوون، دەیانزانی ئەم پەیوەندییەی ئەمان لە دوو ڕەنگ پێکدێت، ڕەش و سپی یان سور و زەرد یان شین و سەوز، هەرکە تێکەڵ بە یەکتریبیان بکەیت ڕەنگێکی تر بەدەستەوە دەدەن. ئەو ڕەنگانەش ڕۆشنایی بەوان دەدەن. شیرین بیری لەوە دەکردەوە گەر ئەم پەیوەندییە کۆتایی پێبێنێ ئەوا ئەم دووانەی عیشق و ئازارە لەبار دەچوێندرێن، بەڵام ئاخۆ چ ئازارێکی گەورەتر لەدایکبێ، دڵنیاش نەبوو لەوەی کە خۆی لەبەر ئازارێکی وابگرێ. هانسیش لەو باوەڕەدابوو گەر خۆشەویستی بەردەوام گەورەببێ، ئەوا وردە وردە ئازار بەرەو کزی دەڕوات. ئەوکات تەنیا خۆشەویستی لە نێوانیاندا دەمێنێتەوە، شیرین لەم هاوکێشەیە تێنەدەگەیشت.

– لەو باوەڕەدانیم ئەو ئازارەی لەگەڵ ئەم خۆشەویستیەی ئێمەدا لەدایکبووە بەرەو نەمان بچێ. چۆن ! تەماشاکە منداڵەکانت لە تۆ خۆشنابن کە تۆ ئەوانت لەبەر کەسێکی تر بەجێهێشتووە. ژنەکەشت لێت نابورێ.

– دەزانم لێم خۆشنابن، بەڵام هەمووان لەگەڵ ئەو ئازارە ڕادێین. گەر ئەو خۆشەویستییە گەورەبێت هێندە هەست بەو ئازارە ناکەین، منداڵەکانیشم گەورەدەبن و هەریەکە بەژیانی خۆیانەوە خەریک دەبن.



– باشە گەر من دەرنەکەوتمایە لەو باوەڕەدابووی کە خۆشەویستییەکی لەم بابەتە لات دروست بوایە ؟

– ئەوەیان نازانم.

شیرین هەستی بەوە دەکرد بووەتە هۆی تێکدانی خێزانێک، خۆی وەک تاوانبارێک دەهاتە پێشچاو، زۆرجاریش سووکە دەمەقاڵەیەکیان دەبوو.

– گەر ئەم هەستە تەنیا لای تۆ دروستبوایە ئەوا هەرگیز کاری لە پەیوەندی من و سارا نەدەکرد. بۆیە ئەگەر مەسەلە خەتا بێت خەتای من و تۆ و ساراشی تێدایە هەریەکەمان بە نۆرەی خۆی دەورمان هەبووە. دڵنیا بە گەر هەستم بۆ سارا بە هێزبوایە، تۆ نەتدەتوانی کارم تێبکەی، بەڵام من لەرووی نەفسییەوە ئامادەی پەیوەندییەکی لەم بابەتە بووم.

ئەم قسەیە شیرینی خستە ناو دەریایەکی پڕ شەپۆلەوە، لەلایەکەوە قسەکەی بەڕاست دەزانی و لەلایەکی ترەوە نەیدەتوانی لە خۆی ببورێ. هەر کاتێ منداڵەکانی تەلەفۆنیان بۆ دەکرد شیرین مەزاجی تێکدەچوو. هانسیش هەستی بەمەکردبوو بۆیە هەوڵی دەدا کاتێ تەلەفۆنیان بۆ بکات شیرین لە ماڵەوە نەبێ.

لە یادم چوو باسی ئەوە بکەم کە هانس ماڵی جێهێلا و جیابوونەوەکەی ڕاگەیاند و هەر زوو خانوویەکی کری، ناونیشانەکەی لای کەس بەجێ نەهێشت. نزیکەی سێ مانگ بوو لەگەڵ شیرین پێکەوە دەژیان. شیرین گەرچی پێی وانەبوو تەنیا مارەبڕین ژن و پیاو بکات بە ژن و مێرد، بەڵام حەزی نەدەکرد بەو شێوەیە لەگەڵی بژی. خۆشی نەیدەزانی چۆن وا بەئاسانی خۆی دابەدەستەوەو گواستیەوە بۆ ماڵەکەی. لەوەی دەکرد هەموو تەمەنیان پێکەوە بەسەر بردبێ. شیرین لە گێژاوێکدا دەژیا و لە خودی خۆی نەدەگەیشت. کە گەڕایەوە چۆن دەتوانێ باسی مەسەلەیەکی وا لەگەڵ دایکیدا بکات. ئەی ئەگەر کەس وکاری بەمەیان زانی دەبێ هەڵوێستیان چی بێ. شەوان خەوی لێنەدەکەوت. زۆر جار لە نیوەی شەودا دەیویست جانتاکەی هەڵگرێ و بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی. هانس لەم مەسەلەیەدا ناچاری کرد و دەسەڵاتی پیاوانەی خۆی بەکارهێنا. شیرینیش خۆشیدەویست و حەزی نەدەکرد دڵی بشکێنێ.

شیرین خانووەکەی دابوو بە شارای هاوڕێی و سەری لێدەدا. ئەو شتانەی کە پێویست بوو بۆی دەکری. هەندێ جاریش کە شارا تاقەتی نەبووایە ئەوا شیرین بەفرسەتی دەزانی و لەگەڵ دەریادا دەچوونە دەرەوە. شارا تەواو لە ژیانی خۆی بێزاربوو، بەدرێژایی ڕۆژ لە ماڵەوە بوو، تەنیا دەریای

هەبوو بە ژیانەوەی ببەستێتەوە. ئەویش خۆی بۆ دایکی ئاشکرا کرد و کەوتە قسان بۆی. شارا لە قسەکانی کچەکەی دەترسا، لەو باوەڕەدابوو مەحاڵە منداڵ لە تەمەنی دەریادا وا جوان قسەبکات. زۆرجار باسی ئەمەی دەکرد و شیرینیش پێی دەوت کە کچەکەی ئەو هەر لەگەڵ گەورەدا ژیاوە بۆیە توانیویەتی قسەکانی گەورە هەڵگرێتەوە و فێری ببێت. لە لایەکی ترەوە ئەمە بەهرەیەکی خوداییە بەر ئەم کەوتووە.

لەو ماوەیەدا شارا دووجار بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ دایکی کردبوو. دایکیشی داوای لێدەکرد بگەڕێتەوە لای مێردەکەی و بەڵێنی پێدەدات لەم ڕووەوە قسە لەگەڵ باوکی بکات. شارا زۆر حەزی دەکرد بگەڕێتەوە، بەڵام ترسی لە باوکی هەبوو لەو باوەڕەشدا نەبوو کە دایکی بتوانێ یارمەتی بدات، چونکە باوکی پیاوێکی کەللە ڕەقەو قسەی دایکی بەفلسێک ناکڕێ.

شیرین داوای لێدەکرد گەڕانەوە بۆ ماڵی باوکی یان لای مێردەکەی لە مێشکی خۆی دەرکات. بەڵێنی بە شارا دا کە لەگەڵ هانس قسەبکات بەڵکو ئەو کەسێکی ناسراوی لە شارێکی تر هەبێت کار و شوێنی بۆ پەیدابکات، گەرچی هانس تا تەوقی سەری لە گرفتەکانی خۆیدا نوقم بووبوو. شیرین هانی هانسی دەدا بەردەوام منداڵەکانی ببینێ، دیاربوو منداڵەکانی زۆر تورەبوون لە باوکیان، بەتایبەتی کاترینا کە لە هەموویان گەورەتربوو، بەڵام ئاننا هەشت ساڵان بوو بەردەوام داوای باوکی دەکرد، کاتەریناش دەیوت:

– باوکم لەبەر ژنێکی تر دایکم و ئێمەی بەجێهێشت، بۆیە ئێمە نابێ بیبینین.

– نا من هەردەمەوێ باوکم ببینم، من ئەوم زۆر خۆشدەوێت، ئەو هەر باوکی ئێمەیە، ئەویش ئێمەی زۆر خۆشدەوێت.

ئاندەش لەولاوە هەڵی دایە.

– ئاننا ڕاست دەکات، جاری پێشوو کە ئێمەی بینی خێرا باوەشی پیاکردین، دوایش چوین نانمان خوارد، ئەو خانوویەکی کڕیووە و دەتوانین لای بمێنینەوە. هاوینیش پێکەوە بۆ کەنەدامان دەبات.

– من بەبێ دایە سەفەر ناکەم، ناشمەوێ لەگەڵ ئەوان بۆ هیچ کوێ بڕۆم. گەر ئەو ژنە ببینم لەوانەیە بیکوژم.

– جا ئەو هێشتا ژنی نەهێناوە، بابە هیچ باسی ژنێکی تری نەکرد، کێ دەڵێت ژن دەهێنێ.

– ئێوە منداڵن تێناگەن، بابە خۆی بۆ دایەی باسکردووە کە ئێستا ژنێکی تری خۆشدەوێت.



– ئەو ژنە کێیە؟

– نازانم. دایە دەیەوێ بزانێ کێیە.

سارا هەوڵیدا بزانێ هانس لەگەڵ کێ پەیوەندی هەیە، بەڵام هیچ هەواڵێکی ئەوتۆی دەست نەکەوت، چونکە ئەو ماوەیە شیرین و هانس نەدەچوونە دەرەوە، شیرینیش کاری نەدەکرد، هانس داوای لێکرد ماوەیەک واز لە کارەکەی بێنێ و پشوویەک بدات و ئاگای لە شارای هاوڕێی بێت. ئەویش زۆربەی کات لای ئەوان بوو. پێش گەڕانەوەی هانس دەهاتەوە ماڵێ، خواردنی ئامادە دەکرد. شارا ترسێکی خستبووە دڵی شیرینەوە.

– شیرین بەلامەوە سەیرە کە داوای لێکردووی واز لە کارەکەت بێنی.

– ئا تەنیا بۆ ماوەیەک، دیارە پێویستمان بەکات هەیە بۆ ئەوەی زێتر یەکتر بناسین، گەر هەردووکمان کاربکەین ماندوو دەبین. هانس لەو باوەڕەدایە کە من پێویستم بە پشوو هەیە و تۆش پێویستت بە یارمەتی من هەیە.

– نابێ هێندە خۆش باوەڕبین، لەوانەیە ئەو تۆی تەنیا بۆ ڕابواردن بوێ، ماوەیەک لە ژنەکەی بێزاربووە و دەیەوێ جەو بگۆڕێ.

– نا باوەڕناکەم بە قسەی خۆی ماوەیەکی زۆرە پەیوەندییان ساردی تێکەوتووە. بۆ منداڵەکانی نیگەرانە، لە سەرەتادا نەیاندەویست بیبینن. لەم دواییەدا هەردوو منداڵە بچووکەکەی بینیوە. بەڵام کچە گەورەکەی قسەشی لەگەڵ ناکات. هەفتەی ڕابردوو قسەیەکی سەیری کرد، سەرم سوڕما، بەڵام وام نیشان نەدا کە پێم ناخۆشە.

– چی وت، ئادەی.

– گوایە بەڵێنی بە منداڵەکانی داوە بیانهێنێ بۆلای خۆی و شەو بمێننەوە، جا بۆیە پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئەو شەوە من لای تۆ بمێنمەوە. گوایە جارێ نایەوێ منداڵەکان من ببینن، تا پەیوەندییان لەگەڵی ئاسایی دەبێتەوە.

باری دەروونیی تا دەهات خراپتر دەبوو، شیرینیش هەوڵی دەدا یارمەتی بدات. ئەو زۆر تاقەتی قسەکردنی نەمابوو، شیرینیش چەند جارێ داوای لێکرد کە پەیوەندییەکەیان کۆتایی پێبهێنێ و ئەویش بگەڕێتەوە ناو منداڵەکانی.

– تکایە جارێکی تر قسەی وامەکە، لەوانەیە وا هەست بکەی کە من گۆڕاوم، وا بیرمەکەرەوە. من بیرم بە منداڵەکانمەوە خەریکە. دەمەوێ ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە و پەیوەندیم لەگەڵیان ئاسایی

بێتەوە، دیارە ژیانی من بێ ئەوان مانایەکی وای نامێنێ. ڕاستە زۆربەی کات هەر سارا پێوەیان خەریکبوو، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە من منداڵەکانم کەمتر خۆشدەوێت، من زیاتر سەرقاڵی کارەکەم بووم. دیارە کاری پزیشکی هەروا دەبێت، هەموو جار دەمگوت، باشە سارا مامۆستایە.

– ئەی ئەگەر من بەشی پزیشکیم تەواوکرد چی دەڵێیت، گەر منداڵمان بوو کێ لای دەمێنێتەوە؟

– کەمنداڵمان بوو ئەوکات بڕیار دەدەین.

– نا من ئێستا دەمەوێ بزانم تۆ چی دەڵێیت.

– گەر کارەکەی تۆ وای پێویست کرد بەردەوامبی، ئەوا من دەمێنمەوە، هەرچەندە خۆشت دەزانی کە منیش پیربووم، تاقەتی بەخێوکردنی منداڵم نەماوە.

هانس ئەمەی وت و پێکەنی و لە ئامێزی گرت. ماوەیەکی زۆربوو گوێی لەو پێکەنینەی نەبوو بوو، دەیویست لە فرسەتێکدا قسەی لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی منداڵێک دروستبکەن.

شیرین خۆشی سەری لەوە سوڕمابوو کە چۆن هانس ئەوی ڕازی کرد بەبێ مارەبڕین لەگەڵیدا بژی، ئەو بەپێی دابو نەریت و ئایین لە پیاوێک مارە کرابوو، کەچی وەک ئاژەڵ هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد. بە جۆرێک هیچ ئایینێک زۆڵمی وا قەبوڵ ناکات.

شاراش زۆرجار پێیدەوت گەر تۆ کەسوکارت لێرە هەبوایە، یان کەسانێکی لای خۆمان تۆیان بناسیایە شاربەدەریان دەکردی و لەوێش کەسوکارتیان بەردباران دەکرد. شیرین بەهیچ جۆری باسی پەیوەندی خۆی و هانسی بۆ دایکی نەکردبوو.

– دایە گیان گەر شوویەکی تر بکەمەوە دەڵێی چی؟

– جا دەوێری کارێکی وابکەیت، دیارە ترسی ئەویترت لە دڵ دەرچووە.

– دەردێکی وای پێدام هەرگیز بیرم ناچێتەوە، بەڵام هەموو پیاوێک وەک یەک نییە.

– دەزانم کچم. بەڵام من لە تۆ زیاتر دەترسم، دڵم بەرگەی ئەوە ناگرێ شوویەکی تر بکەیت و جیابیتەوە. بەگوێی من دەکەی خەریکی خوێندنەکەت بە، ئەوەی کەمن نەمهێشت تەواوی کەیت. ئەوجا خوا گەورەیە.

– نا دایەگیان بەڵام من واز لە خوێندنەکەم ناهێنم، هەرچۆنێ بێت دەست بەخوێندن دەکەمەوە. جارێ دەبێ هەندێ کار بکەم و زمانی ئەم وڵاتە باشتر فێربم، بەڵێنت پێدەدەم کە واز لە خوێندن



ناهێنم.

شیرین لەگەڵ هانسیشدا باسی شووکردن و جیابوونەوەیان نەدەکرد. لەبەر ئەوەی نەیدەویست بیری خۆی بێنێتەوە کە ئەو لەگەڵ پیاوێکی ژندار دەژی و خێزانێکی تێکداوە. هەستی بەوە دەکرد کە دەبێ ڕۆژێک بێت ئەم پەیوەندییەش کۆتایی پێبێت.

پاش ئەوەی هانس ماڵی گواستەوە، باری دەروونیی سارا تێکچوو. تەنانەت کاریشی نەدەکرد. ئەوەی کە مێردەکەی ڕەدووی ژنێکی تر کەوتووە، زیاتر سارای دادەهاڕی. ئەگەر نا ڕەنگە ئازاری جیابوونەوەکە هێندە دڵتەزێن نەبوایە، سارا زۆر حەزی دەکرد بزانێ ئەم ژنە کێیە وا مێردەکەی داگیرکردووە. دایک و باوکی یارمەتیان دەدا. ڕۆژێک دایکی بەسارای وت:

– کچم ئەم کارەی تۆ زۆر هەڵەیە، هەموو دەرگاکانت لە خۆت داخستووە، هەر هیچ نەبێ لەبەرخاتری منداڵەکانت بە شێوەیەکی تر بیربکەرەوە، لە کاتی وادا دەبێ بەحیکمەتەوە بیربکەیتەوە.

– پاش ئەوەی خۆی پێی لێنا کە لەگەڵ ژنێکی تر دەژی، دەتەوێ بێدەنگ بم.

– نا من وا ناڵێم، بەڵام دەبوو تۆزێ بە سەبر بویتایە، تۆ خێرا دەرتکرد لە ماڵەکە و بەهیچ جۆری ناتەوێ بێت بەم ناوەدا. ئەمەش ناکرێ چونکە منداڵی هاوبەشتان هەیە.

– ئەوە چ دەڵێیت دایە تۆ خۆت بخەرە جێگەی منەوە، کە بابم ڕەدووی ژنێکی تر بکەوێ.

– لەکاتی وادا مرۆڤ دەبێت بە عەقڵ بیربکاتەوە نەک بە دڵ، هێمن بێت، بڕیاری بەپەلە و بێ بیرکردنەوە هەرگیز ئەنجامی باشی لێنابێتەوە. باشە دەزانی ئەو ژنە کێیە؟

– نا بۆ بزانم، ئەوە بۆ من هیچ گرنگ نییە.

– زۆرگرنگە، کە بزانی، چ شتێک لەو ژنەدا هەیە لە تۆدا نییە، چی وای لەو کردووە کە پاش ئەو هەموو ساڵە بەدوای ژنێکی تر بکەوێ.

– چیتە دەتەوێ بڵێیت خەتای من بووە کە ئەو کەسێکی تری خۆشویستووە، تۆش دیفاع لەو دەکەی.

# 13

زۆر بیری شارا و دەریا دەکەم، ئەمڕۆ سەرێکیان لێدەدەم. دەبوایە بەیانی بە هانسم بوتایە، نامەوێ بۆ سەرکار تەلەفۆنی بۆ بکەم. دەتوانم خواردن ئامادەبکەم و نامەیەکی بۆ بە جێبهێڵم. زۆر کەمتەرخەم بووم بەرامبەریان، چیبکەم هانسیش باری دەروونیی خراپە، هەندێ جار تاقەتی قسەکردنیشی نییە. ئەوە ماوەیەکە تۆزێ باشتر بووە، کە منیش لەماڵ نەبم تەواو تووڕە و بێتاقەت دەبێت، من خۆم پێویستم بە یەکێک بوو یارمەتیم بدات، کەچی ئێستا دەبێت خەمی ئەو بخۆم. تا شارام لەگەڵدابوو دەبوایە بیرم لای بوایە، ئێستاش هانس، وام دەزانی لەگەڵ هانسدا بژیم هەموو خەمەکانم بیردەچێتەوە، کەچی خەمی تر لەدایک دەبێ. ژیانیش سەیرە لەو باوەڕەدا نەبووم بتوانم لەگەڵ پیاوێکی تردا بژیم. بە هیچ جۆرێک کارێکی ئاسان نییە، تەماشاکە لە زۆر شتدا بڕوا بە هانس ناکەم، یان بەراوردیان دەکەم، ترسی ئەوەم هەیە ئەمیش وەک ئەو بێت، زۆر بە ترسەوە لەگەڵی دەخەوم، لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەم، لە سەر جێگە هەست بە دڵنیایی ناکەم. هەر کاتێکیش داوای سەر جێگەم لێدەکات، لە ترسدا غەرق دەبم. هەست و نەست و خۆشەویستی سەرتاپای جەستەم جێدەهێڵێ. بە زۆر خۆم ڕادەگرم تا هاوارنەکەم و گیانم نەکەوێتە لەرزین، ئەویش هەستی بەمە کردووە کە تێکدەچم. زۆر هەوڵی داوە قسەم لەگەڵ بکات سەبارەت بە تاقیکردنەوەی سێکسی لەگەڵ مێردە کۆنەکەم، بەڵام کە هەست دەکات نامەوێ ئەو شتانە بدرکێنم زۆرم لێناکات و بێدەنگ دەبێت. تەنیا ئەوەندە دەڵێت کە دەبێت بەسەر ئەو ترسەمدا زاڵبم،



هەربۆیە ناوی پزیشکێکی دەرونیی پێمدا تا کاتێک وەرگرم و بچمە لای.

– منداڵەکان باشتر بوون، ئەمەش باری من سووکتر دەکات. گەر وا بڕوات هەوڵدەدەم تۆیان پێبناسێنم، تا هەندێ جار پێکەوە بچینە دەرەوە.

– وابزانم پەلە نەکەین باشترە، ئەو شتانە کاتی دەوێت. هێشتا سێ مانگێکی ترتان ماوە تا بڕیاری یەکجارەکی بدەن.

– مەبەستت لەم قسەیە چییە؟ دەزانی تۆ زۆر بێعەقڵی، تۆ دیارە هەستت نییە، ئەم هەموو خۆشەویستییەی من نابینی. ئەم خۆشەویستییە وای لێکردم کە دەستبەرداری خێزانەکەم بم، ماڵ جێبهێڵم، کەچی هەموو ئەمانە نابینی، بە بڕیاری یەکجارەکی دانانێیت.

– مەبەستم ئەوە نەبوو بریندارت بکەم، بەڵام بەلامەوە سەختە لەبەر من وازت لە خێزانەکەت هێناوە.

– لەبەر تۆ نا بەڵکو لەبەر خۆم، لەبەر ئەو هەستەی کە لە دەروونمدا دروست بوو، ئەوەش لە دەسەڵاتی مندا نەبوو، دیارە هەموو ژیانم چاوەڕوانی هەلی لە دایکبوونی هەستێکی وام دەکرد.

– دڵنیای ئەو هەستە کاتی نییە؟

– دیارە تۆ دڵنیانیت لەو هەستەی خۆت، دەپێم بڵێ وایە یان نا؟

– نا وانییە، ئەو هەستە لێدانی دڵمە، مەگەر لەگەڵ وەستانی دڵمدا کۆتایی پێبێت.

– ئێ تەواو لەوە زیاتر چەنەبازی مەکە و گێل مەبە. وەرە باوەشمەوە، لەوەش زیاتر تووڕەم مەکە و جارێکی تر قسە لەم بابەتە مەکە.

هانس ڕاست دەکات من لەم پەیوەندییەم زۆر دوو دڵم، خۆشم نازانم چۆن بڕیاری یەکجارەکی بدەم، کەسێکیش شک نابەم قسەی لەگەڵ بکەم.

– چۆن کەس شک نابەی کچی خۆم، ئەی ئەوە من نیم هەر دەم ئاگام لێتە.

– ئەوە تۆی باوکە گیان، ئای چەند بیرم دەکردی، ئەی لە کوێ بووی ؟ بۆ سەرت لێنەدەدام؟

– کچم من بەردەوام لە دەوری تۆم، بەڵام تۆ سەرقاڵ بووی.

– باوکە من هەردەم تۆم لە خەیاڵبووە، زۆریش پەیوەندیم بە تۆوە هەبووە، ئێستاش زۆر نیگەرانم، نازانم چی بکەم.

– مەبەستت چییە؟ کام نیگەرانی؟

– نازانم... زۆر دوو دڵم، زۆرم خۆشدەویت، بەڵام ویژدانم زۆر ئازارم دەدات، ئەو خێزانی هەیە.

– تۆ سەرت لەو تێکنەداوە، گەر خۆشەویستییەکە یەکتەرەفە لای تۆوە بوایە، ئەوا هەرگیز ئەو گوێی بە تۆ نەدەدا. دیارە ئەو هەستە لای ئەویش پەیدا بووە.

– تەماشاکە باوکە، گەر من ڕازی نەبوومایە، هەر هیچ نەبێ وازی لە ژن و منداڵەکانی نەدەهێنا.

– ئەو کاتەش هیچ لایەکتان بەختەوەر نەدەبوون، بۆنموونە گەر تۆش پەیوەندیت لەگەڵ نەبوایە، هانس نەیدەتوانی درێژە بە هاوسەرێتی لەگەڵ ئەو ژنەدا بدات.

– زۆر جار بیر دەکەمەوە سەری خۆم هەڵگرم و بڕۆم، بەڵام ناکرێ ئەمجارەش لە کەسێکی تر خۆم بشارمەوە. دوای ئەوە دۆزینەوەی کار لە شوێنێکی تر هێندە ئاسان نییە. منیش بەبێ کار ناتوانم بژیم. بەردەوام دەبێ یارمەتی دایکم بدەم.

– کچم تۆ زۆر قوربانیت بۆ دایک و براکانت داوە، بەڵام دایکت بێ قەزابێت، بێ ئەم شووکردنەی تۆش ژیان بەڕێوە دەچوو، لە برسانا نە دەمردن.

– هەرگیز نەمدەهێشت لە برسانا بمرن، یان براکانم بێ داوودەرمان بن. بەڵام دایکم سەیر بوو ترسێکی زۆری لێنیشتبوو.

– دایکت، خەجیج خان کەوتە بنکلێشەی و ڕازی کرد، زۆر درۆ و دەلەسەشی کردبوو، بێ ئەوەی ئەو کوڕە بناسێ مەدحێکی زۆری کردبوو. ئەگینا ئەو نیازی شتی وای نەبوو.

– دیارە وابووە، ئەمجارەی دوایی کە تەلەفۆنم بۆکرد وتی خوا خەجیج خان بگرێ کە ئەم کارەی پێکردم، ئیتر منیش لەوە گەیشتم کە ئەو دایکمی هانداوە بە شووکردنەکەم قایلبێت.

– من هەرگیز لەدایکت خۆشنابم کە ئەمەی بەتۆ کرد.

– نا بابە گیان وامەڵێ، دایکم ناچاربووە، دەزانی وەزع چۆن بوو لەم ساڵانەی دواییدا. نەتدەزانی سبەی چ ڕوودەدات. دایکیشم ناحەقی نەبوو زۆر دەترسا. گەر براکەم بمایە هەرگیز وامان بەسەر نەدەهات.

– ئەویش هەر خەتای دایکت بوو، چۆن ڕێگای دلێری دا تێکەڵ بە سیاسەت بێ.

– بابە، دلێر گەورە بوو بوو، دایەش حەزی نەدەکرد سەری بخاتە سەر. یان لێی بپرسێ بزانێ لە



کوێیە، یان بۆ کوێ دەڕوات. ئەویش زۆر لەگەڵ ماڵی خاڵوانماندا تێکەڵ دەبوو، ئەوانیش هەر خەریکی سیاسەت بوون، خۆ دوو کوڕی پووریشم شەهید کران.

– دەبینی تۆش تیا چوویت و براکەشت لەناوچوو.

– ئیتر وابوو بابە گیان، لەو زروفەدا گەنجێک خۆی دووره پەرێز بگرتایە. بە ترسنۆکیان لە قەڵەم دەدا.

– نەدەبوو دایکت ڕێگەی بدایە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە تێکەڵ بووایە.

– نەیدەتوانی، بەتایبەتی خۆی بە گەورەی ماڵ دادەنا. دایکیشم ئازاری زۆرچەشت، زۆر تەنیا بوو، تەنانەت نەنەش لامان نەما. کە بیر لە ژیانی خۆمان دەکەمەوە دڵگران دەبم، دەمەوێ نهێنییەکت بۆ بدرکێنم. ئێستا... بەبێ مارەبڕین لەگەڵ هانسدا دەژیم.

– دەزانم کچم، ئەوەش پەیوەندی بە بۆچوونی خۆتەوە هەیە. خۆت سزای ئەو گوناهە دەدەی.

– کام گوناه، خۆ من لەو کابرایەی تر مارە بڕابووم، ئەوەی نەکرا پێیی کردم. ئەی کێ سزای ئەو گوناهە دەدات. بە پێیی یاسا و شەرع ژنی بووم، کەچی وەک دڕندەیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکردم.

– هەر کەسە و سزای خۆی وەردەگرێ.

– کێ سزامان دەدات؟

– خوا.

– کام خوا، ئەو خوایەی کە هێندە ناعادیلە مرۆڤ تەحەمولی ناکات.

– ئەمجارەش شەکرەکەت شکاندەوە.

ژوورەکە بووە پارچەیەک لە دوکەڵی سپی و باوکم لەناو ئەو دوکەڵەدا ونبوو. هەرچەند هاوارم کرد باوکم بەجێیهێشتم، بێ ئەوەی قسەکانم تەواوبکەم. پەنجەرەکەم کردەوە تا دوکەڵەکە بچێتە دەرەوە.

ئەو ڕۆژە چوومە لای شارا و دەریا. ئەوانیش زۆر لە من خراپتربوون. شارا زۆر بێ ورە و ڕەشبین بوو، بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی، بەڵام لای من نەیدەوێرا ئەوە ئاشکرابکات. دەریا ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو، بەدایکی دەگوت کە نابێ بگەڕێتەوە لای دایە گەورە و بابەگەورە.

بڕیارمان دا ئێوارەکەی بچینە دەرەوە. تەلەفۆنم بۆ هانس کرد تا بمانگەیەنێتە شوێنێک، نانی ئێوارە بخۆین. ئەویش ئەمەی پێخۆشبوو، تا ئەو هەلە بقۆزێتەوە سەرێک لە منداڵەکانی بدات.

– دەریا ئەمڕۆ من و دایکت زۆر قسەمان هەیە، تکایە تۆزێ بێ دەنگ بەو. سەرمان لێ مەشێوێنە.

– گەر بارێکی ئاساییم دەبوو دەریام دەبردە لای دکتۆرێکی پسپۆر و شارەزا، ئەم کچەی من پێش تەمەنی خۆی کەوتووە.

– جا گەر ئەمەت بکردایە ناوی دەکەوتە ماسمیدیا و ئاشکرادەبوون.

– ناناموەوێ کەس دایە بدۆزێتەوە، هەر ڕۆژنامەکان بە کوشتنی دەدەن.

– نا دەریا گیان کەس ناتوانێ دایە بکوژێ، خۆ کاری وا هێندە ئاسان نییە.

– گەر ئاسان نییە ئەی بۆ خۆت دەشاریتەوە. دەزانم قسەت لەگەڵ دایەگەورە کرد. دەتەوێ بتکوژن.

– نا کچم کەس نامکوژێ.

– بە ڕاست قسەت لەگەڵ دایکت کرد؟

– چەند جارێ قسەمم لەگەڵ کرد، کاتێ بوو کەس لەماڵەوە نەبوو.

– چۆن کاری وا دەکەیت، لەوانەیە زۆر بەئاسانی شوێنەکەت بدۆزنەوە.

– ئەوە گرنگ نییە، بڕیارم داوە کە بگەڕێمەوە، لەوە زیاتر نامەوێ بەمجۆرە بژیم. لایەنە لێپرسراوەکان بە هیچ جۆری چارەسەرێکمان بۆ ناکەن، تا کەی بەم جۆرە بژیین. خۆ من تەنیا نیم. ئەم منداڵە گوناهی چییە بەم جۆرە بژی.

– دایە چەند جارم وت خەمی منت نەبێ.

– چۆن خەمی تۆم نەبێ کچم، تۆ دەبێت لە بارێکی ئاسایی و لەگەڵ هاوتەمەنی خۆتدا بژیت، من وا هەست دەکەم لەگەڵ گەورەیەکدا دەژیم، گەر لە زروفی ئاساییدا گەورەبای هەرگیز وانەدەبوویت.

– من هیچم نییە دایە گیان، تەنیا ئەوەندە نەبێ لە منداڵانی هاوتەمەنم زیرەکترم.

– ڕاست دەکات شارا، ئەم منداڵەی تۆ بەهرەمەندە. نەک هەر ئەوەی زوو فێری قسەکردن بوو، بەڵکو لە بیرکردنەوەشدا بەهرەمەندە.

– ئیتر لەمە زیاتر ناتوانم غەدرت لێ بکەم. ناچارم مل بە شەرتەکانیان بدەم، تا چیتر ژیان لە تۆش تێکنەدەم. بەڵێن بێت هەرگیز نەیەڵم کەس ئازارت بدات، گەر ژیانیشم لەسەر دانابێ، دەبێ



وەک مرۆڤێکی ئازاد بژیت.

– دایە گیان جارێ هێندە خەمی منت نەبێ، من گەورە دەبم و بەڵێنت دەدەمێ کەس نەتوانێ تۆزقاڵێ غەدرم لێبکات.

– گوێت لێیە ئەم کچەی من چۆن قسەدەکات و بیر دەکاتەوە، هەر وەک گەورەیەک وایە. هەر کەسێک گوێی لەم قسانەی بێت وا دەزانی بیست ساڵانە.

– لەبەرئەوە هێندە خەمی ئەوت نەبێت، بیر لەخۆت بکەرەوە، گەر بگەڕێیتەوە کێ دەڵێ فرسەتت لێناهێنن و ناتکوژن، ئەو کات کێ ئاگای لە دەریا دەبێت. لەو باوەڕەشدانیم دەریا بۆ ساتێ چییە بتوانێ لەگەڵ ئەواندا بژی.

– نا دایکم بەڵێنی پێداوم قسە لەگەڵ باوکم و مێردەکەمدا بکات و بەڵێنیان لێوەرگرێ کە ئازارم نەدەن و ڕێگام بدەن دەست بکەمەوە بە خوێندن. دایکم خۆی بەڵێنی پێدام تا من لە قوتابخانە دێمەوە ئاگای لە دەریا بێت.

– ئاخر شتەکان لەدەست دایکتدا نەماون، خۆ لەسەرەتاوە گەر بەگوێی دایکتیان بکردایە تۆ وات بەسەر نەدەهات.

– ڕاست دەکات دایە گەورە لە تۆ گوناهترە، ئەویش زۆر ئازاری چەشتووە.

– کە گوێم لەم قسانەی دەبێ ترس دام دەگرێ، ئاخر کچم تۆ لە کوێ ئەم شتانە دەزانی.

چاوێکم لە دەریا سوورکردەوە.

– بیر لەوە بکەرەوە کە ئەو هەموو کات لەگەڵمان بووە و بەردەوامیش گوێی لە قسەکانمان بووە، لەیادتە هەر خۆت زۆرجار دەتووت کە سەیری چاوی دەکەم سەیرمان دەکات وا دەزانم لە قسەکانمان تێدەگات.

– ڕاست دەکەی ئەو کاتەش لام ئاسایی نەبوو، بەڵام من خۆمم لێ گێل دەکرد.

– ئێستا واز لەم مەسەلەیە بێنە، پێم بڵێ بەڕاست نیازتە بگەڕێیتەوە.

– بەڵێ بە ڕاستمە. لەم ژیانە بێزاربووم، تۆزقاڵێ ڕووناکی نابینم. بیرکەرەوە تاکەی من دەتوانم بەمجۆرە بژیم. ئەو بەڵێنانەشی کە داویانە جێبەجێنەبوون. تەنیا ئەوەندە نەبێ کە من و کچەکەمیان شاردووەتەوە و دەمانژێن. ئەوان لەسەرەتاوە بەڵێنیان پێدام کە بمنێرن بۆ شارێکی تر، تا ئێستا هیچ شتێکیان نەکردووە.

– خۆ منیش گەر یارمەتی ئەو ژنە سویدییە نەبوایە هەرگیز بەم شێوەیە کارم دەست نەدەکەوت. دەڵێی چی بە هانس بڵێم، بەڵکو ئەو کەسێک لە شارێکی تر بناسێ و بتوانێ یارمەتیت بدات.

– تکا دەکەم زوو ئەم کارە بکە بەڵکو دایە بیر لە گەڕانەوە نەکاتەوە.

– ئەوەش هێندە ئاسان نییە. کاتی دەوێت، دوای ئەوە ئەویش ئێستا بە دەردی خۆیەوە خەریکە، لەکوێ فریا دەکەوێت بیر لە من بکاتەوە.

– جارێ چاوەڕوان بکە، زۆرت تەحەممول کردووە، ئەم یەک دوو مانگەش بوەستە، من بەجیدی قسەی لەگەڵ دەکەم، بابزانین چی دەڵێ.

– خۆ هەر کارەکە گرفت نییە، ئەی شوێنی ژیان، ئەی باخچەی ساوایان بۆ کچەکەم.

– دایە گیان ئەوە گرنگ نییە من دەتوانم هەر لەماڵەوە بمێنمەوە، خۆت ناڵێیت ئەم کچەی من بەقەد بیست ساڵییەک دەزانێ. کەسێکی بیست ساڵان دەتوانێ بە تەنیا لەماڵەوە بێت.

– دیسانەوە دەستت بە قسە زلەکانت کردەوە، چییە تۆش دەتەوێت مێشکم تێک بدەیت.

– ببورە، ئیتر قسە ناکەم.

– هەر ئەوە نییە کچم، من زۆر تەنیام، من لە خێزانێکی گەورەدا بووم، لە نێوان خزم و ناسیاواندا، کەچی ئێستا خۆم بە تەنیا دەبینم و دەشترسم تا مردن بەمجۆرە ژیان ببەمە سەر و دایک و براکانم نەبینم.

– شارا خان پەلە مەکە، خۆ ژیان هەر وا نابێ، بەڵکو کارێک بدۆزیتەوە و ماڵەوەشتان بێنەوە سەرخۆ و تۆزێ بەخۆیاندا بێنەوە.

– کار دۆزینەوە گرانە. ماڵەوەشمان زەحمەتە بگۆڕێن، بزانم بە ئاسانی لێم خۆشدەبن، هەر ئەمڕۆ دەگەڕێمەوە.

– تۆ دەبێت کاتێ بگەڕێیتەوە کە ژیانت لەدەست نەدەیت. تکایە لەم بڕیارە پەلەمەکە. دەریاشت بیر نەچێ.

ئەو ئێوارەیە زۆر قسەمان کرد، خەمی هەردووکمان بە هیچ کەسێک هەڵناگیرێ. منێک کە بۆ یەکەمین جار دەکەومە داوی خۆشەویستی کەسێکەوە، بەڵام کەسێکی هەڵە. ئەویش پاش هەڵاتن و چەشتنی ئەو هەموو ئازارە دەیەوێ بگەڕێتەوە زیندانەکەی جارانی، دیارە گەیشتۆتە کۆڵانێکی بنبەست. دەریاش هەوڵی دەدا خۆی لەقسەکانمان هەڵنەقوڵتێنێ. بەڵام کە سەیری چاوەکانیم دەکرد،



هەموو ئەو ڕستانەم دەخوێندەوە کە بیری لێدەکردەوە. دەریا بلیمەت بوو. جاران بڕوام بە زیندوو بوونەوەی ڕۆح نەبوو، تا ئێستا دەریا ئەو ڕاستییەی بۆ باسنەکردووم کە ڕۆحی کێ لەودا زیندووبووەتەوە، ئەی ئاخۆ بۆ دەبێ هەربەکە لە ئێمە هەست بە زیندوو بوونەوەی ئەو ڕۆحە نەکات، بڵێی دەریا نەبێ بە پێغەمبەرێک. ڕەنگە پێغەمبەرێکی ژن جیهان بە شێوەیەکی تر بگۆڕێ.

گرنگ ئەوەیە دەریا کار لە دایکی بکات، لەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە پەلە نەکات، هەر ئەو شەوە دڵنیام کرد کە بە زووترین کات قسە لەگەڵ هانس دەکەم یارمەتی بدات. ڕێزانیش بەو زووانە لە وڵات دەگەڕایەوە، بۆیە پێم وت لەوانەیە ڕێزانیش بگەڕێتەوە و لای ئەو بژی، ئەمەم وت تەنیا بۆ ئەوەی تۆزی دڵنیای کەم لەمەودوا بە تەنیا ناژی. خۆ من حەزم نەدەکرد بەجێی بهێڵم، دەمویست هەر لەگەڵ ئەودا بژیم. هانس ڕازی نەبوو کە بە جیا بژین، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە ژن و منداڵەکانی بەجێهێشت، نەدەبوو منیش بەتەنیا جێیبهێڵم، جگە لەوەش ئەمە هەلێکی باشە کە زیاتر یەکتر بناسین، ئەوەی لە وڵاتی خۆمان باوە هەڵەیە، دوو کەس دەبنە ژن و مێرد بێ ئەوەی یەکتر بناسن، هەرچۆنێ بێ شێوەی ژیانی ئەم وڵاتانە مانایەکی ئینسانی تری هەیە. کە ئەو دوو کەسە پێش شووکردن پێکەوە بژین و یەکتر بناسن، ئەوا ژیانی داهاتوویان وەک ژن و مێرد ئاسانتر دەبێت. هەرچەندە ئەمەش پێوەر نییە ئەوەتا هانس و سارای ژنی پاش ئەم هەموو ساڵەی کە پێکەوە ژیاون، ئێستا لێک جیادەبنەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەم بۆ هانس وا هەست ناکەم کە ئەم پەیوەندییەمان بەردەوام بێت. لەم ڕۆژانەدا ئەو زۆر نیگەران دیارە، گاڵتە و قۆشمەکانی جارانیشی نەماوە، ڕوونیشی ناکاتەوە هۆی ئەم نیگەرانییەی چییە. دەزانم بەشێکی زۆری پەیوەندی بە منداڵەکانییەوەیە، بۆیە کە داوای لێکردم پێکەوە سەفەرێک بکەین.

– بۆ لەگەڵ منداڵەکاندا سەفەرناکەی، لەوانەیە ئەمە یارمەتیتان بدا کە پەیوەندیتان ئاسایی بێتەوە.

– باوەڕناکەم ئەوان ئێستا بیانەوێ لەگەڵ مندا سەفەربکەن و دایکیان بەجێبهێڵن، چونکە زۆر گلەییم لێدەکەن و زۆر زوێرن.

– وەک پێشنیارێک پێیان بڵێ بزانە چی دەڵێن.

بە گوێی کردم لە سەرەتاوە ڕازی نەبوون، پاشان بە تەلەفۆن لێیان پرسی بوو ژنە تازەکەشت دێت

له گەڵمان.

– نا ئەو نایەت، ئەمەش پێشنیاری ئەوە کە من لەگەڵ ئێوە سەفەربکەم. ئەو ژنە زۆر میهرەبان و دڵفراوانە، گەر ببیبین خۆشتان دەوێ.

کولتوور رۆڵێکی گەورە دەبینن لە دیاریکردنی کەسایەتی مرۆڤدا، تەنانەت هەندێ جار سنووری خۆشەویستیش دەسڕنەوە. من و هانس چەندە یەکتریمان خۆشدەوێت، بەڵام لە هەندێ رووەوە بە یەکتر نامۆین، ئەو بەهیچ جۆری حەزی لە مۆسیقا و گۆرانی ئێمە نییە، منیش هیچ لەزەتێک لە گۆرانی سویدی وەرناگرم، زۆر شتمان جیاوازە، کە باسی پەیوەندی خێزانێتی خۆمانی بۆ دەکەم سەری ڕادەوەشێنی، بەتایبەتی سەبارەت بە ژنهێنان و شووکردن، یان ئەوەی کە کچانی لای خۆمان بەر لە شووکردن هەموو جۆرە پێوەندییەکی خۆشەویستی و سێکسی لێ قەدەغە کراوە. ئەو تەنیا حەزی لە خواردنی ئێمەیە، دڵێ پیاوی رۆژهەڵات بەختەوەرن کە ژنەکانیان هێندە خزمەتیان دەکەن، من لەبەر ئەوەی ماوەیەک بوو لە ماڵەوە بووم زۆر خەریکی دەبووم و هەموو کارو باری ناوماڵم دەکرد، ئیتر باسی شەڕەکانی خۆی و سارای بۆ دەکردم، منیش دەمووت کاتێک کاربکەم و منداڵمان بێت دەبێ بەشێک لە کارەکانی ناوماڵ وەئەستۆ بگری، ئەگینا منیش شەڕت لەگەڵ دەکەم، بە پێکەنینەوە دەیوت : نا نا نامەوێ کاربکەیت و منداڵت ببێت. کە زانی من قسەکەیم پێناخۆشە خێرا باوەشی پیاکردم. " گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، من دەمەوێ هەر ئەمساڵ منداڵێکمان بێت و لە شاییەکەماندا بەشداری بکات."



# 14

سارا دەیویست ئەو ژنە بدۆزێتەوە کە مێردەکەی لەگەڵی دەژی. کۆششێکی زۆری کرد، بەڵام هیچ زانیارییەکی لەمەڕ چنگ نەکەوت. پرسیاری لەو کەسانە دەکرد کە لەگەڵ هانس کار دەکەن، کەس نەیدەزانی پەیوەندی لەگەڵ کێدا بەستووە. ئەم مەسەلەیە سارای ماندووکردبوو، هەربۆیە زوو دیدکتیڤێکی تری دۆزییەوە تا وەک دەلاڵ وەکاری بخات و بە سەر مێردەکەیەوە جاسوسی بۆ بکات.

ئەو ئێوارەیەی کە دێدەکتیڤەکە تەلەفۆنی کرد کاتەرینا وەڵامی دایەوە. کە دایکیشی قسەی لەگەڵ کرد خێرا لەسەر کاتی دیدار ڕێککەوتن.

منداڵەکان ترسی ئەوەیان لێنیشت کە دایکیشیان پیاوێکی تر بدۆزێتەوە. گەر دایکیان کارێکی وابکات ئەوە هیوای گەڕانەوەی دایک و باوکیان زۆر کەم دەبێتەوە. منداڵەکان بیریان لەوە دەکردەوە کە دایک و باوکیان لەیەک نزیک بکەنەوە.

ڕۆژێک هەرسێکیان پێکەوە دانیشتبوون و بیریان لەوە دەکردەوە چی بکەن بۆ ئەوەی دایک و باوکیان ئاشت بکەنەوە.

ئاننا سەیرێکی کاتەرینا و ئەندەشی کرد.

– من دەتوانم خۆم نەخۆش بخەم.

– چۆن خۆت نەخۆش دەخەی، بابە خۆی دکتۆرە، دەتوانی ڕاستیەکە بزانێ.

– دەتوانم وا لە خۆم بکەم کە توشی شۆک بووم و توانای قسە کردنم نەماوە.

– ئەمەیان باشە، ئەو کات دەڵێن بەهۆی جیابوونەوەکە توشی شۆک بووە. لەوانەیە باوکم ناچاربێت بگەڕێتەوە و ئەو ژنە بەدبەختە جێبهێڵێ. تۆ دەڵێی چی؟

– بیرۆکەیەکی خراپ نییە، بەڵام نابێ کەس بەمە بزانێ.

– کەی و چۆن دەست بکەین. ئاننا زۆر دڵی خۆشبوو، هەستی دەکرد کە بەهۆی ئەم بیرۆکەیەی ئەمەوە دایە و بابە دەگەڕێنەوە بۆ یەکتری.

بۆ ڕۆژی دوایی کە سارا چوو منداڵەکانی لەخەو هەڵسێنێ، ئاننا بە هیچ جۆرێ ڕازی نەدەبوو لە خەو هەستێ، یان قسە لەگەڵ دایکی بکات. سارا پرسیاری لێدەکرد ئەویش وەڵامی نەدەدایەوە. ئەندەش و کاتەریناش لە درزی دەرگاکەوە سەیریان دەکرد و دەیانبینی خوشکەکەیان دەوڕێکی زۆرباش دەبینێ، خێرا دەستیان کرد بە پێکەنین و ڕایانکردە ژوورەکەی خۆیان.

سارا تەواو شڵەژاو چووە ژوورەکەی کاتەریناوەو داوای لێکرد تەلەفۆن بۆ ئەمبوڵانس بکات. کاتەریناش وتی:

– تەلەفۆن بۆ بابە دەکەم، ئەو خۆی دکتۆرە.

– ئاخر من تەلەفۆنی ماڵەکەیم نییە.

– من ژمارەی مۆبیلەکەیم هەیە.

کە زەنگی بۆ باوکی لێدا دیاربوو تازە لەخەو هەستابوو. شیرینیش وەک هەموو بەیانییەک نانی بۆ ئامادەکردبوو. کە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و قسەی کرد یەکسەر شڵەژا. بە کاتەرینای وت هەر ئێستا دەگاتە لایان.

کە تەلەفۆنەکەی داخست، خێرا دایکی لێی پرسی لەوەی دەکرد لەگەڵ کەسێکدا بژی.

– ئا وابزانم قسەی لەگەڵ ژنێکدا دەکرد. گوێم لە شڵپەی ماچێکیش بوو.

– هەردەبێ بزانم ئەم ژنە بێ ئەخلاقە کێیە. دوای پیاوێکی منداڵدار کەوتووە.

هێندەی نەبرد گەیشتە لایان، خۆی کرد بە ژوورەکەی ئاننادا. سارا لەوێ بوو.

– چی بووە ؟ کەی وایلێهات؟

سارا وەڵامی نەدایەوە و ژوورەکەی بەجێهێشت. خێرا کاتەرینا و ئەندەش هاتنە پێشەوە لە باوکیان.



– دیارە ئەم بەیانیە کە دایە لە خەوی هەستاندووە، هیچ قسەی نەکردووە.

– هیچ شتێک ڕوویداوە، یان کەسێک عاجزی کردووە.

– نا دوێنێ پێش ئەوەی بخەوێ زۆر گریا، داوای تۆی دەکرد، من و ئەندەشیش نەمانوێرا بە دایە بڵێین. حەزمان نەکرد تۆش بێزار بکەین.

– قسەی هیچ، من چۆن بێزار دەبم، ئێوە بۆ من لەهەموو کەس گرنگترن.

– لەژنە تازەکەشت؟

– ئەوە جارێ نەبووە بەژنم، بەڵام ئەوە بزانن ئێوە بۆ من زۆر گرنگن.

هانس خێرا ئاننای لەباوەش گرت و سەری خستە سەرشانی و دەستی بە پشتیا دەهێنا. ئانناش لە پشتەوە چاوێکی لە ئەندەش و کاتەرینا داگرت، ئەوانیش پەنجە گەورەکەیان بۆ بەرزکردەوە وەک هێمای سەرکەوتنی پلانەکەیان.

– بابە ئێستا چی بکەین؟

– تۆزێ هێمنی دەکەمەوە پاشان تەلەفۆن بۆ نەخۆشخانەیەک دەکەم.

– بابە نانت خواردووە؟

– نا کچم. کاتێ کە تەلەفۆنت کرد بە نیازبووم دەست بە نانخواردن بکەم. – خواردنەکە لەسەر مێز بوو وانییە؟

هانس سەرێکی ڕاوەشاند و چاوەکانی پڕ لە خەم بوون.

– هەرئێستا دەچم خواردن دەهێنمە سەرەوە، بەڵکو ئانناش شتێک بخوات.

هانس دەستی بەسەری ئاننادا دەهێناو چاوەکانی پڕ لە فرمێسک ببوون کە ئاننا باوکی بەمجۆرە بینی زۆر دڵگران بوو، هێندەی نەمابوو نهێنییەکە ئاشکرابکات، لەولاوە ئەندەش چاوێکی لێداگرت، کە کاری وا قۆڕ نەکات.

– بابە ئاخۆ هۆی چی بێت وای لێهاتبێ؟

– نازانم کوڕم. ئەتوانی دایکت بانگ بکەیت.

ئەندەش چووە خوارەوە تا دایکی بانگ بکات، ئەویش لەموتبەخەکە دانیشتبوو دەگریا، کاتەریناش نانی بەیانی ئامادە دەکرد.

هەر کە دایکیان چووە سەرەوە کاتەریناو ئەندەش دەستیان دا بەیەکداو وتیان سەرکەوتین.

– دەزانی ئەندەش، ئاننا ئەوەندە زیرەکە. دەڵێی ئەکتەرەو ڕۆڵ دەبینێ.

– دەزانی خەریک بوو قسەبکات، بەڵام من خێرا چاوم لێداگرت.

– دەترسم تا سەر تەحەممول نەکات، بۆیە باشترە ئێمە خۆمانی لێ دووربگرین.

– دەی خێراکە خواردنەکە ئامادە بکە، پێکەوە لە ژوورەکەی ئاننا نانەکە دەخوێن. هیچ نەبێ ئەمڕۆ نەمان هێشت لەگەڵ ژنە تازەکەی نان بخوات.

بەدەم پێکەنینەوە خواردنەکەیان خستە سەر سینییەک و بردیانە سەرەوە. سارا و هانس بەدیار ئانناوە دانیشتبوون و دەگریان، کە ئەندەش و کاتەرینا ئەمەیان بینی ئەوانیش دەستیان بەگریان کرد.

– وەرن شتێک بخۆن، بابەش نانی نەخواردووە.

– نا من هیچم پێناخورێ.

– دەی وەرن شتێک بخۆین، هەر ئێستا پاروو بۆ هەمووتان دەکەم. ئانناش دەبێ پاروویەک بخوات. کاتەرینا ئەمەی وت و چاوێکی لە ئاننا داگرت. ئەویش وەک نیشانەی ڕەزامەندی سەرێکی ڕاوەشاند.

– من ئێستا تەلەفۆن بۆ پزیشکێکی ناسیاو دەکەم. ڕووی کردە سارا، تۆش نانەکەت بخۆ و ئاننا بگۆڕە. منداڵەکان ئەمەیان پێخۆش بوو.

– دایە تۆ بچۆ خۆت بگۆڕە من و ئەندەش ئاگامان لە ئاننا دەبێ و دەیگۆڕین.

کە سارا چووە دەرەوە خێرا کەوتنە قسەکردن و داوایان لە ئاننا کرد کە خۆڕاگربێت لەبەردەم پزیشکەکەدا، بەهیچ جۆرێ قسە نەکات، گەر تەنگیان پێهەڵچنی ئەوا دەست بە قیژەو هاوار بکات، ئەوەندی تر هەردووکیان بترسێنێ، دەستی هەردووکیان بگرێ و بەریانندا.

جیابوونەوەکە کاری زۆر کردبووە سەر منداڵەکان، بەهەموو شێوەیەک دەیانویست چارەسەرێک بدۆزنەوە. دایکی ساراش بەهەمان شێوە بیری بە سارای کچییەوە خەریک بوو، پارەیەکی باشی دا بەو دیدەکتیڤە تا هەواڵی ژنە تازەکەی هانسیان بۆ بێنێ.

بە ڕێککەوتیش لەو ماوەیەدا هانس و شیرین هێندە پێکەوە نەدەچوونە دەرەوە، زۆربەی کات



هانس بەتەنیا هاتوچۆی دەکرد. کابرای پشکێنەر ئاگاداری هەموو هەنگاوەکانی هانس بوو. ناونیشانەکەی دۆزییەوە، ئەو لە خانوویەکدا دەژیا کە دەرگاکەی بەکۆد دەکرایەوە، بۆیە نەیتوانی بچێتە ژوورەوە.

کاتێ سارا کابرای بینی زۆر تووڕەبوو.

– ئەم هەموو پارەیەت پێدراوە، کەچی تا ئێستا نەتتوانیوە هەواڵێکم بۆ بێنی.

– خانم ئەوە کارێکی هێندە ئاسان نییە. مێردەکەت زۆربەی کات لە کارە، ئەم ماوەیەش زۆر سەرنجم داوە، بڕوا ناکەم پەیوەندی لەگەڵ کەسێک لە نەخۆشخانەکەیاندا هەبێت، چونکە پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەستە ژنەکانی نەخۆشخانەدا ئاساییە. دیارە لە خانووە تازەکەشی تەلەفۆنی نییە. زۆر گەڕاوم، بەڵام هیچم دەست نەکەوتووە. باشە کێ بە ئێوەی وت کە لەگەڵ ژنێکی تر دەژی ؟

– خۆی بە منی وت کە کەسێکی تری خۆشدەوێت. هەربۆیە زوو گواستیەوە و ماڵەکەی بەجێهێشت.

– ئەی کەس ئەوی بینیوە لەگەڵ ژنێکی تردا؟

– نا، پرسیارم لە سکرتێرەکەشی کرد، ئەو شکی بۆ هیچ کەسێک نەدەچوو. گرنگ من دەمەوێت لە ماوەیەکی کورتدا ئەم مەسەلەیەم بۆ یەکلا بکەیتەوە. لەم ماوەیەدا لەبەر ئەوەی کچە بچووکەکەمان نەخۆشە بۆیە ڕەنگە زۆربەی کات لای ئێمە بێت.

– نا خانم دڵنیات دەکەمەوە لە ماوەیەکی کورتدا هەموو زانیارییەکت بۆ دەهێنم، هەوڵدەدەم بزانم کێ لەو خانووانەدا دەژی و ژمارەی کۆدی دەرگاکە چەندە.

ماوەی نەخۆشییەکەی ئاننا سەری لە هەمووان شێواندبوو، شیرین زۆربەی کات لەگەڵ شارا و دەریادا بوو. شارا دەیویست شیرین و دەریا ڕازی بکات کە گەڕانەوەیان باشترین چارەسەرە. شیرین زۆر دڵتەنگ بوو لەوەی هانس کەم دەکەوتە ماڵەوە، زۆربەی شەوانیش هەر لای منداڵەکانی دەمایەوە. هەموو کاتێکیش تەلەفۆنی بۆ دەکرد و داوای لێبوردنی لێدەکرد و دەیان جار بۆی دووپات دەکردەوە کە ئەوی خۆشدەوێت، ئەم گرفتە کاتییە، تەنیا چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە ئاننای کچی چاکبێتەوە.

ئەو ماوەیە هانس هەر لە ژوورەکەی ئاننادا دەخەوت، هەرچەندە منداڵەکان پلانیان ڕێکدەخست تا لێکیان نزیک بکەنەوە، بەڵام کەڵکی نەبوو، هانس نەیدەتوانی وەک جاران لەگەڵ سارا بژی. ئەمەش سارای توڕەو ماندوو کردبوو. پشکێنەرەکەش هیچ هەواڵێکی تازەی بۆ نەدەهێنا، لەو کاتەدا گەر بیزانیایە ئەو ژنە کێیە دەیکوشت.

دایکی سارا بەهەموو شێوەیەک بە دەوروبەری هانس دا دەهات و دەچوو، تابوارێک برەخسێ و قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام ئەو خۆی لە باسکردنی ئەو مەسەلەیە لادەدات. ئێوارەیەک فرسەتی هێنا.

– هانس تۆ کەسێکی ئازیز بووی لای من، وامدەزانی چاک دەتناسم، بەڵام تێناگەم چۆن پاش ئەو هەموو ساڵە سارا و منداڵەکانت بەجێهێڵا، نیازت نییە بگەڕێیتەوە ناو منداڵەکانت، ئاننا هەر لەبەر ئێوە وای لێهاتووە.

– دەزانم ئاننا هیچی نییە مەسەلەکە تەنیا نەفسییە. پەیوەندی من و ساراش بۆ وای لێهات؟! هەردووکمان ڕۆڵمان هەبوو لە ڕوخاندنی ئەم پەیوەندییە، لەیەک دوورکەوتینەوەو ژیانێکی ترمان بۆ خۆمان دروستکرد. من کەسێکی ترم خۆشدەوێت، برواناکەم بتوانم لەگەڵ سارا بژیم و کەسێکی ترم خۆشبوێ. ئێستا گرنگ منداڵەکانە، ئێمە پێشتر ئەو ساردییەی نێوان خۆمانمان لێشاردبوونەوە، بۆیە ئێستا جیابوونەوەکەیان بۆ هەزم ناکرێت.

– بۆ شانسێکی تر بەیەک نادەن، ماوەکە درێژبکەنەوە، تۆش دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ ناو منداڵەکان، بەڵکو سەر لەنوێ بتوانن دەست پێبکەنەوە.

– باوەڕناکەم. من کەسێکی ترم خۆشدەوێت، بۆشاییەکی عاتیفی لای من دروست ببوو، بۆیە جێگای ئەو خۆشەویستییە بووەوە. نەشمویست خیانەت لە سارا بکەم، بۆیە خێرا ئەو نهێنییەم لادرکاند. منداڵەکانیش وردە وردە ڕادێن، ئەوان یەکەم منداڵ نین کە دایک و باوکیان جیادەبنەوە.

کە دایکی سارا گوێی لەم قسانەی هانس بوو بۆی دەرکەوت کە قسەکردن بێ ئەنجامەو دەبێ لەڕێگەی پشکێنەرەکەوە ئەو کەسە بدۆزرێتەوە. دەبێ قسە لەگەڵ ئەو ژنە بکرێ کە هانس پەیوەندی لەگەڵ هەیە.



پشکێنەرەکە هەموو ڕۆژێ بەرامبەری خانووەکەی هانسی گرتبوو، لەو خەڵکانەی کە لە خانووەکە دەردەچوون شکی بۆ کەسیان نەدەچوو. ئەو چەند ڕۆژە شیرین لە لای سارا دەمایەوە. چەند ئێوارەیەکی درەنگ پشکێنەرەکە دەهات و تەماشای پەنجەرەکانی دەکرد، لەو چەند ئێوارەیەدا تاقە خانوویەک گڵۆپەکەی نەدەسووتا، هەموو ئێوارەکان خێرا تەلەفۆنی لەگەڵ سارا دەکرد بزانێ کە هانس لای ئەوانە.

– سارا ئێستا مێردەکەت لای ئێوەیە؟

– بەڵێ لێرەیە.

– کەواتە دەزانم لە چ خانوویەکدا دەژی. لەوەش دەکات بەتەنیا بژی.

– چۆن دەزانی ؟

– لەبەرئەوەی هەر ئەو خانووە گڵۆپەکانی ڕۆشن نین، گەر لەگەڵ کەسێکی تر بژیایە ئەوا ئەو کەسە بەشەوان لە ماڵەوە دەبوو.

– توانیوتە بچیتە ژوورەوە؟

– تا ئێستا نا، هێشتا ژمارەی کۆدەکە نازانم، دوێنێ ئێوارە سەیری دەستی کابرایەکم کرد کە چووە ژوورەوە، بەڵام هەموو ژمارەکانم نەبینی. پێش تۆزێ پیرە ژنێک هاتە دەرەوە، چاوەڕوانم کە گەڕایەوە لەگەڵیا خۆم بکەم بە ژووردا.

– تکایە خێرا بکە، تا چەند ڕۆژێکی تر هیچ هەواڵێکت دەست نەکەوێ ناچاردەبین کەسێکی چوستتر بدۆزینەوە.

ئەمە وەک هەڕەشەیەک وابوو بۆ پشکێنەرەکە، بۆیە بڕیاری دا مەسەلەکە بە جیدیتر بگرێ. لەو کاتەدا پیرەژنەکە هاتەوە، هەر کە لە دەرگاکە نزیکبووەوە پشکێنەرەکە خۆی پێگەیاند.

– سڵاو خانم.

– سڵاو.

– ببوورە من هاوڕێیەکی پزیشکم لێرە دەژی و ناونیشانی ماڵەکەی داوە پێم، بەڵام بیری چووە ژمارەی کۆدەکەم بداتێ، بێ زەحمەت دەتوانی پێم بلێت.

– ئەی ئەو هاوڕێیەت تەلەفۆنی نییە؟

– هەرچەند تەلەفۆنی بۆ دەکەم خەتەکەی مەشغوڵە.

– ئێ چاوەڕوان بە تا لەقسان تەواو دەبێ.

وەڵامەکەی بەدڵ نەبوو، لەبەر خۆیەوە وتی هەی لەگۆڕم نای لە شەیتان چوو.

– تۆ ڕاست ناکەی. ئەوە یەکەمین ئێوارەت نییە ئۆتۆمبیلەکەت لەم ناوە ڕادەگریت و چاودێریی ئەم ئاپارتمانەی ئێمە دەکەیت، بۆ وادەزانی چاوم لێت نییە، من ئەوە سی و پێنج ساڵە لەم خانووەدا دەژیم، ئاگاداری هەموو جوڵانەوەیەکی ئەم ناوچەیەم، خەڵکەکەشی هەموو دەناسم.

ئەمەی وت و وازی لە کۆدەکە هێناو بە کلیل دەرگاکەی کردەوە.

پشکێنەر بەمە زۆر توڕەبوو سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوو لێیدا و ڕۆیشت.

پاش ڕۆیشتنی ئەو شیرین هاتەوە بۆ ماڵێ، پیرەژن کە لە قاتی خوارەوە دەژیا، ئاگای لەوە بوو کەیەکێ دەرگای ئەپارتمانەکەی کردەوە، خێرا چووە دەرەوە.

– چۆنی کچی جوان؟

– سوپاس، تۆ چۆنی؟

– خێرا هاتمە دەرەوە، تا پێت بڵێم ئەوە چەند ڕۆژێکە کابرایەکی خاوەن مارسیدس دێت، لەبەردەم ماڵەکەماندا دەوەستێ و چاودێری دەکات، داوای لێکردم کۆدەکەی بدەمێ، بۆیە تۆش ئاگات لە خۆت بێت، نەیەڵی لەگەڵتا بێتە ژوورەوە.

– پیاوێکی چۆن بوو؟

– سەر سپی چاوی کاڵ و باڵای بەرزبوو. ئەوە یەکەمین جاری نییە لێرە دەوەستێ.

– سوپاس پورێ گیان، منیش ئاگام لێ دەبێت، نایەڵم کەسێکی نەناسراو بێتە ژوورەوە. لە چ نهۆمێک دەژی؟

– هەر لەم نهۆمە. ئەی تۆ ؟

– لە نهۆمی پێنج. زۆر سوپاس بۆ ئاگادارییەکەت.

شیرین نەیدەویست لەوە زیاتر قسە بکات تا پرسیاری تری لێ نەکات.

هەر کە چووە ژوورەوە ترسێکی زۆری لێنیشت، خێرا پێش ئەوەی گڵۆپەکە بکاتەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرەوەی کرد. کەس دیارنەبوو. تەلەفۆنی بۆ هانس کرد تا بزانێ شەو



دەگەڕێتەوە.

– نا ئازیزم ئەمشەویش لای ئاننا دەمێنمەوە.

– منیش دەگەڕێمەوە لای شارا.

– زۆر باشە، ماچت دەکەم، لەبیرت نەچێ زۆرم خۆشدەوێیت.

هانس ئەم قسانەی لەبەردەم ژن و منداڵەکانیدا کرد. هەموویان پێی تێکچوون، بەتایبەتی سارا، زەمانێکە گوێی لەم وشانە نەبووە. خۆی نەگرت و خێرا چووە دەرەوە. کاتەریناش لە باوکی توڕەبوو.

– بابە تۆ زۆر بێعەقڵی، گەر ئەو ژنەت وا خۆشدەوێت بۆ لە بەردەم دایکمدا ئەو قسانە دەکەی. نازانی ئەوی پێ بریندار دەبێ.

– ئێوە دەزانن کەمن لە دایکتان جیابوومەتەوە و ژنێکی ترم خۆشدەوێت، بەڵام هەرگیز لەئێوە جیانابمەوە، ئێوە منداڵی هاوبەشی ئێمەن. بۆ کەسێکی ترم خۆشدەوێت، ئەوە شتێکە پەیوەندی بە من و ساراوە هەیە. ئێوەش گەورەن لەو شتانە تێدەگەن.

– نەک هەموومان، نابینی ئاننا چی لێهاتووە.

– دەزانم، بەڵام ئاننا یەکەمین منداڵ نییە کە دایک و باوکی جیابووبێتنەوە، ئەمەش شتێکی کاتییە، ماوەیەکە و بەسەردەچێ.

– بەسەرناچێ. تا ئێوە وابن ئاننا چاک نابێتەوە.

– چۆن دەزانی چاک نابێتەوە، هەندێ منداڵ توشی حاڵەتی وادەبن.

ئەندەش خێرا باوەشی بە کاتەریندا کرد و بردیە دەرەوە.

– بابە بڕۆ قسە لەگەڵ دایە بکە دیارە بریندارت کردووە.

باوکیان چووە خوارەوە، سارا لە هۆڵەکە دانیشتبوو، بتڵێک مەی لەبەردەم خۆیدا دانابوو جگەرەشی دەکێشا. هانس ئەم دیمەنەی زۆر بەلاوە سەیربوو.

– ئەوەی کە ڤینۆ دەخۆیتەوە ئاساییە، بەڵام تا ئێستا لەبەر منداڵەکان ڕێگامان بە میوانیش نەداوە لە ژوورەوە جگەرە بکێشێ.

– ئاها ئەوە لە کەیەوە منداڵەکانت هێندە پێ گرنگن.

- هەموو کات منداڵەکانم بەلاوە گرنگ بوون.

- بۆیە وازت لێیان هێنا.

- سارا تکایە شتەکان تێکەڵاو مەکە، من وازم لەتۆ هێناوە نەک لە منداڵەکان، ئەوان منداڵی هەردووکمانن. با هەوڵبدەین ئەم جیابوونەوەیە کار نەکاتە سەریان، ئەوان لەم مەسەلەیەدا هیچ خەتایەکیان نییە.

- ئەی خەتای کێیە، ئەو سۆزانییەی کە خۆشت دەوێت.

- خەتای ئەویش نییە و ئاگات لە دەمت بێت سۆزانی نییە، ژنێکی زۆر میهرەبان و هەست ناسکە.

- بێ دەنگ بە، ئەمجارە تۆ شتەکان تێکەڵاو مەکە. من هیچ خەتایەکم نەبووە لە مەسەلەکەدا، من هەرگیز بیرم لەوە نەکردوەتەوە بەمجۆرە جیابینەوە.

- هەر لەسەرەتاوە لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە خیانەت لە یەکتر نەکەین. منیش هەر کە ئەوم خۆشویست بە تۆم وت. بۆ ئەوم خۆشویست، ئەوە پەیوەندی بە ساردی پەیوەندی نێوان من و تۆوە هەبوو.

- کام ساردی؟ ئێمە ژیانمان زۆر ئاسایی بوو.

- ڕاست نییە هیچ ئاسایی نەبوو، هیچ جۆرە گەرمییەک لە نێوان من و تۆدا نەمابوو، ژیانێکی ڕۆتینمان دەبردە سەر، لە بەردەم منداڵەکانیشدا تەمسیلمان دەکرد تا هەست بەو ساردییە نەکەن.

- ئەوە خەتای کێ بوو، تۆ هەموو کاتت بۆ کارەکەت تەرخان کردبوو، ئێمە لە ژیانتدا نەبووین، دە پێم بڵێ لەگەڵ کام لە منداڵەکان لەماڵەوە مایتەوە، لەگەڵ کامیان دەچوویتە قوتابخانە و ئاگات لێدەبوو، دەورت بە کامیان دەکردەوە، گەر ڕاست دەکەی قسە بکە و بێ دەنگ مەبە. ئێستاش کە گەورە بوون ڕەدووی ژنێکی تر دەکەی و من بەجێدەهێڵی.

- وانییە منیش هەوڵم دەدا لەگەڵیان بچمە دەرەوە، ئەو ڕۆژانەی کە لە ماڵەوە دەبووم هەموو کاتەکەم بۆ ئێوە دەبوو، تەنانەت هاوڕێشم نەبووە لەگەڵی بچمە دەرەوە.

- لە ساڵێکدا چەند ڕۆژ لەگەڵیان بوویت دەتوانی بیژمێری.

- نا ناتوانم، کارەکەی من و تۆ جیاواز بوون، تۆ لە قوتابخانە کارت دەکرد، زۆربەی پشووەکان



لەماڵەوە بووی. لەیادت نەچێ کە بۆ هەموو سەفەرەکان پێکەوە چووین. هەردەم هەوڵم داوە ڕۆژانی پشووم لەکاتێکدا وەرگرم کە ئێوە پشووتان هەیە.

- ئەویش لەبەر خۆشی خۆت. من لەگەڵ هەرسێکیاندا لەماڵەوە ماومەتەوە.

- ئەوەش لەبەر خەسڵەتی کارەکەمان، دوای ئەوە خۆت حەزت لێبوو. گەر من لەگەڵ منداڵەکان لەماڵەوە بوومایە کاری دەکردە سەر ئیشەکەم، بەڵام کارەکەی تۆ وانەبوو.

- بەڵێ ئێوەی پیاو لەهەموو شت خۆتان دەپەڕێننەوە. لەبیرتە کە ئاننا لەدایک بوو پێم وتی و تکام لێکردی کە لەماڵەوە لەگەڵی بمێنیتەوە، کەچی ڕازی نەبوویت و وتت تۆ خۆت ویستت ئەم منداڵە بکەیت هەر دەبێ خۆشت لای بمێنیتەوە.

- ئێ دەوایە کە سکت هەبوو، پێم وتی لەباری بەرە، بەڵام خۆت نەتویست. سارا تۆ کای کۆن بەبا دەکەی، ئەوە شتێک بوو بەسەرچوو، باسکردنی هێندە کەڵکی نییە.

- ئەوە کای کۆن نییە، ئەوەی تۆ بە کای کۆن ناوی دەبەیت، بووە هۆی ئەم جیابوونەوەیە.

- ئەوە هیچ پەیوەندی بەمەوە نییە. لەم چەند ساڵەی دواییدا ساردییەک لە نێوانماندا دروست ببوو، هەتا دەهاتیش لەیەکتر دووردەکەوتینەوە.

- باشە تۆ ڕۆژێک لەڕۆژان بیرت لەوە کردەوە کە بۆ پەیوەندیمان ساردبووەتەوە، بێگومان نا، لەبەرئەوەی هەردەم کارەکەت لا گرنگتر بووە، زۆربەی کاتت بۆ کارەکەت بووە، بۆ کۆبوونەوەو کۆنفرانسەکانت تەرخانبوو نەک بۆ من و منداڵەکانت. هەر من بووم منداڵم دەبرد و دەهێنا، خەریکی کاری ناوماڵ و چێشت لێنان بووم، بەڵام ئێستا پەشیمانم گەر ئەوکات دەمکرد بە هەرا نەدەگەیشتینە ئەم قۆناغەی ئێستا. یان ئەوەتا زووتر جیادەبووینەوە یان کێشەکەمان چارەسەردەکرد. تۆ گەر لەڕۆژێکدا تەنیا سەعاتێ یان دوو سەعاتت بۆ کاری ماڵەوە تەرخان بکردایە، ئەم جیابوونەوەیە ڕووینەدەدا و خۆمان و منداڵەکانیش بەختەوەر دەبووین.

- ئەوە تۆ چی دەڵێی، هەموو شتەکانت تێکەڵاو کردووە.

- هیچم تێکەڵاو نەکردووە. تۆ ئامادەنەبووی کاتی خۆت بۆ ماڵەوە تەرخان بکەیت.

- کەرەکەر من هەموو ڕۆژ لە تۆ درەنگتر دەهاتمەوە، کە دەهاتمەوە تۆ هەموو کارێکت کردبوو.

- ئەی خۆ چاوەڕوانی تۆم نەدەکرد. بەڵام زۆر شتی تر هەبوو یارمەتی من بدەیت، تۆ هەرگیز

بیرت لەو شتانە نەدەکردەوە.

– ئەم شتانە پەیوەندی بە جیابوونەوەی من و تۆوە نییە.

– پێم وتی پەیوەندی هەیە. ئەوانە هەموو کاری کردە سەر من، تۆ وەک میوانێک لەماڵەکەدا دەژیایت، هیچ کاتێ بیرت لەوە نەدەکردەوە ئەم ماڵە گەورەیە بە سێ منداڵەوە چۆن بەڕێوە دەچێ، تەنانەت هەموو ساڵێ دەبوایە بیرم لە ڕێکخستنی سەفەر و بەرنامەی هاوینی منداڵەکانیش بکردایەتەوە، ئەمانە هەموو وای لەمن کرد هەستم بۆ تۆ نەمێنێ، تۆ هەستت بە من نەدەکرد، بۆیە پەیوەندیمان بوو بە شتێکی ڕۆتینی ڕۆژانە.

– بۆ بیرت لەوە نەدەکردەوە کە چی وا لێکی دوورخستوینەتەوە؟

– نا من زۆر باشم دەزانی بۆ من و تۆ وامان لێهات، تۆ بووبووی بە بەشێ لە مۆبیلیای ماڵەکە، دەهاتی و دەچووی بێ ئەوەی هەست بەبوونی من و منداڵەکان بکەی، منیش خۆم ماندوو لەبەرئەوەی هەموو کاتم دەبوایە تەرخان بوایە بۆ بەڕێوەبردنی ماڵ، ئەمە جگە لەکارەکەم. توانای ئەوەم نەبوو لە جەنابت بپرسم ئەرێ کابرا تۆ ماویت، یان ڕاتبوەشێنم و بە ئاگات بێنم، هەموو مێشکت لای لێکۆڵینەو و نەخۆشەکانت بوو، خەریک بووی ئەوانیشت دەکرد بەبەشێک لە ئێمە، منیش ناچاردەبووم کە خۆم دووربخەمەوە تا نەبمە یەکێک لە نەخۆشەکانت.

– لەوانەیە ڕاست بکەی، بەڵام هیچ خۆشییەکم لەم ژیانە هاوبەشە نەدەبینی. بۆیە تەنیا لە کارەکەمدا خۆم دەبینییەوە.

– هەموو جارێ دەڵێم ئەم مێردەی من و هەموو ئەو پیاوانەی وەک ئەوون هەر زۆر کەرن، دە لە سەدی کاتیان تەرخان بکەن بۆ خێزانەکانیان نەک هەر خۆیان بەڵکو خێزانەکانیشیان بەختەوەر دەبن. تۆ ئەگەر عەقڵت هەبوایەو منداڵەکانت پێ گرنگ بوونایە، کەمتر کارت دەکرد، بەشداری کاری ناوماڵ و پەروەردەکردنی منداڵەکانت دەکرد، ئەو کات منیش هەرگیز هەستم بەو تەنیایەی خۆم نەدەکرد، هێندە ماندوو نەدەبووم، تۆش زیاتر لەئێمە نزیک دەبوویتەوە و هەستت بە بوونمان دەکرد. منیش هێندە لێت دوور نەدەکەوتمەوە.

– ئێستا بە قسەی تۆ بێت ئەم وەزعەی ئێمە تەنیا پەیوەندی بەوەوە هەیە کە قاپم نەشۆردووە لە کاتێکدا مەکینەی قاپشتنمان هەبووە، یان ماڵم پاکنەکردووەتەوە لە کاتێکدا هەفتەی جارێک



ژنێک هاتووە هەموو ماڵەکەی پاککردووەتەوە.

– دەمت داخە، شتەکان مەکە بەگاڵتەجاڕیی، کاتێک کە باسەکان جیدین دەتەوێ شتەکان بەشێوەیەکی تەماوی باسبکەی. من دەڵێم گەر تۆ دوای بوونی کاتەرینا زیاتر لەماڵەوە بوویتایە و بەشداریت لە پەروەردەکردنی منداڵەکاندا بکردایە...

– خۆ پەروەردەکردنی منداڵ میرات نییە دابەش بکرێ، ئەوەی تۆ فریا دەکەویت دەیکەیت و ئەوەی من فریا دەکەوم دەیکەم...

– ئاخر بەم شێوەیە هەردەم خۆت دەپەڕێنیتەوە، بەو پێیە بێت تۆ فریای هیچ شتێ نەدەکەوتیت، لەبەرئەوەی هەردەم کارەکەت...

– تکایە بەس چەنە لێدە. دەزانم ئەوەی تۆی کوشتووە ئەوەیە من لە کارەکەمدا سەرکەوتووم، ئێستا یەکێکم لە دکتۆرە شارەزاکانی بواری نەشتەرگەری لە سوێدا.

– گوو دەکەمە ئەو سەرکەوتوویەت، لەکاتێکدا ئەو سەرکەوتنەت لەسەر حیسابی من و منداڵەکانە. ئا بەڵام ئەوەشت لەبیر نەچێت کە یەکێکی لەباوکە زۆر خوێڕییەکانی سوێد.

– ئێدە ژیان وایە، گەر گرنگیم بەکارەکەم نەدایە نەدەگەیشتمە ئەم پلەیەی ئێستاو..

– دەی بڵێ... لەمنداڵەکانیشم جیا نەدەبوومەوە.

– دەزانی قسەکردن لەگەڵ تۆدا جۆرێکە لە کەرایەتی. هەردەم لەبازنەیەکدا دەخولێیتەوە تا مرۆڤ گێژدەبێت.

– ئێ دەبێ وابێت. تۆیەک نەتەوێت هەڵەکانی خۆت ببینیت، دەبێ هەروا بڵێیت.

– گرنگ من دەچمە لای ئاننا، زۆر ماندوشم، لەوانەیە ئەمشەو لای نەمێنمەوە.

کاتەریناو ئەندەش و ئاننا لای قادرمەکان گوێیان لەم مشتومڕەی دایک و باوکیان گرتبوو. تەواو دڵگران بوون لەوەی بێ ئەنجام بوو، ئەمان چاوەڕوانبوون لەم گفتوگۆیەدا ئاشت ببنەوەو دەست بکەنە ملی یەکتری. کە باوکیان هەستا بێتە سەرەوە، هەموویان ڕایانکردە ژوورەکەی ئاننا و دەستیان کرد بە گریان. ئاننا باوەشی بۆ باوکی گرتەوە و بە ئیشارەت پێی ڕاگەیاند کە دەیەوێ ئەمشەو لای بخەوێ. باوکیشی ڕازی بوو بەڵێنی دا بمێنێتەوە.

ئەندەش و کاتەرینا چوونە دەرەوە.

– دەزانی لەوە دەکات زۆر لەیەک دوورکەوتبێتنەوە و هیچمان پێ نەکرێ، دایەش زۆر سەیر قسەی لەگەڵ دەکرد، زیاتر ئەو بوو توورە دەبوو و دەنگی بەرزدەکردەوە.

– ئاخر دایە زۆر توورەیە، بابەش خۆت دەزانی زیاتر هەر خەریکی کاربوو.

– دایە دەبوایە زووتر قسەی لەگەڵ بکردایە، تا لەسەرەتاوە گرفتەکەیان چارەسەربکردایە.

– ئەوەندەی من بەبیرم بێ دایە هەندێ جار شەڕی دەکرد.

– لەسەر چی شەڕیان دەکرد؟

– زیاتر لەسەر ئێمەو لەسەر ئەوەی دەبێ ئاگای لە ئێمە بێ، دایە دەیویست بابە لەگەڵمان بمێنێتەوە، یان هەندێ جار دایە دەیوت بۆ ئەو کاری ناو ماڵ ناکات، ئەویش دەیوت من ژنێک دەهێنم یارمەتیت بدات، یان دەیوت پێویست ناکات خواردن ئامادەبکەیت تەلەفۆن بکە خواردنتان بۆ بێتە ماڵەوە. ئەندەش کە تۆ ژنت هێنا وەک بابە دەبیت لەگەڵ ژنەکەتدا؟

– نا، من لە هەموو شتێکدا یارمەتی ژنەکەم دەدەم، تا لەدواییدا جیانەبینەوە.

– ئای چەند کەری خۆ هەرئەوە نابێتە هۆی جیابوونەوە.

– دەزانم، بەڵام ئەگەر ژن و پیاوێک یارمەتی یەکتربدەن، شتی هاوبەش زیاتر دەبێ لە نێوانیانداو لە یەک نزیک دەبنەوە و زیاتر یەکتریان خۆشدەوێت.



# 15

تەواو ژیانم لێ تێکچووە. نازانم ڕاست و چەپم لە کوێوەیە، هەمووی خەتای خۆم بوو، نەدەبوو پەیوەندیم لەگەڵ هانس دا وا زوو پەرەبسێنێ، داوای لێکردم بگوازمەوە لای بێ یەک و دوو بە گوێم کرد، کە داوای لێکردم بۆ ماوەیەک لە کارەکەم ئیجازە وەرگرم، خێرا بە گوێم کرد. ئێستاش وا دوو هەفتەی ماوە ئیجازەکەم تەواو بێت. بەم زووانە دەست دەکەمەوە بە کار، ئەم مانگەش هەندێ پارەم بۆ دایکم ناردەوە و دووجار قسەم لەگەڵ کرد، باشە ئێستا ئەم کارت و شتانە پەیدابوون مرۆڤ بەردەوام ئاگای لە کەس و کاری دەبێت. براکانم تەندروستیان باشترە، ژنێک دێت هەموو ڕۆژێ یارمەتییان دەدات و خەریکیان دەبێت، ئەمانەش بۆ من دڵخۆشکەرن.

ئەوەی منی نیگەران کردووە قسەی ئەو پیرەژنەی دراوسێمانە. نازانم دەبێ چی بێت، ئاخۆ کەسێک نەبێت کۆنە مێردەکەم ناردبێتی بۆ ئەوەی شتێ سەبارەت بە من بزانێ، باشترە سبەی هەر لە ماڵەوە بمێنمەوە و هەوڵدەم سەیری خوارەوە بکەم، بزانم ئەو کەسە دەناسم. دەبێ تەلەفۆنێکیش بۆ شارا بکەم. لەم ڕۆژانەشدا ڕێزان دەگەڕێتەوە، دیارە ئەو تەلەفۆن بۆ شارا دەکات. بە شارام وت کە ژمارەی مۆبیلەکەمی بداتێ تا قسەی لەگەڵ بکەم. هێندە جەنجاڵم لە ساتێکدا بیر لە چەند شتێ دەکەمەوە، جاری واش هەیە توانای بیرکردنەوەم نامێنێ.

ئێوارە بوو هانس هاتەوە، خێرا بەرەو ڕووی چووم و باوەشم پیاکرد. ئەویش توند توند منی گوشی و تێر ماچی کردم.

– دەچم خۆم دەشۆم و دەچینە دەرەوە، نان دەخۆین.

منیش خێرا مەسەلەی ئەو پیاوەم کەوتەوە یاد بۆیە نەمدەویست بچینە دەرەوە. چووم بانیۆکەم بۆ پڕکرد لە ئاو و هەندێ خوێ و کەفم بۆ کردە ناو ئاوەکەوە و مۆمێکی بۆندارم بۆ داگیرساند.

– ئێستا بڕۆ بە هێمنی خۆت بشۆ هێندە پەلەی نانخواردنت نەبێت.

– ئاخر برسیمە.

– جارێ بڕۆ خۆت بشۆ، پاشان بڕیارێک دەدەین. بەڵام خەوت لێنەکەوێت.

هەر کە چووە حەمامەکە مۆسیقایەکی هێمنم دانا و تۆزێ دەنگم داپێی تا ئەویش گوێی لێبێت. خێرا خێراش لە پەنجەرەکەوە سەیری خوارەوەم دەکرد، هیچم بەدی نەکرد. پەردەکانم دادایەوە و مۆمێکی کزم داگیرساند، بتلێ شەرابم هێنا و جارێکی دی سەیرێکی خوارەوەم کرد، بینیم ئۆتۆمبیلێکی سوور وەستاو پیاوێکی بەڕەنگ و ڕوو سوێدی هاتە دەرەوە، سەیرێکی سەرەوەی کرد، پاشان بەرەو ڕووی خانووەکەمان هات. پاش ماوەیەک سەیرم کرد، کەوتە هات و چۆکردن. هەموو گیانم کەوتە لەرزین و لە دڵی خۆمدا دەمووت دڵنیام ئەمە بۆ دۆزینەوەی من هاتووە، لەلایەکی ترەوە دەمووت خۆ هەر من لەم خانووەدا ناژیم. ئەو خواردنەی کە ئامادەبوو گەرمم کردەوە و زەڵاتەیەکم دروستکرد. بانگی کردم. بە جلەکانمەوە ڕایکێشامە ناو ئاوەکە، دەستمانکردە پێکەنین و باوەشمان بەیەکتردا کرد، جلە تەڕەکانی لەبەرداکەندم و ڕۆحمان تێکەڵ بە تیشکی مۆمی بۆندار و ئاوازی مۆسیقاو شڵپەی ئاو بوو، باڵمان گرت و نەماندەویست قاچمان لە زەوی بدات، لە خەوێکدا دەژیاین خەبەرکردنەوەمان گوناهێکی گەورەبوو. زەنگی دەرگاکە خەبەری کردینەوە، هەردووکمان ڕاچڵەکین، کەسێ نییە ناونیشانی ئێمەی لابێ.

– کەسێکە بەهەڵە لە دەرگاکەی داوە، گوێ مەدەرێ، بەڵام گەر جلم لەبەر دەبوو دەچوومە دەرەوە و لە قادرمەکانەوە دەمخستە خوارێ.

جارێکی تر زەنگی دەرگاکە لێدرایەوە و تەواو شپرزەبووم و خێرا خاولییەکەم لە خۆم پێچاو چوومە دەرەوە، سەیرێکی خوارەوەم کرد بینیم ئۆتۆمبیلەکە لە شوێنی خۆی وەستاوە، بەڵام پیاوەکەم نەبینی، چووم لە چاوی دەرگاکەوە سەیرم کرد هەمان پیاوم بینی کە لە بەر دەرگاکەمان وەستاوە. گەڕامەوە لای هانس پێم وت پیاوێکە لای دەرگاکە وەستاوە. هانس ڕۆبەکەی لەبەرکرد و سەری بە خاولییەک وشککردەوە و چوو دەرگاکە بکاتەوە، منیش چوومە ژووری نوستنەکە و خۆم گۆڕی.

– ئەو کەرە دەیوت ناونیشانی ئەم ماڵەی ئێمەی لە هاوڕێیەکی وەرگرتووە، گوایە لێرە دەژی.



– ئەی پرسیاری ئەوەی نەکرد کەسی ترت لەگەڵ دەژی یان نا؟

– ویستی درێژەی بداتێ، بەڵام من ڕێگەم نەدا، پێمگوت من لێرە دەژیم و هاوڕێی تۆش نیم، ئیتر دەرگاکەم داخست.. نازانم چۆن هاتووەتە ژوورەوە.

– ئەو پیاوە مەبەستی هەیە، ئەو ڕۆژە کە من هاتمەوە بۆ ماڵێ ئەم پیرەژنەی خوارەوەمان وتی کابرایەکی وا داوای کۆدی دەرگاکەی لێکردووە تا بێتە ژوورەوە ئەویش نەیداوەتێ.

دیارە هەر ئەو کابرایەیە.

– بۆ وا ترست لێنیشتووە؟

– دەترسم ئەو کابرایەی کۆنە مێردم بۆ سۆراخی من ناردبێتی.

– بڵێیی تا ئێستا تۆی لەبیر نەکردبێ.

– نا باوەڕناکەم، کەسێکی زۆر خراپە.

– مەترسە گەر جارێکی تر لەم ناوە بینیت، ئەوا مانای وایە بە دوای کەسێکدا دەگەڕێ، بۆیە پۆلیس ئاگادار دەکەین.

ئەم پیاوە لە زەوقی دام، خواردنەکەم خستەوە سەر ئاگر مۆمەکەم داگیرساندەوە. ئەویش دوو پەرداخ شەرابی هێنا.

– چییە بەم ڕازاندنەوەی مێزە دەتەوێ گلەیم لێبکەی کە چەند ئێوارەیەکە نەهاتوومەتەوە.

– نا تۆ زۆر ماندووی، ویستم تۆزێ وزەت پێ ببەخشم پێش ئەوەی بچیتەوە لای ئاننای کچت.

– بۆ دەتەوێ بڕۆمەوە؟

– نا من نامەوێ، لەوە دەکات خۆت حەز بکەیت. ڕەنگە بۆ کچەکەشت باشتر بێ بچیتەوە لای.

– نیازم نەبوو ئەمڕۆ سەری لێبدەم. پێویستم بە حەسانەوەیە. دوێنێش لەگەڵ سارا شەڕم کرد.

– بۆیە ئەم ئێوارەیەش بڕۆیتەوە بۆلایان باشترە. با پەیوەندی تۆ و سارا کار نەکاتە سەر منداڵەکان.

– لەمەشدا ڕاست دەکەی.

هانس تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بە کاتەرینای گوت بۆ خەوتن دەچێتەوە لایان.

– گەر دەچیتە لای شارا، دەتوانم بتگەیەنم.

– نا سوپاس، منیش حەز دەکەم بەتەنیا بم.

– دەتەوێ بەتەنیا بیت، ئەها چییە لێم بێزاربووی.

– نا مەبەستم ئەوە نییە، گەر تۆ بڕۆیت بۆ لای منداڵەکانت، ئەوا منیش خەریکی خوێندنەوە دەبم و ماوەیەکیشە سەیری ئینتەرنێتم نەکردووە.

– بیرت نەچێ سەیری ئەو لاپەڕەیە بکە کە پێم وتی. با تۆزێ بێینەوە سەرخۆمان، دەست بە کۆرسێکی زمان بکە و پاشان خوێندنەکەت.

ئەو ئێوارەیە کات زوو ڕۆیشت. هانس چووە لای منداڵەکانی و منیش بەتەنیا مامەوە زەنگێکم بۆ شارا لێدا. کەس هەڵینەگرت، ترسام. بۆیە خێرا تەلەفۆنێکم بۆ هانس کرد، پێم وت کە دەچمە لای شارا. ویستی بێت بە دوامدا بمگەیەنێ. دیاربوو منداڵەکان پێیان ناخۆش بوو، گوێم لێبوو بوو قسەیان دەکرد، ئەویش کە هێشتا تەلەفۆنەکەی دانەخستبوو وتی: دەزانن ئەم ژنەی کە ئێوە حەزتان لێی نییە بەزۆر منی ناردەوە بۆ ئێرە، تا لای ئێوە بم. ئەم ژنە زۆر میهرەبانە. گەر بیبینن خۆشتان دەوێت. زۆر بیر لە ئێوە دەکاتەوە. خواحافیزی لەمن کردو تەلەفۆنەکەی داخست.

تەلەفۆنەکەم دانا چووم سەیری خوارەوەم کرد بینیم ئۆتۆمبێلەکەی لێ نەمابوو، بە هەلم زانی خۆم لەبەرکرد و چووم بۆلای شارا.

چەند جار لە دەرگاکەم دا کەس نەیکردەوە، هەموو دنیا لەبەرچاوم تاریک بوو، ترسی ئەوەم لێنیشت شارا شتێکی لەخۆی و دەریا کردبێ، نازانم چۆن کلیلەکەشم لەگەڵ خۆم نەهێناوە، چ کەرێتییەکە، چوومە خوارەوە و تاکسییەکم تا ماڵەوە گرت و داوام لە شۆفێرەکە کرد چاوەڕوانم بکات. چووم کلیلەکە بهێنم. کەهاتمە دەرەوە و سواری تاکسییەکە بوومەوە پیاوەکە بەخۆی و ئۆتۆمبیلەکەیەوە هاتەوە بەردەمی خانووەکەمان. ئیتر تەواو دڵنیابووم کە ئەم پیاوە بەدوای مندا دەگەڕێ. ئەمجارەش منی نەبینی. بەڵام هەرچی بیری سەیر سەیر هەیە بە مێشکمدا دەهات. هەر کە گەیشتین وەک شێت لە تاکسییەکە دەرچووم، شۆفێرەکەیش هاواری کرد: پارەکە، پارەکە. گەڕامەوەو داوای لێبووردنم لێکرد و پارەکەم داپێی.

چووم دەرگاکەم کردەوە، بینیم کەسی لێ نییە، نەمزانی چیبکەم، چۆن دەریا ڕێگەی بە دایکی داوە بڕواتەوە. من پلانێکی تایبەتیم لەگەڵ دەریادا دانابوو تارێگە لە دایکی بگرین نەگەڕێتەوە.

دەبێ چی ڕوویدابێت. چوومە ژووری نووستنەکە بینیم جلەکان هەمموو لەو ناوەدا کەوتوون، گوتم ڕەنگە ئێرەیان دۆزیبێتەوەو هاتبێتن ئەوانیان بردبێ. خۆ لەوانەشە بیانکوژن و فڕێیان بدەنە ناو



ئاوێکەوە، کەس نەیان دۆزێتەوە. بەم درەنگە وەختە تەلەفۆن بۆ کێ بکەم. ماخۆلانم پێکەوتبوو نەمدەزانی چیبکەم، نەمدەویست هانسیش بە گرفتی خۆمەوە سەرقاڵ و نیگەران بکەم. دانیشتم و گلۆپەکەم کوژاندەوە.

یەکێک دەرگاکەی کردەوە، زۆر ترسام، شارا و دەریایان کوشتبێ و هێنابێتیانەوە بۆ ئێرە؟ خۆمم مت کرد، گوێم لەهیچ نەبوو، کەسێک چووە ژووری نووستنەکە. وتم تەواو خۆیانن هەر ئەوانن، چونکە دەریا هەرگیز بێدەنگ نابێ. دەرگاکەی دەرەوە داخرایەوە. تەواو ئەوە تەرمەکانیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن. بە کپی دەستم کرد بەگریان و وەک شەقشەقە دەلەرزیم. ماوەیەک وەستام، هیچ دەنگێ نەبوو، بڕیارم دا هێز بدەمە بەرخۆم و بچمە ژووری نووستنەکە، هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی، لەبەر خۆمەوە دەمووت دەی هیچ دەنگێ نایەت. لەبەر هەناسەبڕکێی خۆشم گوێم لەهیچ فزەیەک نەبوو، بەهێواشی چوومە ژووری نووستنەکەوە، قیژەیەک ڕایچەڵەکاندم و منیش بە هەموو هێزی خۆم قیژاندم. دەریاش خێرا دەستی بۆ سویچی گلۆپەکە برد و دایگیرساند. بینیم هەردووکیان زیندوون، باوەشم پیاکردن. دەریاش لەولاوە هەڵی دایە.

– ئۆی ئەوە چەند ترسنۆکن. من نەترسام، تۆزێ خۆشیش بوو.

ئەمجار دەستمان کرد بەپێکەنین. دەریام لە باوەش گرت، کە سەرنجی چاوەکانیم دا وامدەزانی ژنێکی گەورەم لە ئامێزدایە.

ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوتین. هەرچۆنێک بوو دەریامان خەواند و خۆمان ماینەوە. هێندە ترسابووین پێویستیمان بە پشوویەکی زۆر بوو. هەستمان بەبرسێتی کرد. چوین ئەوەی هەبوو لە یەغچاڵەکەدا دەرمان هێناو کەوتینە سەری. هەر زوو زووش بیرمان دەکەوتەوە و دەستمان دەکرد بە پێکەنین.

– دەریا ڕاست دەکات خۆشیش بوو، وەک فیلمێکی ترسناک بوو.

– باشە تۆ بۆ کوێ چوویتە دەرەوە. دوای ئەوە دەبوایە تەلەفۆنێکت بکردایە.

– ئەی باشە تۆ بۆ گلۆپەکانت کوژاندبووەوە.

– لە تاریکاییدا باشتر بیردەکەمەوە. زۆریش دەترسام، دەمویست ترسەکەی خۆم لە تاریکی ماڵەکەدا بشارمەوە.

– باشە بۆ واترسای.
– ترسی ئەوەم بوو تۆ شتێکت لێهاتبێ، یان گەڕابێتنەوە ماڵی باوکت.
– من هیچم لێنەهاتووە. چوونەوەشم بۆ ماڵی باوکم شتێکی حەتمییە، لەو ڕێگەیە زیاتر هیچی ترم لەبەردەمدا نەماوەتەوە.
– دیارە خۆت و دەریات لێ زیادە.
– نا هەر ئێستا دایکم بینی، بەڵێنی دا قسە لەگەڵ باوکی دەریا بکات، تا هیچ نەبێ لەبەرخاتری ئەم بگەڕێمەوە. ئەو ڕازی دەکرێ، بەڵام باوکم زۆر زەحمەتە.
– ئەوە تۆ عەقڵت هەیە، چۆن دەچی دایکت ببینی، ترسی ئەوەت نییە کەسێک دواتکەوتبێ و ماڵەکە شارەزا بووبێ.
– نا باوەڕناکەم، تەنیا دایکم هاتبوو، پێم وت لە شوێنێکدا دەژیم پۆلیس پاسەوانی دەکات. بۆیە تۆ دەبێ خێرا بڕۆی، ئەویش نایەوێ جارێ کەس ماڵەکەی من بزانێ، چونکە باوکم هێشتا هەر هەڕەشەم لێدەکات. گەر ئەویش نەبوایە لەوانەیە من هەرچۆنێ بوایە لەگەڵ ئەو گەلحۆیەی مێردم ببردایەتە سەر.
– هەردەم ئامۆژگاری ئەوەت دەکەم کە نەگەڕێیتەوە، تۆش کەیفی خۆتە. زۆرم پێوتووی و زۆریشم هەوڵ لەگەڵ داوی. ئەوانە هەرگیز وازمان لێناهێنن، وا هەست دەکەم ئەو کەر پیاوەی منیش هەر وازی نەهێناوە، بەڵام ئەمجارەیان زیرەک ترە، خۆی بەدوامدا ناگەڕێ، کەسێکی سویدی ڕاسپاردووە.
– چۆن دەزانی؟
– ئەوە دوو ڕۆژە کابرایەکی سویدی بە ئۆتۆمبیلێکی سوورەوە بەردەمی ماڵەکەمان دەگرێ و ئەمڕۆش هات زەنگی دەرگاکەمانی دا، باشبوو هانس چوو دەرگاکەی کردەوە. ئەم ئێوارەیەش کە گەڕامەوە بۆ ماڵێ تا کلیلەکەی ئێرە بهێنم دیسانەوە لەبەردەم ماڵەکەماندا وەستابوو.

– جابەدوای تۆدا دەگەڕێ؟
– وا هەست دەکەم چونکە ئەم ئێوارەیە نازانم چۆن کۆدی دەرگای دەرەوەی زانی بوو هاتبووە ژوورەوە، هەر لە دەرگاکەی ئێمەشی دابوو، هانس چوو دەرگاکەی لێکردەوە و وتبووی گوایە



هاوڕێیەکی ناونیشانی ماڵی ئێمەی داوەپێی. باشە زانی ئەو هاوڕێیەی لەوێ ناژی بۆ جارێکی تر دێتەوە لای هەمان خانوو. بۆیە واهەست دەکەم بەدوای مندا دەگەڕێ.
– پلاشکە لە خۆی بەشکە، ئێمەش وامان لێهاتووە، کە بەلای کەسێکدا بڕۆین و سەیرمان بکا یەکسەر ترسمان لێدەنیشێ.
– ژیانمان وا لێکراوە.
– ئەم شووانەی کە کردمان وای لێکردین.
– بزانین لە شووەکانی داهاتووماندا بەختمان چۆن دەبێت.
– مەگەر تۆ شوویەکی تر بکەیتەوە خانم. من بەتەمای شووی تر نیم، خوا دەکات لێم دەگەڕێن دەریا گەورە دەکەم شووم هەرناوێ.
– منیش بەتەما نەبووم، ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە ئەوەبوو.
– بەتەمای شووی پێبکەی؟
– بەڵێ، تەنیا چاوەڕوانی ئەوەین کە کاری جیابوونەوەکەیان تەواو ببێ، هەرچەندە پێش چەند ڕۆژێ هانس بە پێکەنینەوە وتی پێش ئەوەی هەموو شتێک لەگەڵ سارادا کۆتایی بێت دەتوانێ بەپێی شەریعەتی ئیسلام بمهێنێ. چونکە لای ئێمە پیاو مافی ئەوەی هەیە لە ژنێک زیاتری هەبێ.
– گاڵتەی دەکرد یان بەڕاستی بوو.
– نا بەڕاستی بوو، تەنانەت تەلەفۆنی کردبوو بۆ ئیمامی مزگەوتیش.
– ئەی بۆ تۆ ڕازی نەبووی؟
– من دەمەوێ ماوەیەکی تریش چاوەڕوان بکەم تا دڵنیابم لەوەی بەتەواوەتی خۆی یەکلا کردووەتەوە.
– بۆ تا ئێستا دڵنیا نییت؟
– دڵنیام، بەڵام نازانی لەم ماوەیەدا چی ڕوودەدات. لەم چەند ڕۆژەدا کچە بچووکەکەی زمانی بەستراوە، ئەوە چەند شەوێکە هەر لەوێ دەمێنێتەوە.
– ئێ دەوا بڵێ بۆیە ئەمشەویش هاتووی بۆ ئێرە.
– نا وانییە، ئێوارە کە تەلەفۆنم بۆ کردی وەڵامت نەدایەوە، نیگەران بووم، چییە منەتیش ناکەی

بەسەرماندا، بەم شەوە سێ سەد کرۆن پارەی تاکسیم داوە بۆ ئەوەی بچم کلیلەکە بهێنم و لە ساغ و سەلامەتیت دڵنیابم.

– نا ببوورە من مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵام دیارە تۆش دەتەوێ پارەکەت بدەمەوە، نەیخۆی تاڵە.

بەم شێوەیە ڕۆژمان کردەوە. تیشکی ڕۆژ تازە لە ژێر هەورەوە کەوتبووە سەرەتاتکێ، کە تەماشای ئاسمانمان کرد مرچ و گرژبوو، بۆیە بڕیارمان دا بخەوین. لەتەنیشت دەریاوە خۆمان خزانە ناو جێگەکەوە و خەوتین.

سەعات چواری پاشنیوەڕۆ دەریا خەبەری کردینەوە، ئەو خواردنەی کەلە سەر مێزەکە بەجێمان هێشتبوو هەمووی خواردبوو. هەر لەو کاتەدا زەنگی تەلەفۆنەکەش لێیدا، کەسمان نەمانوێرا بچین بەلایدا، دەریا چوو تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. ڕێزان بوو، تازە لە وڵات گەڕابویەوە.

ڕێککەوتین لەگەڵی یەکسەر بێت بۆ لامان.

– شارا دەبێ بڕۆم هەندێ شت بکڕم هیچمان نەماوە. تۆ هیچت دەوێت؟

– شیرو ماست و هەندێ میوە بێنە. دەڵێی ناتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە؟

– چییە لەماڵەکەی خۆمدا لێم بێزار بووی؟

– ماڵی تۆی چی! لەوکاتەوە بەجێتهێشتین حەقت بەسەر ئەم ماڵەوە نەماوە.

دەریاش دەیویست لەگەڵم بێت، شارا ڕێگەی نەدا، بەڵام داوام لێکرد کە ڕێگەی بدات. دەمزانی شتێکی هەیە و دەیەوێ بۆمی باسبکات.

هەر کە چوینە دەرەوە ئیتر لە قسەکردن نەدەوەستا.

– شیرین دەزانی دایکم چەند جارێ نەنەی بینی، دەزانی نەمتوانی خۆشم بوێ، وا هەست دەکەم لەگەڵ دایە ڕاست ناکات.

– چۆن دەزانی؟

– چاوەکانی دەخوێنمەوە، یەکەمین جار باشتر دیاربوو، بەڵام دووەمین جار هەستم کرد قسە و پرسیارەکانی تاریک بوون.

– پرسیاری چی لە دایکت دەکرد؟

– لەکوێ دەژی، لەگەڵ کێ دەژی، کێ یارمەتیت دەدا، ئەو نەیدەزانی من لەهەموو شتێک دەگەم. یەکەمین جار بینیمی هەر سەیریشی نەکردم، پاش ماوەیەک وتی وەرە ماچێکم بدەرێ،



منیش نەچووم دوور کەوتمەوە لێی. ئەویش تووڕەبوو، دایەش وتی عاجز مەبە ئەو تۆ ناناسێ، زۆر خەڵکیش نابینێ. دوایش تۆزێ خۆی تورەکرد لە دایە، گوایە ئەم کارەی ئەم کردوویەتی... ماڵی بەجێهێشتووە و لای پۆلیس شکاتی لە مێردەکەی کردووە، لە بیربردنەوەیان زەحمەتەو ئەستەمە باوکیشی لێی خۆشبێ. ئیتر دایەش دەستی کرد بەگریان و داوای لێکرد قسە لەگەڵ باوکی بکات بەڵکو دڵی نەرم بێتەوە و ئەمیش بتوانێ بگەڕێتەوە، نەنە دەیوت گوایە دایە حەیای بردوون و لە هیچ شوێنێ ناتوانن خۆیان پیشان بدەن. بۆیە لەو باوەڕەدام ئەگەر بگەڕێتەوە دەیکوژن.

– باشە ئەی تۆ دەتوانی چی بکەیت؟

– گەر ئاگام لێبێت دەتوانم زۆر شت بکەم، بەڵام من ترسی ئەوەم هەیە لە کاتێکدا لە ماڵ نەبم فرسەت لە دایکم بێنن.

– نەنەت هیچ باسی چوونەوەی دایەی بۆ وڵات نەکرد؟

– با باسی ئەوەشی کرد، بەڵام دایە وتی چییە دەتانەوێ بمبەنەوە لە وێندەر بمکوژن. هەرچەندە گەر بیانەوێ لێرەش دەیکوژن.

– ئاخر لە وڵات ئاسانترە، کەس لێیان ناپرسێتەوە، گوایە شەرەفی خێزانەکەیان دەکڕنەوە، تا ئێستا دەیان شتی وا کراوە.

– دایە شتێکی وای نەکردووە کە حەیای خێزانەکەی بردبێت، بابە خراپ بووە لەگەڵی و لێیداوە و زیندانی کردووە، ئەویش ماڵەکەی بەجێهێشتووە.

– ئەو نەدەبوایە ماڵەکەی بەجێهێشتایە، دەبوو هەموو زوڵمێکی قەبووڵ بکردایە، بەڵام هەر پەنای بۆ پۆلیس برد و شکاتی لێکرد و باوکتیان خستە زیندانەوە، ئیتر دایکت سڕایەوە و بووە هۆی لەکەدارکردنی شەرەفی خێزانەکە.

– ئەوان بێ شەرەفن کە وایان لە دایە کرد، بەپێی یاسا بابە خرایە زیندانەوە، کەواتە ئەوان تاوانبارن نەک دایە. ئەی ئەوان لەوە ناترسن گەر دایە بکوژن، ئەمجارەیان بۆ چەند ساڵێک دەخرێنە زیندانەوە؟

– با دەترسن، بەڵام لەوانەیە هەوڵبدەن بە شێوەیەکی وا بیکەن کە ئاشکرابوونی ڕاستییەکان ئاسان نەبێت، یان بیبەنەوە و لەوێ بیکوژن. پێش ماوەیەک کچێکی شانزە ساڵیان بردبووەوە بۆ وڵات، لەپەناوە فیشەکێکیان بە سەریەوە نابوو و کوشتبوویان، دەڵێن پاکەتێکی جگەرەی مارلبۆرۆ

و پەساپۆرتەکەی بە ئەنجن ئەنجنکراوی لە گیرفاندا بووە، کێ کوشتوویەتی، چۆن کوژراوە، کچی کێیە، ناوی چییە، کەس بەخەیاڵیدا نەهاتبوو بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا بگەڕێ. دەزگای پۆلیسیش ئەوە بەکاری خۆی نازانێ لەبەرئەوەی کچ و ژن کوشتن دەچێتە خانەی پاککردنەوەی شەرەفەوە، بە شتێکی بنەماڵەی دادەنێن. ئیتر شتەکە بەسەرچوو.

– ئەی لێرە کەس هەواڵی کچەکەی نەپرسیبوو؟

– وەڵام زۆرە بۆ ئەم پرسیارە، بۆ نموونە دەڵێن: شووی کردووە، لەوێ مردووە، نەیویستووە بێتەوە بۆ ئێرە...

– نامەوێ لە وڵاتێکی وادا بژیم.

– زوڵم بەرامبەر بە ژن لە هەموو جیهاندا هەیە لە هەر شوێنێک بە جۆرێک.

– نامەوێ باوکم و بابە گەورە بناسم، هەرگیز زوڵمی ئەوان قەبووڵ ناکەم، هەر زۆریشیان لێم کرد دەستەڵاتی خۆم، هێز و سیحر بەکاردەهێنم.

– بۆ دەریا گیان دەتوانی سیحریش بکەی. نا وا مەڵێ مەمانترسێنە.

– نا مەترسە، وا هەست دەکەم ئەو هێزەشم هەیە، هەرچەندە تا ئێستا بەکارم نەهێناوە، پێویستم پێی نەبووە.

– دەترسم تۆش ببی بە پێغەمبەر.

– بۆ نابێ، پێغەمبەرێک بۆ ژنان، هەموو پێغەمبەرەکان پیاو بوون و لە خزمەت پیاودا بوون، با پێغەمبەرێکی ژنیش پەیدابێت!!

ئێمە لەم قسانەدا بووین و زۆر ئاگامان لەوە نەبوو کەخەڵک چۆن سەیری دەریایان دەکرد منداڵێکی وا بچووک وەک گەورەیەک قسەی دەکرد. دیارە ئەمە سەرنجی ڕاکێشابوون. بۆیە داوام لێکرد کەبێ دەنگ بێت. شتەکانمان کڕی و چوینەوە ماڵێ. هەرسێکمان پەلەی ئەوەمان بوو ڕێزان زوو بگاتە لامان. بەتایبەتی هەواڵ و وێنەی دایکم و براکانمی پێیە.

هێندەی نەبرد ڕێزان بەخۆی و جانتایەک جل و هەردوو منداڵەکەیەوە گەیشتن، سەیر بوو منداڵەکانی لە دەریا دەترسان و هەر لەسەرەتاوە خۆیان دوور دەگرت لێی.

– چییە شارا دیارە ئەم کچەی تۆ شتێکی لەم منداڵانەی من کردووە، وا لێی دەترسن.

– نا.



– چی؟ چیت وت. بۆ لە پرسیارەکەی من تێگەیشتی؟

منیش یەکسەر هەوڵم دا پینەی بکەم، وتم دەریا هەموو پرسیارێک هەر بە نا وەڵام دەداتەوە. خۆ ڕێزان بیزانیایە دەریا وا قسەدەکات یان بەمجۆرە بیردەکاتەوە دڵنیام دنیای بەسەردا دەڕژاندین.

ڕێزان تۆزێ هاتبووەوە سەرخۆی و منداڵەکانیشی گەورە ببوون. خێرا جانتاکەی کردەوە، دیاری بۆ هەموان هێنابوو. دەستێ جلی جوانی بۆ دەریا هێنابوو، منیش خێرا لێم وەرگرت.

– وەرە دەریا ئەم جلانەت لەبەرکەم.

شارا کە بەو جلانەوە بینی خێرا لە باوەشی گرت و دەستی کرد بە گریان.

– هیوادارم ژیان هیچ مەینەتییەک بۆ تۆ نەهێنێ.

– خەمت نەبێت دایە گیان.

– وەی بیسملا، ئەی پێنەگەی، دەڵێی پیرەژنی سەر تەنوورە، ئەم قسە زلەت لەکوێ هینا.

– ڕێزان گیان تۆش مەمترسێنە. ئەزانی من هەندێ جار گوێم لە قسەکانی دەریا دەبێ موچڕکە بە گیانمدا دێت.

دەریا سەیرێکی منی کرد و بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات چووە ژووری نووستنەکە.

– شارا گیان من چەند جارم پێ وتووی کە ئەم کچەی تۆ هەر لەگەڵ گەورەدا ژیاوە بۆیە بیرکردنەوەی وایە.

منداڵەکانی ڕێزان بەدوای دەریادا ڕۆیشتن، ئیتر هەر چپەچپیان بوو. منیش بەدوایاندا ڕۆیشتم.

– وا ئەم منداڵانە هاتن بۆ لات، بە عاقڵی یارییان لەگەڵ بکە، چاوێکم لێ داگرت و چووم بەلای ڕێزانەوە.

– دەی ژنە تەڵاقدراوەکان وەرن با بڕۆینە جێگە مێژووییەکەمان و هەندێ خواردن ئامادەبکەین.

– شیرین خان ناماقوڵیت کرد من تازە بووکم و ڕازیش نابم پێم بڵێی تەڵاقدراو.

– چی چی...؟

– شومکرد بە پیاوێکی تابلێی ماقوڵ و ڕۆشنبیر.

– گاڵتە ناکەیت؟

– نا بۆ گاڵتە دەکەم. لەجیاتی ئەوەی پیرۆزبایم لێبکەن، خەریکن بمکەن بە شاخدا.

– چۆن وا زوو شووت کرد.

– ئەوروپا خۆش بێ.
– هەی دافەتێی، ئەی گوایە فەرقی تۆ لەگەڵ ئەو پیاوانەی دەڕۆنەوە بۆ وڵات و مامەڵەی ژن دەکەن چییە.
– زۆرە.
– من چووم پیاوێک هات بۆ داوام، خۆم نەچووم بۆ داوای پیاوێک. لە خۆم گەورەترە، نەک پانزە ساڵ لە خۆم منداڵتر. ژنی نییە و تا ئێستاش بوخچەی نەکراوەیە.
– بەخوا گێلی بۆ لە دنیای پیاودا بوخچەی نەکراوە هەیە. گەر ژنیشیان نەهێنابێ لەلایەکەوە دەستی خۆیان بە ژنێک گەیاندووە، کەرە.

– ئەوە گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە قۆزە، منداڵی خۆشدەوێت، ڕێزی من دەگرێ. بۆ زانینتان هێندە بەلاشیەوە گرنگ نەبوو لێرە بژیین یان لە وڵات، کاردەکات و مامۆستای زمانی ئینگلیزییە.
– ئاوها، وەڵا ئیتر دەمانخۆیت. دیارە ئەم پیاوەت پێش وەخت حیجزکردووە.
– نا تەنیا بەرێکەوت بوو، نە ئەو بەدوای مندا گەڕاوە نە منیش. ئێوارەیەک چووین بۆ سەیران، لەوێ بەرێکەوت کۆنە هاورێیەکی خۆمم بینی کە جاران لە کۆلێج پێکەوە بووین، ئەو پیاوە قۆزەی لەگەڵ بوو، کەسێکی زۆر کراوە و ڕووخۆشە. بۆیە من دڵم زۆر خۆشە و دەتوانم نازتان هەڵگرم.
– ئەی دایک و باوکت ڕایان چی بوو بەرامبەر ئەم شووکردنەت؟
– جا ئەوە بۆ دەپرسی. بۆ ناپرسی چیان پێکردم بۆ مەسەلەی جیابوونەوەکەم.
– ئێ دەباشە باسی ئەوەشمان بۆ بکە.

– ئای چەند زمانیان درێژبوو، ئای چەندیان وت، خزم و دراوسێ هەر مەپرسە. خۆ لەوێ هەر دایک و باوک نییە، خزم و دراوسێیش لۆمەت دەکەن، لەسەرەتاوە هیچ یەکێک لە خزمەکانیشمان نەهاتن بەخێرهاتنم بکەن.
منیش جارێ هاتم بەسەروگوێلاکی دایە و بابەو ئیتر هەموو ئەو شتانەم بۆ باسکردن کە ئەو کەرەی مێردم پێیکردووم. ئەوجا بە باوکمم وت بابە من کچی پیاوێکی وەک تۆ بە غیرەت و دانام، چۆن ڕازی ببم کەرێکی چواریێ وام لێبکات و بێدەنگ بم. تۆ زۆر جار باسی عەدالەت و



ڕێزگرتنت بۆمان دەکرد، قەبووڵکردنی ئەو زوڵمە، بە زایەدانی ئەو هەموو ڕەنجەیە کە تۆ لە پەروەردەکردنماندا داوتە. بۆیە هەر خێرا خەبەری پۆلیسم لێداو گرتیان، خۆ سوێدیش وەک ئەم کاولبووەی خۆمان نییە. هەر پیاوێک لە ژن بدات و ئازاری بەدەنی و نەفسیی بدات و ژنەکەی شکاتی لێبکات یەکسەر پۆلیس دەیگرێ و دادگای دەکەن، ڕاستە لەوێش لێدان و ئازاردانی ژنان هەیە، بەڵام لەوێ ژن وەک مرۆڤ تەماشادەکرێ، لێپرسینەوەش هەیە، وەک ئێرە نییە کەس دوای ئەوجۆرە تاوانانە ناکەوێ.
باوکم کە گوێی لەم قسانە بوو، دەستێکی بە سمێڵە ماش و برنجیەکەیدا هێناو وتی: کچم تۆ بە ئارەزووی خۆت شووت کرد، من دەمزانی ئەو کابرایە ساختەچیە و قسەی ڕاستی نییە. دەستم کرد بەگریان و پێم وت: بابە گیان ئەی بۆ پێت نەوتم، ئەگەر پێت بووتمایە توشی ئەم هەموو ئازار و خەفەتە نەدەبووم. باسی سەنتەری ژنانم بۆ کردن. هەروا زۆر شتی تر، بەڵام بەترش و خوێوە. هەر بۆیە وردە وردە هەڵوێستی خۆیان گۆڕی، کە خزم و دراوسێش دەیانبینی دایکم و باوکم شتەکەیان ئاسایی وەرگرتووە، ئەوانیش کەوتنە دڵنەوایی کردنم. لەم خەباتەدا دایکم زۆر یارمەتی دەدام، کە لە کۆڵان دادەنیشت یان کە خزمەکانمانی دەبینی شیوەنی بۆ دەگێڕام و باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو مێردەم چەند ناپیاو بووەو چۆن ئەزیەتی منی داوە. بەمجۆرە دەستە دەستە ژن دەهاتن و دڵنەواییان دەکردم و هەزارو یەک دوعایان لێدەکرد. خۆ گەر دوعای ئەو خەڵکە قەبووڵ بێ ئێستا دەبێت ئەو پیاوە هەناسەی لێبڕابێت.
– هەر باشە باوکت بەو قسانەت قەناعەتی هێناوە و بێ دەنگ بووە. باوکی من هەر ناوێری قسەی لەگەڵ بکەی. قسەیەکیشی بە دڵ نەبێ دەمانداتە بەر شەق.
– ئاخر شارا گیان کەرێتیش زۆر جۆری هەیە.
– من باوکم زوو مرد، نەخوێندەواریش بوو، بەڵام لەوباوەڕەدا نیم باوکێکی خراپ بوایە. ڕێزی دایکمی زۆر دەگرت.
– خۆ ئەو شتانە بە خوێندەواری و نەخوێندەواری نییە، خۆ باوکی من خوێندەوارە و بە حیساب تێکۆشەریشە، ئاو لە ڕەوتی خۆی بوەستێ ئەو لە باسکردنی ئازادی وڵات و ڕزگاری گەلان ناوەستێ، کەچی کچەکانی خۆی کۆیلە کردووە و کەمترین ئازادییان پێ ڕەوانابینێت.
– ئەی بۆ ئەم شووەی ئەمجارەت وتیان چی؟

– ئەمجارە بە باوکم و دایکمم وت، ڕێگەم بدەن تۆزێ لەگەڵی تێکەڵاوبم چەند جارێ ببیبینم و بێتە ماڵەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش ببیبینن. تا وەکو جاری پێشوو نەخەڵەتێم.

– چەند جار بینیت؟

– زۆرجار... جگە لە ماڵی باوکم چەند جارێکیش لەماڵی ئەو کوڕەی برادەرم بینیم، دەرچوو ئامۆزای ژنەکەیەتی. بەڵام تا بڵێی موحتەرەمە، گاڵتەی پێناکرێ.

– توخودا موحتەرەم گیان هیچ دەستی بۆ درێژ نەکردی؟

– حەدی نەبوو، تا مارەی نەبڕیم ڕێگام نەدا ماچێکیشم بکات. بەڵام ئێوەش وەک خوشکمن، زۆر بەزەحمەت دەمتوانی لەگەڵی بخەوم. ئەوەی مێردە خوێڕییەکەی پێشووم پێیکردووم هەوەسی ژنایەتیشی پێنەهێلاوم، بەڵام گیان بەوەبوو کە ئەم لێم تێدەگەیشت.

– چەند پێکەوەبوون؟

– تەنها مانگێ. هەردووکمان زۆر بیرمان لێکردەوە، بەباشمان زانی کە بگەڕێینەوە بۆ ئێرە، بۆ منداڵەکان ئێرە باشترە و جگە لەوەی ئەویش حەزی لێیە دوو منداڵی تریشمان بێت.

– خوا ڕەحم بکات لەمیش جیانەبیتەوە. ئەوکاتە چی دەکەیت بەدەست چوار منداڵەوە.

– لەبەردەمی دایک و باوکی هەردووکماندا پێم وت، بەشایەتی هەمووتان گەر ئەم پیاوە ڕۆژێ لە ڕۆژان زوڵمم لێبکات و لێمبدات و حەقی منداڵم بخوات، ئەوا یەکاو یەک نەک تەنیا لێی جیادەبمەوە بەڵکو شکاتی پۆلیسیشی لێدەکەم. نەک هەر ئەوە بەڵکو تەمێی باوکیشمم کرد کە جارێکی تر لە دایکم نەدات.

– بۆ باوکت لە دایکتی دەدا؟

– زۆر نا هەندێ جار، بەتایبەتی کە بیخواردایەتەوە. زۆر جار دادەنیشتم باسی ژیانی ئێرەم بۆ دەکردن، دایکم هۆن هۆن فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتنە خوارەوە و دەیوت بۆ ئێمەش بەکچێتی لەو وڵاتە لەدایک نەبووین، ئەم وڵاتەی ئێمە هەر بۆ پیاوە خوا لەناویانبات. باوکیشم دەستی دەکرد بە پێکەنین و دەیوت دەی هەستە هەی لە ژن نەچوو دیارە ڕێزان زمانی تۆشی درێژ کردووە.

– دەزانی ڕێزان بەڕاستی تۆ چاو نەترسی.

– دەبێ وابیت ئەگینا پیاو دەتخوات. چەند بێدەنگ بیت ئەوەندەی تر قاچ ڕادەکێشن، هەر لە سەرەتاوە قاچیان ببڕەوە تا فریا نەکەون شەقت بۆ هەڵدەن.



– ئەی خوا نەتگرێ ڕێزان، هەرباشبوو هاتیتەوە، دەزانی من و شارا زۆر بیرمان دەکردی. زۆر بێهێزین پێویستمان بە کەسێکی وەک تۆیە پاڵپشتمان بکات.

– جا منتان بۆ چییە، نا... نا من دەزانم چیتان دەوێ. دەتانبەمەوە بۆ وڵات و سەرو دانەی باش بهێننەوە.

– ئەمەیان نا. من لە وڵات هێنام و خزمی خۆشمە. بزانە چی پێکردم.

– ئاخر شارا گیان ئەوە باوکت پێی کردی، باوکی تۆش تیپێکی تایبەتە.

– باوەڕناکەم تیپێکی تایبەتی بێت. وێنەی زۆرە، ئێوە لەگەڵ خەڵکدا زۆر تێکەڵاو نەبوون. من لەقوتابخانە بووم، زۆربەی کچەکانی هاوڕێم هەمان گرفتیان هەبوو لەگەڵ دایک و باوکیاندا، جا هەندێکیان دایکیان باشتربوو لە هەندێ شتدا یارمەتی دەدان و هەندێ درۆی بۆ دەپۆشین.

– جا بۆ درۆشتان دەکرد؟

– ناچار دەبیت، ڕێگەی هیچت نادەن، لەماڵەوە دەبێت وەک ئەوەی ئەوان دەیانەوێ بژیت، لەدەرەوەی ماڵەوەش بە دزییەوە بەو جۆرەی کە خۆت دەتەوێ، بەڵام گەر پێشت بزانن لەخەت لاتداوە دارکاریت دەکەن و نابێ لای کەسیش قسەبکەی. هاوڕێیەکم هەبوو کە دەهاتە قوتابخانە یەکسەر دەچووە توالێتەکەو جلێکی تری لەبەردەکرد. قوتابخانەی گۆڕی بۆ ناوچەیەکی تر تا باوکی لەڕێگەی قوتابیانی ناسیاویانەوە ئەم شتانە نەبیستێتەوە. تەنانەت کوڕی برادەریشی هەبوو، ئەیوت لەداخی دایک و باوکم ئەوەی نەشێ دەیکەم جا با بمکوژن. دوایش بردیانەوە بۆ وڵات و ئیتر نەمان بینیەوە، شووی کرد، کوشتیان کەس نازانێ.

– تکایە بیبڕنەوە با بەس باسی کلۆڵی خۆمان بکەین دەست دەکەینەوە بەگریان. کاتی ئەوە نییە خوشکی خۆتان شووی کردووە، دەبێ دڵتان خۆشبێ، ئەرێ هیچ شەرابتان نییە؟ با بە سیحەتی زاوای ڕۆشنبیر پێکێک بخۆینەوە، خۆی لێرە نییە خوای لێرەیە.

– شارا وابزانم شتێکمان هەیە. وانییە.

– تۆ باشتری لێدەزانی. هەر نەبوو دەچین دەیکڕین. لەوانەیە لە ماڵەوە لای تۆش دەست بکەوێ، هانس هەردەم شەرابی باش دەکرێ.

– چی... چی بۆ شیرین خانمیش ماڵی خۆی هەیە. ئەی ئەم هانسە کێیە ؟

– ئەوەش چیروکێکی ترە.

- جا شیرین بۆ دەیشاریتەوە. باسی بکە.

- چی باسبکەم؟

- چۆن چی باسبکەی. بۆ ڕێزانی باسکە تا لەفشەفش بکەوێ.

- تۆ جارێ دەمت داخە، دەی خانمۆڵێ باسی هانسە فەنیم بۆ بکە کێیە. پێمەکەنە، دیارە ئێوەش کەم نین، وا خۆتان ماتکردووە و منتان دادۆشی.

- شیرین لە تۆ ئازاتربوو.

- تۆ دەمت داخە با خۆی قسەبکات. دەقسە بکە بۆ دەمت بووە بەتەڵەی تەقیوو.

- لاڵ بووە. شیرین ئێستا لەگەڵ پیاوێکی سوێدیدا دەژی.

- چی چی؟

- دکتۆرە، چاوشینە، ژنێک و سێ منداڵیشی هەیە. لەبەرخاتری ئەم شیرینە چاوڕەش و چاو سەوزە ئەوانی بەجێهێشتووە و لای ئەم خانمە دەژی. خێرا خانووشی کڕی تا پێکەوە بژین.

- بێ مارەبڕین پێکەوە دەژین؟! ئای چەند موهیمی. وەڵا بابە نەمانزانی لەمنیش ئازاتر هەیە.



# 16

دوو هەفتە تێپەڕی بەڵام هێندەی دوو ساڵ ڕووداوی سەیر ڕوویاندا. گۆڕانکارییەکان هێندە خێرا ڕوودەدەن، مرۆڤ بڕوا ناکات ژیان هێندە خێرا بڕوات، هەروەک لە ڕێگایەکی پەنجا کیلۆمیتریدا بێ و بە خێرایی سەدو هەشتا لێخوڕی.

ئەم سێ ژنە لەیەک بێزار نەدەبوون، شیرین دەچوو بازاڕی دەکرد، پاشان خواردنیان دروست دەکرد. هەر خەریکی قسەکردن بوون، بەهۆی هاتنەوەی ڕێزانیشەوە هەر خەریکی گاڵتەکردن و فشقیات بوون، کاتەکەیان بە خۆشی بەسەر دەبرد. لەو ماوەیەدا هانس جارێک سەری لێدان. ئێوارەیەکیان هەموویانی بردە دەرەوە بۆ نانخواردن، ئەو ئێوارەیەش زۆر پێکەنین، هانس ماوەیەک بوو ئێوارەیەکی وا خۆشی نەبردبووە سەر. ڕێزانی زۆر بەدڵبوو، زۆر قسەیان لەسەر ژیان و ژن کرد.

- باشبوو پێش ئەم شووەم نەمبینیت، ئەگینا لە شیرینم داگیر دەکردی. نا... ئەوەی خۆم باشترە هیچ نەبێ منداڵی نییە، جارێکی تر تۆبە شوو بە پیاوێک بکەم منداڵی هەبێ.

- کاتێ من و شیرین عاشقی یەکتر بووین کەسمان بیرمان لە شتی وا نەکردەوە.

- خۆشەویستیش زۆر جۆری هەیە. ئەمەی ئەمجارەی من بە دارشتنی پلانێک بوو کە خۆم بیرم لەهەموو لایەنەکانی دەکردەوە. کەناسیم هەستم کرد کەسێکی باشە و ئیتر وردە وردە خۆشەویستی

لە نێوانماندا دروست بوو.

– هەریەکە چارەنووسی جۆرێکە و کەس لەوی تر ناکات.

پاش نانخواردنەکە هانس داوای لە شیرین کرد بگەڕێتەوە لای خۆیان لەبەرئەوەی ئەو شەوە ناچێتەوە لای ئاننای کچی. ئەو ماوەیە تەواو بیری بە ژیانی خۆی و منداڵەکانییەوە خەریک بوو، بەڵام بە هیچ جۆرێ نەیدەویست واز لە شیرین بێنێت. تەنیا بیرکردنەوە لە کۆتایی پێهێنانی ئەم پەیوەندییە لەگەڵ شیرین دا توشی تەنگە نەفەسی دەکرد. بە دوو قۆڵی گەڕانەوە ماڵێ.

– ماندووم، مەگەر پەنجەکانی تۆ دەمارە گرژەکانی سەرم خاوکاتەوە و نیگا پرسۆزەکانی تۆ کەمێک ئارامی بەدڵەکەم بدات.

ئەو شەوە تا دەرنگێ دانیشتن. شت نەما باسی نەکەن. لە جیابوونەوە لەگەڵ سارا، لە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ منداڵەکاندا، پەیوەندی مێردە کۆنەکەی شیرین، ڕێزان و منداڵەکانی، شارا و دەریا.

تاقە شتێک کە شیرین نەیویست بە هانسی بڵێ باری دەریا بوو، خۆشی نەیدەزانی بۆ ئەو مەسەلەیە لە هەموو کەس دەشارێتەوە، تەنانەت لە هانس کە نزیکترین کەسە لێیەوە. زۆر شتیان بڕیاردا. هانس بەڵێنی بە شیرین دا بۆ دۆزینەوەی خانوو و ئیش یارمەتی ڕێزان بدات. پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێییەکی خۆی بکات کە لە دانمارکە شوێن و ئیش بۆ شارا بدۆزێتەوە.

– ئەو هاوڕێیەشم پزیشکەو ژنی نەهێناوە، بەڵکو لەگەڵ شارا ڕێکبکەون و ئیتر بۆ خۆی لەوێ بژی.

– گرنگ ئەوەیە شارا بچێت بۆ دانمارک.

– ئەوە باشترین چارەسەرە، لەوێ کەس بەدوایدا ناگەڕێت. لە ڕێگەی لێپرسراوانی سەنتەری ژنانیشەوە گواستنەوەکەی بۆ ئەوێ ڕێکدەخەین.

– زۆر گرانە بەلایەوە واز لە کەس وکاری بێنێ، بەتایبەتی دایک و برا بچووکەکەی.

– تێناگەم ئەو کەس و کاری بۆ چییە لە کاتێکدا ژیانیان لێ تاڵ کردووە. باوکی بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکات، خۆ باوکی وا هەر نەبێ باشترە.

– ئاخر ئەو وا بیر ناکاتەوە. تائێستا چەند جارێ چووە دایکی بینیوە، گوایە هەوڵدەدات باوکی ڕازی بکات بگەڕێتەوە لایان.



– گەر کاری وا بکات زۆر هەڵەیە. چونکە ئەوان لێی خۆشنابن. جارێکیان ژنێکیان هێنایە نەخۆشخانە کە لە دەست مێردەکەی ڕای کردبوو. پاشان بەرێکەوت مێردەکەی دەیبینێ خێرا پەلاماری دەدا و هەوڵی کوشتنی دەدا. ئەمە لەکاتێکدا ژنەکە جیابووەتەوە لێی. لەبەردەم دادگادا بەڵێنی دابوو کە پەیوەندی پێیەوە نەبێ. ماوەیەکیش بێدەنگ ببوو، بۆیە ژنەش پێی وابوو کە پیاوەکە گۆڕاوە و ڕێزی جیابوونەوەکەی ئەمی گرتووە.

بە هەزار شەرەشەق ڕزگارمان کرد. بۆیە بەڕای من با جارێ پەلە نەکات. گرنگ واز لەم مەسەلانە بێنە من پێشنیاری ئەوە دەکەم هەفتەی داهاتوو پێش ئەوەی دەست بەکار بکەیتەوە سەفەری لایەک بکەین. بۆ کوێ بڕۆین بەڕای تۆ؟

– بۆ لای دایک و براکانم.

– بەڕاستتە؟

– نا گاڵتە دەکەم. نازانم خۆت بڕیار بدە.

– دەمەوێ تۆ بڕیاربدەی، حەزت لە چ وڵاتێکە ببینی؟

– فەرەنسا و لەویش پاریس.

– لەوە ئاسان تر نییە. دەتوانین دوو ڕۆژ لە پاریس بمێنینەوە و پاشان بچین بۆ نیس، ماوەیەکیش لەسەر دەریا بین. تا ئێستا چوویت بۆ سەر دەریا؟

– نا نەچووم. بەڵام ناتوانین سەفەرەکەمان دوابخەین تا ئاننا چاکدەبێتەوە و ئەو ئیشانەی ڕێزان و شاراش جێبەجێ بکەین.

– بە نیازم منداڵەکانیش بهێنم.

– بۆ ڕازی دەبن؟

– پێیان نالێم کە تۆ لەگەڵمان دێیت، بە هەمان فڕۆکە سەفەردەکەین، لەوێ بۆ یەکەمین جار دەتبینن، لە هوتێلەکەش لە ژوورەکەی تەنیشت منەوە دەبیت، پاشان شتەکان ڕێکدەخەین.

– من پلانێکی وا بەباش نازانم. بۆ درۆ لەگەڵ منداڵەکانت بکەین، لەوانەیە ئەو کات بە تەواوەتی هەردووکمان ڕەفزبکەن.

– کەواتە پێکەوە سەفەر دەکەین، یان دوای دەخەین بزانین ئاننا وەزعی چۆن دەبێت، دەتوانم

رۆژێ بیانهێنم بۆ ئێره. لەوانەشە ڕاست بکەیت. نازانم چیبکەم، پێویستم بەوەیە ماوەیەک تەنیا لەگەڵ تۆدا بم و بەس. گەر وا بەردەوام بم مێشکم دەوەستێ. یان ئەوەتا هەفتەیەک ئیجازە وەردەگرم.

– باشتر وایە یەکە یەکە کێشەکان چارەسەربکەین. ئێستا ئەوەی گرنگە ئاننایە. چۆن یارمەتی بدرێ و چاکبێتەوە.

– دەزانم چۆن چاکدەبێتەوە. ڕۆژێک دەیهێنم بۆ ئێره. لەوانەیە بە بینینی تۆ تورە بێت و زمانی بکرێتەوە، چونکە دکتۆرەکان دەڵێن ئەم قسەنەکردنەی نەفسییە. ئەو ڕۆژە تۆ خواردن ئامادە مەکە و پیدزە دەخۆین. هەندێ دیاریشی بۆ دەکڕین.

– من دەزانم چی بۆ دەکڕین، هەندێ کراسی سەیر سەیر کە لە دوکانە شەرقییەکان دەفرۆشرێ، لەبەریان ناکا و تورەبێت. جا ڕەنگە ئەمە وای لێبکات لە ناکاوا بکەوێتە قسەکردن.

ئێوارەیەکی درەنگ بوو، هێشتا ئاسمان ڕووناک بوو. ڕێزان و شیرین و هانس چوونە دەرەوە سەیری خانوویەک بکەن. شاراش ئەمەی بەهەل زانی، بەتایبەتی هەموو منداڵەکان خەوتبوون و چووە دەرەوە و تەلەفۆنێکی بۆ دایکی کرد، هێندەی نەبرد دایکی گەیشتە لای. شارا خێرا بەرەو ڕووی دایکی ڕایکرد و باوەشی پێداکرد.

– چییە کچم بۆ وا بێ تاقەتی. دەریا شتێکی لێهاتووە؟

– نا دایە گیان. تەنیا بێتاقەتم، لە ژیان بێزاربووم، بیر لەوە دەکەمەوە خۆم بکوژم، گەر تۆو دەریا نەبونایە بێ یەک و دوو ئەو کارەم دەکرد.

– خوا ئەوانە بگرێ کە تۆیان گەیاندە ئەم ڕۆژە، باشە ئەوان کە تۆیان لە کەس و کارت کرد بۆ مشورێکت ناخۆن. بۆ تۆیان وا بە تەنیا بەجێهێشتووە.

– دایە کێشەکە ئەوەیە ناوێرم بچمە هیچ شوێنێک و بە ئازادی بژیم، دەبێ هەردەم خۆم بشارمەوە، ئەگەر باوکم و مێردەکەم وازم لێ بێنن. دەچمە شارێکی تر، شارێک کە کەس نە ئێوە و نە من بناسێ. دایە گیان لەبەر خاتری دەریا.

– کچی من خۆ ئەوە بە دەست من نییە، دەڵێن بە یەک مەرج وازی لێدەهێنین، کە بێتەوە لای مێردەکەی و بەو جۆرە بژی کە ئێمە بڕیار دەدەین.



– ئەی نامکوژن؟

– بڵێی ئەوەندە بێ غیرەت بن.

– زۆر ترسم لەوە هەیە. دەریاش دەڵێ گەر بڕۆیتەوە دەتکوژن.

– جا دەریا چوزانێ قسەی وابکات.

– دایە بلیمەتێکە بۆخۆی، ئەوە نییە هەر لەگەڵ گەورەدا ژیاوە قسەکانی لە هی منداڵ ناکات. نەک تەنیا قسەکانی بەڵکو بیرکردنەوەشی وەکو گەورە وایە.

– نەنەت بمرێ، ئاگر لەوانە بەربێ ئەم فیتەیان بۆ داناوی.

– دایە کەس ئەم فیتەی بۆ دانەناوم، خۆ خۆت دەزانی چییان پێدەکردم.

– چییان پێدەکردی کچم؟

– چۆن دایە گیان، بۆ خۆت نازانی.

– کچم چەند جارم پێ وتووی ژیانی هەموو ژنێ وایە، لەوەتی ئەم خوای گەورەیە دروستی کردووین هەروا بووە.

– نا دایە گیان وا نییە. گەر تۆ ڕازی بی وات لێبکەن ئەوا بەردەوام دەبن. ئەوانیش هەروەک تۆ وادەزانن دەبێ وابێ. بەڵام کە ڕێگەیان لێبگری و نیشانیان بدەی کە ژیان وا ناڕوا بەڕێوە، وردە وردە کەمی دەکەنەوە.

– چۆن نیشانیان بدەی، وەک تۆ شکاتی پۆلیسیان لێبکەی و بیانخەیتە زیندانەوە!

– وا باشترە، باشە تۆ ئێستا باوکم هەروەک جاران لێت دەدا؟

– لێم دەدا بەڵام کەمتر. شەقێک، چەپازللەیەک.

– کەواتە سوپاسی من بکە.

– نا لەبەر ئەوە نییە، باوکت لەوەتی تۆ ڕۆیشتووی، دەڵێی ئەم دنیایەی بەسەر شانەوەیە. لەگەڵ مێردەکەتدا لە مشت و مڕدان. خەریکی کاریشن. دەیانەوێ بچنەوە بۆ وڵات و لەوێ کارێک بکەن. ئەوە ماوەیەکە پارەی لە دەست نابێتەوە، تێر سکی خۆشمان نان ناخۆین.

– ئەوەی من بزانم دەبێ پلانێکیان لەژێر سەردا بێت. ئەم ماستە بێ موو نییە. گەڕانەوەشیان شتێکی ئاسایی نییە، باوکم دەیویست هەموو کەسوکاری بێنێ بۆ سوێد، ئێستا خۆی دەگەڕێتەوە.

ئەی براکانم چی دەڵێن؟

– ئەوان ناگەڕێنەوە.

– دایە گیان خۆ ئێستا پێت نەوتوون کە هاتووی بۆ لای من؟

– نا کچم چۆن شتی وادەکەم. چۆن شتی وایان پێ بڵێم.

– ئەی چۆن باسی ئەوەت لاکردن کە منت بینیوە؟

– وتم جار جارە تەلەفۆنم بۆ دەکات. دوای ئەوەش باوکت دەزگایەکی هاوەڵ تەلەفۆنی کڕیوە کە ژمارە نیشاندەدا و تۆماریشیان دەکات. کە دێنەوە تەماشای ئەو ژمارانە دەکەن بزانن کێ تەلەفۆنی بۆمان کردووە.

– دایە گیان دەبێ بڕۆمەوە چونکە دەریام بە خەوتوویی بەجێهێشتووە.

– ئەی چۆن بەتەنیا بەجێتهێشتووە؟

– بە تەنیا نییە، بەڵام دایە تکایە پێیان نەڵێیت کەمنت بینیوە، گەر بەڵێنی ئەوەم بدەیتێ من جار جارە دەتبینم.

شارا متمانەی بە دایکی دەکرد و لەو باوەڕەدا نەبوو کە درۆی لەگەڵ کردبێ، بۆیە کە دایکی ڕۆیشت بێ ئەوەی سەیری ئەملاو ئەولای خۆی بکات، بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە. کە گەیشتەوە دەریا لەبەردەم دەرگاکەدا دانیشتبوو و دەگریا، کە شارا ئەمەی بینی زۆر شێواو باوەشی پیاکرد.

– دەریا گیان بۆ هەستاوی.

– چۆن تۆ دەڕۆی نەنە دەبینی، ناترسی کەسێکیان دوات کەوتبن.

– باوەڕناکەم دایە کاری وایکردبێ و بە باوکم یان براکانمی وتبێ.

– با یەکێکیان بە دواتەوەبوون.

– چیت وت کچم؟ ئەی چۆنت زانی کەمن چووم نەنە ببینم؟

– باشدەزانم، نەنەش بە باوکتی وتووە، ئەویش برا گەورەکەتی ناردووە لەگەڵی تا بەدواتەوەبێ.

– دەریا گیان دڵەکەی دایە پێم بڵێ چۆن ئەم شتانە دەزانی؟

– دەزانم، خەومبینی.

– دەریا گیان بڕوات بەخەو نەبێ.



– نا دایە هەر خەونییە. ڕاستییە.

– کچی دایە دەزانی من کە گوێم لەو قسانەی تۆ دەبێت زۆر دەترسم.

– نا دایە مەترسە، بەڵام بڕوام پێبکە. ئێستا ئەوان دەزانن من و تۆ لێرە دەژین.

لەم کاتەدا ڕێزان و هانس و شیرین هاتنە ژوورەوە و خەریک بوون بەسەر شارا و دەریادا بکەون.

– ها ئەوە چییە لێرە دانیشتوون.

– دەریا خەبەری بووەتەوە و دیارە خەوی ناخۆشی بینیوە.

– نا خەوی ناخۆشم نەبینیوە، شیرین دەزانی دایە چووە نەنە ببینێ.

– چی... ڕاستە شارا؟

– ڕاستە. ئەمە یەکەمین جاریش نییە.

– لە کوێ دەیبینی؟

– لەم باخچەیەی نزیکمان؟

– شارا گیان ژیانی خۆتت لێ زیادە.

– نا دایکم بەڵێنی پێداوم کە بە کەس نەڵێ و بە دزییەوە دێت من دەبینێت.

– جا تۆ بڕوا دەکەیت؟

– بەڵێ متمانەم بە دایکم هەیە.

تەواوی مەسەلەکەیان بۆ هانس گێڕایەوە، ئەویش پێی وابوو کە لە چەند ڕۆژی داهاتوودا زۆر ئاگاداربین و بزانین خزمەکانی شارا لەم ناوە دەردەکەون یان نا، گەر وابوو تەلەفۆنی پۆلیس بکەین و شوێنەکەی شاراو دەریا بگوێزینەوە.

شیرین دەریای هەڵگرت و بردیە ژووری نووستن و لەگەڵی پاڵکەوت تا خەوی لێکەوتەوە و شاراش ترسێکی زۆری لێنیشت و نەیدەویست بڕوا بەوە بکات کە دایکی خیانەتێکی وای لێکردووە. چونکە هەموو جارێ بە دایکی دەوت نابێ کەس بزانێ. شیرینیش پیاوی ئۆتۆمبیلە سوورەکەی وەبیر هاتەوە و تەواو دڵی داخورپا، چونکە ئەوە چەند ڕۆژێکە دێت و دەچێت بەبێ ئەوەی سەرنجی ئەوە بدات کە کەسی بەدواوەیە.

شیرین لەبەر کێشەی دەستە خوشکەکانی، خۆی بیرچووبووەوە. ئەمە جگە لەوەی هانسیشی لەگەڵ خۆی وەگیر هێنابوو، ئەویش نەیدەویست دڵی بشکێنێ. لەبەرئەوەی ئەو ماوەیە زۆربەی کات لای ئاننایە و زۆر کەم شیرین دەبینێ، جا بۆ ئەوەی دڵی ڕاگرێ لەو ماوەیەدا مشووری هاوڕێکانی شیرینیشی دەخوارد. دوای چەند ڕۆژێک خانوویەکی بۆ ڕێزان دۆزییەوە. بەڵێنی پێدا کاریشی بۆ پەیدابکات. شیرین بەم کارانەی هانس دڵی خۆشدەبوو.

– هانس تا ئێستا دەستت لە ژنەکەت بەرزکردوەتەوە؟

– نا، بەڵام وا تێمەگەن کە پیاوانی سوێدی لە ژنەکانیان نادەن. نەک تەنیا لەژن دەدەن بەڵکو هەندێ جار لەبەر ئێرەیی ژنەکانیشیان دەکوژن، جیاوازییەکە ئەوەیە لای ئێمە ئەو تاوانانە بە ناوی شەرەفەوە ئەنجام نادرێن، بەڵکو هۆی تریان هەیە، بەشێک لە پیاوان لە ئەنجامی غیرە و گرفتی ئەلکهول کاری وادەکەن، لەهەمان کاتدا ئەو پیاوانەی لای ئێمە دادگا حوکمیان دەدات و لێیان خۆشنابێ. گرفتی ژنان لە هەموو شوێنێک هەیە، بەڵام لە هەر کۆمەڵگە و کولتوورێکدا بە چەشنێکە.

شیرین بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان، هانس گەیاندیە ماڵەوەو خۆشی ڕۆیشت. کە گەڕایەوە گڵۆپەکەی دانەگیرساند و بەردەوام سەیری خوارەوەی دەکرد، ئۆتۆمبیلە سوورەکەی نەبینی، هەرچەندە درەنگ بوو، کەچی هەر زوو زوو سەیرێکی خوارەوەی دەکرد.

شیرین ئاگای لەوە نەبوو ئەو ماوەیە ئەو پیاوەی بە دواوە بووە و زانیاری لەسەر ئەم کۆکردۆتەوە، بەڵام بۆ مێردە کۆنەکەی نا، بەڵکو بۆ "سارا"ی ژنی هانس. کابرای پشکێنەریش زۆر چوست کاری دەکرد. لەو ماوەیەدا ڕۆژێک کابرای پشکێنەر هات و چاوەڕوانی پۆستەچییەکەی کرد و بەوردی تەماشای دەستی کرد تا کۆدی دەرگاکە بزانێ. کە ئەویش ڕۆیشت چووە سەرەوەو تەواو دڵنیا بوو ئەو ژنەی لەگەڵ هانس دەژی ناوی شیرین عەزیزە. زۆر هەوڵی دا لە ڕێگای سیستەمی تایبەتی کۆمپیوتەرەوە زانیاری دەربارەی دانیشتووانی ئەو کۆمیونەی دەست کەوێت. زانیارییەکی ورد لە سەر شیرین بدوزێتەوە، هەوڵەکەی بێ ئەنجام بوو.

ئیتر پۆستەچییەکە بووە سەرچاوەی ڕزق بۆ ئەم کابرایە. ڕۆژێکیان پۆستەچییەکە بە دەستەیەک نامەوە چووە ئاپارتمانێکی دراوسێی ماڵی شیرین، بەڵام پاسکیل و سندووقی نامەکانی لەبەر



دەرگای دەرەوە بە جێهێشت، کابراش ئەمەی بە هەل زانی و خێرا کۆنترۆڵێکی سندووقەکەی کرد بزانێ نامەی شیرینی تیا نییە. چەند ڕۆژێکی خایاند تا نامەیەک بۆ شیرین هات و ئەویش زۆر بەخێرایی پێش ئەوەی پۆستەچییەکە فریابکەوێت بێتە دەرەوە، نامەکەی شیرینی دەرهێنا و بردی.

نامەیەکە لە... ناو و ناونیشان و ڕۆژو مانگ و ساڵی لەدایکبوونی تێدایە لەگەڵ چوار نمرەکەی. جارێکی تر بە هۆی کۆمپیوتەرەوە چووە ناو سیستەمێکی تایبەتەوە، بۆی دەرکەوت ئەم ناو و ژمارانە هی کەسێکن کە هەموو زانیارییەکانی نهێنین. سارای ئاگادارکردەوە و داوای بیست هەزار کرۆنێکی تری لێکرد کە بتوانێ بەکاربهێنێ بۆ وەرگرتنی زانیاری و کردنەوەی کۆدە نهێنییەکان.

سارا بێ دوودڵی پارەکەی بۆ هێنا و داوای لێکرد بەزووترین کات ئەو کارە جێبەجێبکات گەر پێویستی بە پارەی تریش هەبوو ئامادەیە. بۆ سارا گرنگ ئەوەبوو ئەو ژنە لە مێردەکەی دوورخاتەوە و ئیتر بیری لەوە نەکردبووە چی لەو زانیاریانە دەکات.

سارا لە هانس خۆش نەدەبوو، ڕاستە لەم چەند ساڵەی داوییدا هەریەکە ژیانی خۆی هەبوو. سارا زیاتر لە گەڵ هاوڕێکانی دەچووە دەرەوە و کاتی بەسەردەبرد، هانسیش کاتی خۆی زیاتر بۆ کارەکەی و منداڵەکانی تەرخان کردبوو. زۆر جار لەگەڵ منداڵەکانی دەچوونە دەرەوە، بەڵام هەموو پێکەوە سەفەریان دەکرد.

دەیەوێ بە هەرچ نرخێ بێت ئەم درزەی کەوتۆتە نێوانیان چارەسەر بکات. خودی هانس ئەوەی بە مەحاڵ دەزانی و هەر ئامادە نەبوو قسە لەگەڵ دایکی ساراش بکات کە بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیداو لە بەڕێوەبردنی کاروباری نێو ماڵیش یارمەتیەکی زۆری دان. ئێستاش دایکی سارا پلانێکی سەیری بۆ کچەکەی داناوە بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندییەی هانس لەگەڵ ئەو ژنە ببچڕێ.

"جۆرج"ی پشکێنەریش هەر خەریکی زانیاری کۆکردنەوە بوو لەسەر شیرین. لەماوەیەکی کورتدا پۆلیسێکی ناسراوی دۆزییەوە و پارەیەکی باشی داپێی بۆ ئەوەی ئەو زانیاریانەی کە ئەو پێویستی پێیەتی سەبارەت بە شیرین دەستی کەوێت.

– زانیاری سەبارەت ئەو کەسەی کە تۆ بەدوایدا دەگەڕێت زۆر گرانە، ئەم کەسە ناو و ناونیشان

و مێژووی لەدایکبوونی و چوار ڕەقەمەکەی گۆڕاوە. ئەمەش بۆ هەموو کەسێ ناکرێ، تەنیا لەهەندێ حاڵەتی تایبەتدا نەبێت.

– ئەی چی بکەین؟

– کات و هەندێ پارەی تری دەوێت.

جۆرج خێرا پەیوەندی بە ساراوە کرد و هەواڵە تازەکانی پێ گەیاند، سارا دووبارە ئامادەیی خۆی نیشان دا.

سارا پاش ئەوەی کە زانی هانسی مێردی و ئەو ژنە لەو خانووەدا دەژین، لەگەڵ دایکی ڕێککەوتن ئەو شەوەی هانس لەوێ دەخەوێ کلیلی خانووەکەی بدزن کۆپی بکەن. دایکی ئەو شەوە لەوێ بوو هەموو کارەکانی بۆ سارا جێبەجێ کرد. کاترینا هەستی دەکرد دایکی و دایەگەورەی شتێکیان لە ژێر سەردایە، نەیدەزانی مەسەلەکە چییە، بەزەیی بە باوکیدا دەهاتەوە. کە باوکی خەبەری بووەوە، خێرا چوو نانی بەیانی بۆ ئامادەکرد و پێکەوە چوونە دەرەوە. لە ڕێگا تا ئەم گەیشتە قوتابخانە هەر پرسیاری لە باوکی دەکرد:

– بابە چی بوو بەهۆی جیابوونەوەی تۆ و دایکم؟

– بڵێم چی کچم، ماوەیەکی زۆرە پەیوەندی نێوانمان ساردە، نازانم لەوانەیە ئەم ساردییە جۆرە بۆشاییەکی عاتیفی دروست کردبێ، بۆیە من لەڕووی عاتیفییەوە هۆگری کەسێکی تر بووم.

– ئەی چۆن خۆشتویست؟

– نازانم، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، تەنیا لەیەکەم بینینەوە تەواو خۆشمویست.

– دایەشت هەروا بە یەکەمین دیتن خۆشویست؟

– نا، من و دایکت ماوەیەکی زۆر هاوڕێ بووین، پاشان بوو بە خۆشەویستی، ئەوەندە تێکەڵاو بووین واماندەزانی بەبێ یەکتر ناژین.

– ئەی بۆ ئێستا بێ یەکتر دەژین؟

– ژیان لە گۆڕاندایە و ئێمەش بەردەوام دەگۆڕێین، دەبێ مرۆڤ بەو گۆڕانکارییانە خزمەتی ئەو پەیوەندییە بکات، من و دایکت وامان نەکرد، هەریەکە لە ئێمە ڕێگایەکمان هەڵبژارد بەشێوەیەک کە لە یەکتر دوورکەوتینەوە، پێکەوە لە یەک ماڵ دەژیاین، بەڵام لەیەکترییەوە دووربووین.



– ئەی لەگەڵ ئەم ژنەدا هەمان شت دووبارە نابێتەوە؟

– لەوانەیە گەر هەمان هەڵە دووبارە بکەینەوە.

– ئەی ناتوانن لەگەڵ دایەدا ئەم هەڵەیە ڕاست بکەنەوە؟

– تازە نا، باوەڕناکەم.

– ئەی چۆنە تۆ ئەم ژنەت وا خۆشویست؟

– کچێکە، خەڵکی ئەم وڵاتە نییە، هەستێکی ناسکی هەیە، بیر لە دەوروبەری خۆی دەکاتەوە، جوانە.

– لە دایە جوانترە؟

– دایەشت زۆر جوانە. من مەبەستم ئەوە نییە تەنیا لەبەر جوانییەکەی ئەوم خۆشویستبێ. پێم بڵێ تۆ تا ئێستا کەسێکت خۆشویستووە؟

– نا ناتوانم بڵێم کەسێکم بەتەواوی خۆشویستبێ.

– کە کەسێکت خۆشدەوێت، یان ڕاسترە بڵێم کەکەوتیتە داوی خۆشەویستی کەسێکەوە ئەوکات دەزانی ئەو هەستە مانای چییە. لەو جۆرە هەستەدا تەنیا خۆت بڕیار نادەیت.

– دەتوانین ڕۆژێک بیبینین؟

– بیرم لەوە کردۆتەوە. بەڵام دەمەوێ ئاننا بێتەوە سەرخۆی.

– ئەو دەیەوێ ئێمە ببینێ؟

– بێگومان، ئەو لەو باوەڕەدایە پەیوەندی من و دایکت نابێ کار لە پەیوەندی من و ئێوە بکات.

پاش ئەم گفتوگۆیە کاترینا تۆزێ هەستی بە ئارامی دەکرد. بگرە حەزی دەکرد ئەو ژنە تازەیەی باوکی ببینێ، بڕیاریدا قسە لەگەڵ ئاننا بکات و واز لەم مانگرتن و بەزمەی بێنێ و لەوە زیاتر ئازاری باوکی نەداو نیگەرانی نەکات. کاترینا لەو باوەڕەدابوو کە دایکی دەزانێ ئەم مەسەلەیەی ئاننا شتێکی دەستکردە، هەر بۆیە وەک باوکی نیگەران نییە و گوێی ناداتێ.

# 17

له ماوەی ئەم دوو مانگەی دواییدا له ژیانی هەرسێکماندا زۆر گۆڕانکاری ڕوویاندا. هەفتەی پێشوو بڕیارماندا به بۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر یەکەم دیدارمان له سەنتەری ژنان ئاهەنگێ بگێڕین. له سەرەتادا هەر ئێمەی لێبوو، پاشان دوو ژنی سوێدی هاتن، بەڵام هێنده نەمانەوە. زۆر بێ تاقەت بووین. دەمانویست شتێ بدۆزینەوە و سەری خۆمان گەرمبکەین. هانس له ڕێستەورانێکی دەرەوەی شار شوێنی بۆ گرتین، کچێکیشی بۆ دۆزیینەوە تا ئەو چەند سەعاتە لای منداڵەکان بێت. من زۆر تکام له دەریا کرد بەهیچ جۆرێ خۆی دەرنەخا، ئەو ئێوارەیە زۆرمان گوت و زۆرمان خوارد و زۆر پێکەنیین، بەڵام گریانەکەمان بۆ ماڵەوە هەڵگرت. چونکە گریان وەک بەشێکی ژیانمانی لێهاتبوو، بۆ ئێمە وەک ژەمی چوارەمی لێهاتبوو، هەر ڕۆژێک نەگریابایین ئەوا دەریا بیری دەخستینەوە.

ژیانی من و ڕێزان بەرەو باشتر دەڕوات، بەڵام ئەوەی نیگەرانی کردبووین باری دەروونیی شارا بوو، تەواو تێکشکابوو. هەرچەندمان دەکرد هێمن نەدەبووەوە. هانس پێشنیاری کرد که بیبەینە لای پزیشکێکی نەفسیی. هەوڵمان دەدا ڕازی بکەین بچێ بۆ دانمارک. لەوێ بەڵێنیان دابوو که



یارمەتی بدەن، لەگەڵ لایەنە ڕەسمییەکانیشدا وا ڕێککەوتین بۆ گواستنەوەکەی کۆمەکی بکەن، بەڵام ئەو دوودڵبوو، دەیوت من لێرە ئێوەم هەیە قسەتان لەگەڵ بکەم، لەوێ تەنیاتر دەبم. ئیتر بەهەموو جۆرێ دەمانویست ڕازی بکەین سەفەرێک بکات. تەنانەت بەڵێنم پێدا له سەرەتادا منیش لەگەڵی بچم. شتێکی تر که نیگەرانی کردبووین بینینی دایکی بوو.

باری دەروونیی هانس و منداڵەکانی بەرەو باشی دەڕۆیشت، منداڵەکانی دەبینی و پێکەوەش سەفەریان کرد، لەو سەفەرە دەبوایە منیش بڕۆیشتمایە، به هانسم وت باشترە ئەمجارەیان خۆی و منداڵەکانی بڕۆن. بەڵام هەموو ڕۆژێ تەلەفۆنمان بۆ یەکتر دەکرد. ئیتر ئەم پەیوەندییە گەرمەی من و هانس وای له منداڵەکان کرد وردە وردە هەردووکمان قەبووڵ بکەن، ساراش داوای درێژکردنەوەی ماوەی جیابوونەوەکەی کردبوو.

پەیوەندی من و هانسیش تا دەهات قوڵتر دەبووەوە و شێوەیەکی تری بەخۆوە دەگرت. ئەمەش زیاتر ئارامی و سەقامگیریی پێدەبەخشیین. ئەوەی سەیر بوو بەلامەوە هانس سەبارەت به ڕابردووی من نەیدەپرسی. هەندێ جار شتم بۆ باسدەکرد. بەڵێنی پێدام که پاش جیابوونەوە له سارا مارەم ببڕێ لەگەڵم بێتەوە بۆ وڵاتەکەم، یارمەتی براکانیشم بدات.

ڕێزان و منداڵەکانی گواستیانەوە بۆ خانوویەکی تر. منداڵەکانی دڵخۆشبوون، دوو هەفتە جارێکیش باوکیان دەبینی و ژیانیان ئاسایی ببووەوە. هەموو جارێکیش کەسێک دەهات و منداڵەکانی له ڕێزان وەردەگرت و دەیبردن بۆ لای باوکیان، پاشان هەر ئەو کەسە دەیهێنانەوە بۆ ڕێزان. کابرا بەڵێنی دابوو به هیچ شێوەیەک پەیوەندی به ڕێزانەوە نەبێت. جارێک داوای بینینی کردبوو، ڕێزان ڕازی نەبوو، منیش هەر لەڕێگەی ئەو کۆمپانیایەی که خۆم کارم لایان دەکرد، کارم بۆی دۆزییەوە و ئیتر لەهەمان نەخۆشخانەدا دوو قۆڵی فەڕاشیمان دەکرد.

تا له سەنتەری ژنان بیت ڕێکخراوە سوێدییەکان یارمەتیت دەدەن. بەڵام هەر که لەوێ دەرچووی ئیتر هێنده گوێیان پێنەدەدایت. من و ڕێزان قسەمان لەگەڵ "ئانالی و ئیلێنا" کرد که یارمەتی شارا بدەن، شارا خۆی زۆر پاسیڤ بوو، تاقەتی له ژیان نەمابوو، زۆر بێزاربببوو. گیانی به دەریا بوو. هەندێ جار بەزۆر شارام بۆ لای خۆم دەهێنا، یان پێکەوە دەچوین بۆ لای ڕێزان، بۆ ئەوەی هەست

بە تەنیایی نەکات. لەم دواییەدا زۆربەی کات ئەو هەر بە تەنیا بوو. منیش زۆربەی ئێواران زمانی سویدیم دەخوێند، بە ڕۆژیش لەگەڵ ڕێزان کارمان دەکرد.

ئێوارەیەک خواردنم ئامادەکردبوو چاوەڕوانی هانسم دەکرد، زۆری نەبرد تەلەفۆنی بۆکردم کە درەنگ دەگەڕێتەوە و دیسانەوە ئاننا نەخۆشە. هەرچەندە باوەڕمان بە نەخۆشییەکەی نەمابوو، پاش ئەوەی جاری پێشوو دەرکەوت کە بە ئەنقەست وای لەخۆی کردبوو تا باوکی ناچار بکات بگەڕێتەوە بۆ دایکی. هانسیش بەڕێکەوت ئەمەی لا ئاشکرابوو. جارێک گەڕابووەوە بۆ ماڵەوە بێ ئەوەی منداڵەکان ئاگایان لێبێ، پێش ئەوەی بچێتە ژوورەکەی ئاننا گوێی لێبوو کاتەرینا قسەی لەگەڵ دەکات:

– ئاننا من وام پێ باشترە کە وردە وردە خۆت چاکبکەیتەوە.

– نا من نامەوێ چاک ببمەوە تا بابە بۆ دایە بگەڕێتەوە.

– لەوە ناکات ئەمەت بۆ بەدیبێت، چونکە بابە ئەو ژنەی خۆشدەوێت. ئەمەی تۆ تەنیا وا لە بابە دەکات خەم بخوات.

– ئەی دایەش خەم دەخوات و دڵی ناخۆشە.

– لەوە ناکات ئەم فێڵەمان سەربگرێ، لەبەرئەوەی بابە هەر سەیری دایەش ناکات، تالێرەشە چەند جارێ تەلەفۆن بۆ ئەو ژنە دەکات.

– کاتەرینا تۆ ئەو ژنەت نەدیووە، نازانی کێیە، گەردەمزانی دەچووم دەمکوشت.

– نازانم کێیە. بەلام دیارە بابە خۆشی دەوێت، ئەو ژنە سویدی نییە، بابە دەڵێت زۆر جوانە.

– من هەر بۆیە ڕقم لەو بیانیانەیە، دێنە ئێرە و باوکیشمان لێ داگیردەکەن.

ئیتر ئەو ئێوارەیە هانس خێرا هاتەوە لە لایەکەوە دەگریاو لە لایەکەوە پێدەکەنی. منیش لە دڵی خۆمدا وتم دیارە ئەمیش توشی نەخۆشییەکەی ئێمە بووە.

– ها چی ڕوویداوە؟

– بڕواناکەی چی ڕوویداوە. بڕواناکەم. منداڵێکی وا بەمجۆرە بیربکاتەوە. ئەوە مانگێکە ژیانمان لە خۆمان تێکداوە، شەو نەبووە بە ئاسانی خەوم لێبکەوێت، بڕوا دەکەی کە ئاننا لەم ماوەیەدا فێڵی لێکردوین.



ئیتر زانیم مەسەلەکە چییە، بە هەموو شێوەیەک دڵخۆشیم دەدایەوە، کە منداڵ هەموو کارێک دەکات بۆ ئەوەی دایک و باوکی لێک جیانەبنەوە. هانس پێی وابوو سارا ئاگای لەم مەسەلەیەیە، یان کەسێکی تر ئەم پلانەی بۆ ئاننا داناوە.

ئاننا داوای لێبووردنی لەباوکی کردبوو، پاش سەفەرەکەشیان پەیوەندی ئاننا و باوکی باشتربووبوو. بەلام هەوڵی دەدا منداڵەکانی نەبینم، منیش خۆم لەو مەسەلەیە گێل دەکرد. ئەو ڕۆژانەی کە منداڵەکان دەهاتنە لای داوای لێدەکردم بچمە لای ڕێزان یان شارا. کە دەگەڕامەوە دەمبینی شتەکانی منی هەموو کۆکردوەتەوە و لەبەردەست لایداون. هەروەک ژنێک لەو ماڵەدا نەژی. ئێوارەیەک کە هاتەوە پێی ڕاگەیاندم کە بۆ ڕۆژی داهاتوو پاش ئیش ناگەڕێتەوە، دەچێتە جەژنی لە دایکبوونی ئاندەشی کوڕی.

– بۆ خەوتنیش نایەیتەوە؟

– لەوە ناکات. دیارە دایکی ڕێستەورانێکی گەورەی گرتووە و تا درەنگێ لەوێ دەمێننەوە. منیش تێناگەم دایکی هەرگیز شتی وای نەکردووە، گوایە ئەندەش وای ویستووە، منیش لەگەڵی بم. تۆش دەتوانی بچیتە لای شارا.

ئەو ئێوارەیە زۆر دڵم ناخۆش بوو، پێویستم بە بیرکردنەوە بوو، پێویستم بە باوکم یان دەریا بوو دڵی خۆمیان بۆ بکەمەوە، هەوڵم دا خۆم هێمن بکەمەوە بۆ ئەوەی بە ڕوونی بیربکەمەوە. کتێبەکانم دەرهێنا بەو نیازەی تۆزێ بخوێنم، زەنگی دەرگا لێدرا، منیش بێ ئەوەی بیربکەمەوە، لە چاوی دەرگاکەوە سەیربکەم، خێرا دەرگاکەم کردەوە. وامدەزانی هانسە شتێکی بیرچووە.

سەرسام بووم، دەبێ ئەم ژنە کێ بێ، بۆ لە دەرگای ئێمە دەدا، هەڵوێستەیەکم کرد وا هەستم کرد ئەم ژنەم لە شوێنێک بینیوە، لەکوێ، نەدەهاتەوە بیرم.

– هەتاو دەتوانم بێمە ژوورەوە و چەند قسەیەک بکەین؟

من ئەوەندەیتر پەشۆکام، دڵم کەوتە کوتەکوت و ئەژنۆکانم دەلەرزین، دەمم تەتەڵەی دەکرد و نەمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە.

– خۆت بەتەنیای؟ دەتوانم بێمە ژوورەوە؟

– فەرموو.

– دیارە نامناسی. بەڵام من تۆ زۆر بەباشی دەناسم، هەموو شتێک لەسەر خۆت و ژیانت... مێردەکەت، ژیانی تۆ لە یەتۆبۆری، شارا و ڕێزانی هاوڕێت، دەزانم.

بە جارێک هەرەسم هێنا، پشتاو پشت دانیشتم، ئەویش سەیری دەکردم و سەری ڕادەوەشان. نەک هەر بە سوێدی بەڵکو بە زمانەکەی خۆشم وشەیەک چیبوو بۆم نەدەهات. تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە ئەم ژنەی کە هەموو شتێک دەربارەی من دەزانێ دەبێ کێ بێ!

– دیارە پێشتر منت نەبینیوە، بەڵام لەمەودوا زوو زوو یەکتر دەبینین، هەتا شتەکانی نێوانمان یەکلا دەکەینەوە.

ئەوەندەی تر هەناسەم لێبڕا. دەبێ کێ بێ، خۆ من هیچم لەگەڵ کەسدا نەبووە، وا بەم چەشنە قسەم لەگەڵ دەکا. دڵنیابووم لەوەی کە من ئەم ژنەم بینیوە، لەکوێ؟ کەی؟

– من و تۆ لەمەودوا زوو زوو یەکتر دەبینین، تا ئەو مەسەلەیە یەکلا نەکەینەوە وازت لێناهێنم. قسە زۆرە بیکەین، هەتاو خان. گەر ڕێکیش نەکەوتین ئەوا مێردەکەت دەکەینە ناوبژیوان.

هەر هیچ تێنەگەیشتم، دەبێت ئەم ژنە سوێدییە پەیوەندی بە مێردەکەمەوە چی بێ، بڵێی ژنێکی نەکوشتبێ یان کارێکی خراپەی نەکردبێ و منی بە شەریکی خۆی دابێتە قەڵەم، باشە ئەم ژنە چۆن منی دۆزیوەتەوە. لەکاتێکدا کەس ناونیشانی من نازانێ، یان من ناو و ڕۆژ و مانگ و ساڵی لەدایکبوونم گۆڕیوە، بڵێی لە پۆلیسەوە نەهاتبێ، لەوەش ناکات پۆلیس بێت. ڕق و کینە لە دەمووچاوی دەبارێ، دەڵێی من کەسێکم کوشتووە، ئەوەندە بیرۆکە بە مێشکما دەهات کە بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی وشەیەک چییە لە دەمم بێتە دەرەوە.

– چییە زمانت لەدەما نییە، خۆ هێندە سوێدی دەزانی وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە، وانییە؟ دەقسەبکە ئەوە چیتە!

– من لەتۆ تێناگەم. من مێردم نییە.

– هەرگیز مێردت نابێ. تاقە مێردێکت هەبوو کە جیابوویتەوە لێی، پاش ئەوەش شوو بەو کەسە ناکەی کە بە تەمایت، ئەگینا ژیانت لێدەکەم بە شەوە زەنگ.

– مەبەستت چییە؟ تۆ کێیت؟ چیت لەمن دەوێ؟

– ئەم پرسیارەتم بە دڵە. دەبوایە هەر لەسەرەتاوە ئەم پرسیارەت بکردایە هەتا وەڵامم بدایتایەوە.



من سارام، ئێستا زانیت کێم.

ئەوجا بیرم کەوتەوە، هەموو ڕۆژێ کە ژوورەکەی هانسم پاکدەکردەوە سەیرێکی وێنەکەیم دەکرد کە بەسەر مێزەکەیەوە دایانابوو، بەڵام ئەم سارایە لە سارای وێنەکە ناچێ، ئەو بزەیەکی گەش لەچاوەکانیدا دەبینرا، کەچی ئێستا ئەوەی تروسکاییە لەچاویدا بەدی ناکرێ. ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیربوو چۆن توانی من بدۆزێتەوە، یان چۆن ئەم هەموو زانیارییانە سەبارەت بە من دەزانێ، تەنانەت ئەو شتانە دەزانێ کە بۆ هانسیش باسم نەکردووە، دوای ئەوە لەو باوەڕەدانیم کە ئەویش شتی بۆ سارا گێڕابێتەوە.

– دەتەوێ چۆن ئەم کێشەیە ببڕینەوە، بە ئاشتی یان بە شەڕ؟

– بە ئاشتی.

– کەواتە هەستە قاوەیەک لێبنێ و بە هێمنی باسی هەموو شتێک دەکەین. چییە بۆ هەڵناسی، نابیستی؟ کەڕی؟ یان زمانت لە دەما نەما و لاڵ بووی؟ گەر ناتوانی خۆم هەڵدەستم، شتەکان دەدۆزمەوە.

هەرچەندم کرد نەمتوانی لە شوێنی خۆم بەرزببمەوە، سەیرێکی کردم و بە تەوسەوە وتی: هانس حەزی لە کوێت کردووە، قسەش نازانی، ئەی چۆن باسی خۆشەویستی بۆ دەکەی، بەچ زمانێک قسەی لەگەڵ دەکەی.

بە هەزار شەڕەشەق تینم دایە خۆم و چوومە چێشتخانەکە، لەوێش هیچم نەدەدۆزییەوە، چاوم هیچی نەدەبینی، بەدواما هات، دۆڵابەکەی کردەوە و شتەکانی دۆزییەوە و قاوەکەی لێنا.

– دیارە هانس نازی زۆر پێداوی و، خۆی هەموو شتێکت بۆ دەکات. ڕەنگە قاوەکەشت بکات بەدەمەوە.

– وایە بەیانیان خۆی نانم بۆ دەهێنێتە ژووری نووستنەکە.

– ئێ دەباشە کەوتیتە قسەکردن، دیارە باش دەزانی وەڵام بدەیتەوە. دەی وەرە تا قاوەکە ساز دەبێت دانیشە، پەلەمان نییە هەموو شەوەکەمان بە دەستەوەیە.

نەمزانی مەبەستی چییە، من هەموو شەوەکە ناتوانم بەدیاری ئەوەوە دانیشم، خێراش بیرم بۆ ئەوە چوو کە مانەوەی هانس لای منداڵەکانی بەپلان ڕێکخرابێت.

– به هیچ جۆرێ نامەوێ هانس ئەوە بزانێ کە یەکترمان بینیوە، ئەگەر نا یەکسەر ناونیشانەکەت دەدەم بە کۆنە مێردەکەت، تەماشاکە ئەوەش ناونیشانی مێردەکەتە، ئێستاش پەیوەندیت لەگەڵ هانس هەیە ناتوانی خۆت بشاریتەوە، ئەو کاتە نەک ژیانی تۆ بەڵکو ژیانی هانسیش دەکەوێتە خەتەرەوە، هانس باوکی سێ منداڵمە، بە هیچ جۆرێ نامەوێ ژیانی بکەوێتە خەتەرەوە.

– کەواتە ئەوە پەیوەندی بە تۆوەیە، نەک من.

– نا هەڵەی. پەیوەندی بەتۆوەیە، تۆ داوات کرد کێشەکە بە ئاشتی ببڕینەوە، بۆیە منیش بۆت روون دەکەمەوە کە بڕیارەکەت زیرەکانە بوو، چونکە گەر بە شەڕ کێشەکەمان چارەسەربکەین کەستان بەسەلامەتی رزگاتان نابێت. بەتایبەتی کۆنە مێردەکەت گەر بزانێ لەگەڵ پیاوێکی سوێدی دەژییت، خۆت دەزانی چی دەکات، دڵنیابە منیش یارمەتی دەدەم.

– ئەم هەموو رق و کینەیە چییە لە دڵتا، هانس چۆن توانیویەتی لەگەڵت بژی.

– ئەم رق و کینەیە تۆ دروستت کرد، تۆ پەیوەندی سی و پێنج ساڵەی منت ژەهراوی کرد، تۆ سەرت لەخۆم و منداڵەکانم شێواند، دەتەوێ رق لە دڵما نەبێت. بۆ دەتەوێ سوپاست بکەم.

– گەر مێردەکەت هەمان هەستی لا دروست نەبووایە من بە دوای نەدەکەوتم، گرفتەکە ئەوەبوو ئەو هەستە لەیەک ساتدا لای هەردووکمان دروستبوو، کەسمانیش پلانی ئەوەمان دانەنابوو هەروەک تۆ ئێستا بە پلان و پرۆگرام گەیشتویتەتە ئێرە.

– هەتاو یان باشترە بڵێم شیرین، ئەوە باش بزانە من هەرگیز رێگا بە کەسێک نادەم ژیان لە منداڵەکانم تێکبدات.

– جا ئێستا چیت لە من دەوێت؟

– واز لە هانس بێنە.

– پەیوەندی من و هانس گەیشتۆتە رادەیەک کە جیا بوونەوەمان مەحاڵە. ئێمە یەکتریمان خۆشدەوێت. وا هەست دەکەم هانس بەبێ من ژیانی لا تاڵ دەبێ.

– قسەی زلم بۆ مەکە، چۆن دەزانی هانس ئەوەندە تۆی خۆشدەوێت؟ لەو باوەڕەدانیت کە پەیوەندی هانس لەگەڵ تۆ تەنیا بۆ رابواردن بێت یان کاتی بێت؟

– نا لەو باوەڕەدانیم، زۆرجار داوای ئەوەم کردووە لەبەر منداڵەکانتان کۆتایی بە



پەیوەندییەکەمان بهێنین، بەڵام ئەو رازی نەبووە.

– تۆ گەر هانست خۆشدەوێت، دەبێ کۆتایی بەو پەیوەندییە بێنیت، گەر وانەکەی ئەوکاتە ژیانی هەردووکتان دەکەوێتە مەترسییەوە.

سارا خان دوو سێ سەعاتێک لەگەڵمدا بوو، دیاربوو لەماوەی ئەم چەند مانگەدا هەر خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بووە سەبارەت بە من، ئێستا دەزانم پیاوی ئۆتۆمبیلە سوورەکە بۆ بەدوای منەوە بوو. باشە چۆن ئەو هەموو شتەی زانیوە. ئەو شەوە تا بەیانی خەوم لێنەکەوت، گەر هێندە درەنگ نەبوایە دەچووم بۆ لای شاراو دەریا. بەیانی تەلەفۆنم بۆ کار کرد و پێم راگەیاندن کە نەخۆشم. رێزان بە هەڵە داوان پاش کار هات بۆ لام، هەستی کرد شتێک روویداوە، منیش هەوڵمدا تا بڕیاری خۆم نەدەم ئەو نهێنییە نەدرکێنم، هەرچۆنێ بوو رێزانم رازی کرد مەسەلەکە هەر نەخۆشی و دڵتەنگییە، کە هەر یەکێکمان زوو زوو بەو حاڵەتەدا تێدەپەڕین. بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بەسەر خۆمدا زاڵببم تا هانس هەست بە هیچ نەکات. ئەویش ئەو رۆژە تەلەفۆنی بۆکردم و هەواڵی پرسیم کە زانی لە ماڵەوەم ئیجازەی وەرگرت. هەر کە هاتەوە ماڵێ، خۆمم نەگرت خێرا خۆم فڕێدایە باوەشییەوە.

– شیرین شتێک روویداوە؟ تکایە قسە بکە. دەی هێمن ببەوە.

– نا هیچ نەبووە، دڵم زۆر تەنگە. شەو هیچ خەوم لێنەکەوت بۆیە هەست بە ماندووبوون دەکەم.

– چییە گیانەکەم خۆ لەبەر ئەوە نەبوو دوێنێ شەو نەهاتمەوە، یان پێت ناخۆش بوو کە لەوێ مامەوە.

– نا نا، تەنیا ماندووم.

– نا بڕوات پێناکەم، لە چاوەکانتا شتێکی تر دەخوێنمەوە، شیرین من هێندەم خۆشدەوێیت دەموچاوت دەخوێنمەوە. راست بڵێ چی روویداوە. خۆ مێردە کۆنەکەت نەبینی؟

– نا...نا.

– نا قسە بکە گەر ئەو تۆی لێرە دۆزیوەتەوە پێش هەموو شتێ خەبەری پۆلیسی لێدەدەین، پاشان ماڵەکەش دەگوێزینەوە، من هەر خۆم نیازمە ئەم خانووە بفرۆشمەوەو خانوویەکی گەورەتر بکرم، گەر منداڵەکانیش بیانەوێ لێرە بمێننەوە شوێنیان هەبێ، یان گەر منداڵمان ببێت، ژووری

خۆی دەبێ، دە قسە بکە.

– نا نا هیـچـیـان نیـیـە، تەنیـا خـەوێکی ناخـۆشم بە براکـانمەوە بینی، دەترسم شـتـێـکیـان بەسەرهاتبێ.

– ئەی ناتوانی تەلەفۆنیان بۆ بکەی؟

– با دەتوانم.

– ئەی کـەواتە بۆ ڕاوەسـتـاوی، چاوەڕوانی چی دەکـەی؟ دەمـویست لێت بپـرسم چۆن پارە بۆ دایکت دەنێریتەوە.

– ئەم مانگە هیچم بۆیان نەناردووەتەوە، ڕێک نەکەوت، زۆر خەریکی شارا بووم.

– خەمی ئەوەت نەبێ، ناونیشانەکەم بدەرێ، هەر ئەمڕۆ دەڕۆم پارەکەت بۆ دەنێرم.

منیش نەمزانی چی بڵێم، پێم باشتر بوو کە بڕوات تا ماوەی بیرکردنەوەم هەبێ، بۆیە ناونیشان و پارەکەم بۆ هێنا. هانس ڕۆیشت و داوای لێکردم چێشت ئامادەنەکەم، کە هاتەوە خۆی خواردن سازدەکات.

کە ڕۆیشت، دیسانەوە دەستمکردەوە بە گریان، ئاخر چۆن بتوانم وازی لێبێنم، تەلەفـۆنێکم بۆ شـارا و دەریا کـرد لەمـاڵەوە نەبوون، دیاربوو ئەوانیش دەرچووبوون، لەم مـاوەیەی دوایدا بێ ترس دەچێتە دەرەوە.

هێندەی نەبرد هانس هاتەوە و دڵنیـــای کـــردم کـــە پارەکـــەی ڕەوانە کـــردووە. داوای لێکردم تەلەفۆنیش بۆ دایکم بکەم تالە تەندروستیان دڵنیا بم.

– خەمت نەبێ هێندە نابا ژیانمان بۆ باری ئاسایی دەگەڕێتەوە. ئەم بەهارە هەر ئەم بەهارە ئیجازە وەردەگرین و سەفەرێکی وڵاتەکەتان دەکەین، دەزانی زۆر حەزدەکەم سەفەرێکی ئەو ناوچەیەی لای ئێوە بکەم. لەو باوەڕەدای دایکت ڕازی بێت شوو بە پیاوێکی سوێدی بکەیت؟

– لەوانەیە دایکم ڕازی بێت، بەڵام خزم و دراوسێکانمان نەء.

– جا خزم و دراوسێ پەیوەندییان بەمەوە چییە؟

– لای ئێمـە ژیانی تایبـەتی نییـە. لەسەر شـووکردنی کچێک تەنانەت ژنهـێنانی پیـاوێکیش، چەندان کەس بۆیان هەیە قسان بکەن و ڕای خۆیان بە ئا یان نا دەربڕن.



– جا چۆن من ئەو هەموو خەڵکە ڕازی بکەم.

چەند ڕۆژێ پاشتر تەلەفۆنم بۆ دایکم کرد، زۆر دڵخۆش بوو. زۆر سوپاسی کردم بۆ ئەو پارەیەی بۆم ناردووە.

ئەو ئێوارەیە زۆر دڵم خۆش بوو، بەڵام هەر کە سارام بیردەکەوتەوە دیسانەوە هەموو گیانم وەک تەنوور دەسـوتا. مـوڵـەتی هەفـتـەیەکی داپێم بۆ بیـرکـردنەوە. دەبێ بڕیاری چی بدەم، لەو باوەڕەدا نەبووم بتـوانم جـارێکی تر تەحـەمـولی ئازارێکی تر بکەم. خـۆشـەویسـتـیم بۆ هانس وەک لەدایکبوونەوەیەکی تر بوو، مانایەکی نوێی بەژیانم بەخشی. گەر ئەم خۆشەویستییە نەبوایە خوا دەزانێ لە ڕۆخی چ دەریایەکی خەمدا ژیانم لەنگەری دەگرت. خوایە گیان ئەم نهێنی و کێشانە بۆ کێ بگێڕمەوە، شارا سەرقاڵی کێشەکانی خۆیەتی، ڕێزان دڵی خۆشە و بە دڵی خۆی پیاوێکی دۆزیوەتەوە خۆشیشی دەوێت، نامەوێ ژیان لەو تێکبدەم.

– بۆ منیان بگێڕەوە کچم.

– بابە گیـان! دەزانی وەختـە بمرم، گەر دایکم و براکانم نەبونایە هەر زوو خۆم دەکوشت، ئێستا هانسیشی هاتۆتە سەر.

– مردن و کوشتنی چی؟ ژیان تازە لای تۆ دەست پێدەکات. تۆ و هانس یەکترتان خۆشدەوێت، بە هیچ شێوەیەکیش دەست لەو خۆشەویستییە هەڵمەگرە. تۆ بۆ باشترکردنی ژیانی دایکت و براکانت قوربانیت زۆر دا، ئیتر بەسە، ژیانی خۆت بژی و گوێ بۆ کەس ڕامەگرە.

– بابە گیان سارا هات بۆ لام، نەمزانی چۆن منی دۆزییەوە.

– لە هەموو شوێنێ ئەوەی ئەتەوێ لە ڕێگەی پارەوە دەکرێ.

– نازانم زۆر هەڕەشەی لێکردم. نەک تەنیا لە خۆم بەڵکو لە هانسیش.

– تۆ هیچ خـەتایەکت نەبووە، بڕواش بە هەڕەشـەکـانی مـەکـە. ئەوان خـۆیان بە تەنگ پەیوەندییەکەیانەوە نەهاتوون، هەستیان بۆ یەکدی نەمابوو، جا ئێستا سارا تازە بیر لەوە دەکاتەوە کە پەیوەندییەکەیان ڕزگاربکات.

– ئەی چیبکەم؟

– گوێی بۆ مەگرە و لێی مەترسە، گەر ئەو بزانێ تۆ ئەوەندە لێی دەترسی زیاتر پێ دادەگرێ.

– من تەنیا لە خۆم ناترسم لە هانس دەترسم. لەوانەیە کۆنە مێردەکەم بزانێ شتێکی لێبکات.

– لەوەش مەترسە.

– چۆن نەترسم، بەدووری نازانم بەکوشتمانبدا.

– کاری وا هێندە ئاسان نییە.

– هەر خۆت وتت کە بە پارە هەموو شتێ دەکرێ.

– هەوڵبدە هێندە نەترسی، ئەو گەر مێردەکەی خۆشبوێ هەرگیز کاری وا ناکات.

– بابە ئەوە چ دەڵێی، لەم وڵاتانەشدا شتی لەم بابەتە ڕوودەدات و دۆزینەوەی بکوژیش هێندە ئاسان نییە.

– ئەو جۆرە کەسانەی کە کاری وا دەکەن بەبێ ویژدان لە دایکبوون. سارا وانییە، دەیەوێ پەیوەندییەکی ڕووخاو بنیات بنێتەوە.

– دیارە ئەو هێز و توانایەی هەیە ئەو کارە بکات.

– سەیرم لێدێ، ئەو خۆشەویستییەی کە لە دەروونتدا هەیە هێزت پێنابەخشێ بەرگری لە خۆت بکەی. من دایکتم خۆشدەویست و هیچ هێزێک کاری لێم نەدەکرد، هەردەم هەموو ویستەکانی خۆمم بەدی دەهێنا.

– بابە ویستەکانی تۆ شەرعی بوون، بەڵام بەختەوەری من لەسەر حیسابی بەدبەختیی کەسانێکی تر وەدی دێت.

ئای هانس لە ناوەختدا هاتەوە، ئەو ئێوارەیە نەمتوانی قسەکانم لەگەڵ باوکم تەواوبکەم، بێ ئەوەی هەستی پێبکەم دەرگاکەی کردبووەوە، بەڵام تێناگەم بۆچی باوکم لە هاتنە ژوورەی ئەو ئاگاداری نەکردمەوە. هیچ نەبوایە بێدەنگ بوومایە. هانس منی بینیبوو بە زمانەکەی خۆمان قسە دەکەم، زۆر ترسابوو وای زانیبوو لەبەرخۆمەوە قسان دەکەم.

– شیرین گیان دیارە زۆر ماندووی، تکایە پێم بڵێ چیتە گەر حەز ناکەی کێشەکەت بۆ من باسبکەی، دەتوانی بچیتە لای پزیشکێک یان سیکۆلۆگێک.

ڕاستی دەکرد دەبوایە شتی لێنەشارمەوە، گەر هەر ئەوکاتە بە گوێی ئەوم بکردایە ئەوا بۆ هەموو ژیانم بەختەوەر دەبووم. بڕوام بە هیچ نەمابوو نە بە خۆم نە بە پیاو. بیرم لەوە دەکردەوە بۆ هانس



وایە و ئەو کەربابانەی من و شاراو ڕێزانیش بەو جۆرەن. بڵێی ئەمیش وەک ئەوم لێ نەکات. نا باوەڕناکەم ئەمیش وابێ، گەر وابوایە ئەم هەموو ساڵە لەگەڵ ژنەکەیدا هەڵی نەدەکرد. گەر هەموو پیاوان وەک ئەمانەی ئێمە بوونایە دەبوایە چ بقەومایە. مەگەر دەریا ببێتە یەکەم پێغەمبەری ژن لە جیهاندا و فتوای یەکسانی نێوان ژن و پیاو بدات. گەر وابوایە ئەوا من یەکێک دەبووم لە جێگرەکانی ئەو پێغەمبەرە.

پێش هەموو شتێک قوتابخانەیەکم دەکردەوە بۆ ئەو کەرمێردانەی کە بڕوایان بە ئازاردانی ژن هەیە و بندەستبوونی ژن بە مافێکی سروشتی پیاو دەزانن. گەر لە تاقیکردنەوەکانیش دەرنەچوونایە ئەوا دەمخستنە زیندانی هەمیشەییەوە تا ژەهرەکەی خۆیان بڵاونەکەنەوە. باشە ئەی ئەو پیاوانەی وەک هانس و باوکم وان دەبێ چیان لێبکەم. باشە کەسێکی وەک هانس لە چ ڕەفەیەکدا دانێم. لەگەڵ مندا تابڵێی باشەو خۆشی دەوێم کەچی لە تێڕوانینی ساراوە خراپترین پیاوی ئەم وڵاتەیە، چونکە خیانەتی لێکردووە. ئەو کات لە شوێنێکی وەک دادگا دەبێ من و سارا بکەوینە ململانێ، ململانێ لە نێوان هانسی سارا و هانسی من کە پیاوێکە پارچەیەکە لە سۆزو خۆشەویستی و ڕێزلێگرتن، ئامادەیە ببێتە ئیسلام گەر من بمەوێ، دێتەوە بۆ وڵاتەکەم گەر بمەوێ. بەم شێوەیە ئامادەیە لە پێناوی مندا قوربانی بدات. ئەوکاتە دادپەروەر ناتوانێ بڕیاری خۆی بدات و دادگا دوادەخرێ بۆ چەند ڕۆژێکی تر. من و سارا لە دەرەوەی دادگا دەیکەین بە شەڕو دەست دەدەینە قژی یەکتر.

جا ئەو کاتە دەبێ من لە کام بەرەدا بم بەرەی پیاوان یان ژنان. من لە پێناوی پیاوێکدا ژنێکم دابە عەرزدا.

## 18

سارا ژیانی لە شیرین تاڵکردبوو، هێشتا هەفتەیەک تێنەپەڕیبوو کەچی چەند جارێ تەلەفۆنی کرد، فشاری بۆ دەهێنا تا بڕیاری کۆتایی بدا. هەموو دەیانزانی شیرین بە بارێکی نەفسیی خراپدا تێدەپەڕێ، بەڵام کەس هۆکەی نەدەزانی. هانس بڕیاریدا بۆ هەفتەیەک ئیجازە وەرگرێ و پێکەوە سەفەربکەن.

ڕۆژی سێشەممە بوو دەبوایە سەعات سێی پاش نیوەڕۆ سارا ببینێ، بەیانی زوو خەبەری بووەوە، تەماشای کرد هانس زووتر دەرچووە، دەبێ ئەمجارەش وەک جارەکانی تر سارا بە شتێکەوە سەرقاڵی نەکردبێ، وا هەستی دەکرد هەموو دەرگاکانی لێداخراون، هەندێ جار بیری دەکردەوە بەجێیبهێڵێ، بۆ ئەمەش دەبوو واز لە کارەکەی بهێنێ، لە شوێنێکی تر بژی، کەسیش نەبوو بۆ وەدەستخستنی کارو شوێن یارمەتی بدات. لەلایەکی ترەوە نەیدەتوانی یەکەم خۆشەویستی بە دەستی خۆی زیندەبەچاڵ بکات. لەوەش دڵنیابوو کە هانس خۆشی دەوێ.

سەعات یانزە هاتەوە.

– نانی بەیانیت خواردووە؟

– بەڵێ.

– هەستە خۆت بگۆڕە، دەچینە دەرەوە.

– بۆ کوێ؟





– نهێنییە!

– بۆ کوێ، پێم بڵێ.

– هەستە بڕۆین، دوایی هەمووت پێدەڵێم. بەڵام دەبێ چاوت بنوقێنی و نەیکەیتەوە تا من پێت دەڵێم.

لەو کاتەدا شیرین بیری لەوە نەدەکردەوە کە دوای چەند سەعاتێکی تر دەبێت سارا ببینێت و دوا بڕیاری خۆی پێڕابگەیەنێ. پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ بۆ وڵاتێکی دوور سەفەریان کرد. شیرین هەوڵیدا سەفەرەکە هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام نەیتوانی.

– دەچینە وڵاتێکی ئیسلامی و لەوێ بە دەستووری خۆتان مارەت دەبڕم. کە منداڵیشمان بوو لە کڵێسا و بەدەستووری ئێمە جارێکی تر مارەت دەبڕم. ئیتر چیت دەوێت.

ئەو بەختەوەر بوو، نەیدەزانی شیرین لە چ قوڕاوێکدا چەقیوە. لە بازاڕی فرۆکەخانەکە تازەترین جل و کۆمەڵێ عەتر و موستیلەیەکی نقێمداری بۆ کڕی. شیرینیش هەر پێدەکەنی و دەیزانی کە تازە ناتوانێ سارا ببینێ، بۆیە بڕیاری دا بیر لە هەڕەشەکانی نەکاتەوە. کە سواری فڕۆکە بوون هەرچی خەم هەبوو کۆچیان کرد.

– بزانە چ مێردێکت هەیە، دەمزانی پێویستت بە سەفەرێکی لەمجۆریە.

لە وشەی مێرد سڵی کردەوە، نا ئەو کەسێکی ناوێ مێرد بێت. لەوانەیە هەر کە هانس ببێ بە مێردی هەموو جوانییەکان ناشیرین بن، بۆیە حەزی بەوە نەدەکرد باسی مارەبڕینی لەگەڵ بکات.

کە سارا بە سەفەرەکەیانی زانی، تەواو تووڕەبوو، بڕیاری دا پلانەکەی خۆی هەر چۆنێک بووەو هەرچییەک ڕوویدات، جێبەجێ بکات. ئەمجارەیان بەبێ دایکی و جۆرجی پشکێنەر تەنیا خۆی کارەکان ڕادەپەڕێنێ. هێندە پارەی هەیە کە پێویستی بە کەس نەبێت. موچەکەی هانس زۆربوو، سارا لە موچەکەی خۆی پارەیەکی باشی گل دابووەوە. هەرچەندە ئەم پارەیەی بۆ ئەم ڕۆژە ڕەشە لا نەدابوو.

نەیاندەویست بگەڕێنەوە، لەو خەوە بێداربببنەوە. هەفتەیەکی تریش ئیجازەکەیان درێژکردەوە. کە سارا ئەم هەواڵەشی بیست ئۆقرەی لێبڕا. هانس هەموو ڕۆژێ تەلەفۆنی بۆ منداڵەکانی دەکرد. سارا ویستی قسە لەگەڵ شیرین بکات، بەڵام لەوە ترسا پلانەکەی ئاشکرابێت.

– پێدەچێت باوکم زۆر بەختەوەربێت.

– بزانین ئەم بەختەوەرییەی چەند درێژە دەکێشێ.

– مەبەستت چییە دایە؟

– هیچ، لەسەرەتادا لەگەڵ منیش وابوو، بەڵام لەم دواییەدا تاقەتی ئەوەی نەمابوو قسەشم لەگەڵ بکات.

سارا رووی لە دایکی نا چەند رۆژێ لای منداڵەکانی بمێنێتەوە، ئەم نیازی سەفەرێکی کورتی هەیە، دایکی داوای لێکرد کە لە سەرخۆ بێت و کارێکی وانەکات زەرەرمەند بێت و کار لە پەیوەندی ئەو و منداڵەکان بکات.

ئەو دوو هەفتەیە وەک خەوێک تێپەڕی کە خەبەریان بووەوە خۆیان لە فرۆکەخانەدا بینییەوە، هەر کە گەیشتنەوە ماڵێ شیرین توشی لەرزوتا هات، تاکەی بەرز بووەوە، هانس خێرا چوو دەرمانی پێویستی بۆ کڕی. ئەو رۆژە نەیتوانی منداڵەکانی ببینێ، هەموو شەوەکە خەریکی شیرین بوو، بەیانی زوو بردیە نەخۆشخانە بۆ ئەوەی بزانن چییەتی. هەموو جۆرە فەحسێکیان بۆکرد، هیچیان نەدۆزییەوە. بۆ ساتێک چییە بەجێینەدەهێشت. بۆ رۆژی سێیەم لە رێستەورانێک منداڵەکانی بینی، منداڵەکان هەستیان کرد باوکیان بە نەخۆشی ژنەکەی بێتاقەت بووە.

– بابە گیان دیارە ئەم ژنەت زۆر خۆشدەوێت.

– زۆر، خۆشم نازانم بۆ.

– ئەی ئێمە؟

– ئێوەشم زۆر خۆشدەوێت، ئێوە دڵی منن، بەڵام شیرین هێز و سۆزێکی تایبەتیم پێدەبەخشێ.

با ئەم جارە چاک بێتەوە، پێتان دەناسێنم.

یەکەمین جار بوو هانس بەو جۆرە ناوی شیرینی هێنا لای منداڵەکانی و ئەوانیش لەوە گەیشتن کە باوکیان لەگەڵ ئەو ژنەدا بەختەوەرتر دیارە، کە گەڕانەوە بۆ ماڵێ دایکیان کەوتە پرسیارکردن لێیان.

– نەتانزانی بۆ کوێ رۆیشتوون؟

– نا بابە باسی نەکرد، ئێمەش نەمان پرسی، دیارە شیرین نەخۆشە. بۆیە بابە نیگەران بوو.



– جا ئەم باوکە مەیموونەتان بۆچی بۆ ئێوە نیگەران نابێت.

– تکایە دایە واز لەم مەسەلەیە بێنە، دیارە ئەم ژنەی خۆشدەوێت بێ ئەو ناتوانێ بژی.

– پاش چەند رۆژێکی تر بۆمان دەردەکەوێت بەبێ ئەو دەژی یان نا.

ئەم قسەیەی دایکیان ترسی خستە دڵی کاتەرینا و ئەندەش. لەوە دەترسان دایکیان دەستی لە نەخۆشییەکەی شیرین دا هەبێ.

پاش هەفتەیەک شیرین باشتر بوو کەوتە سەرپێ. هەوڵی دا قسان لەگەڵ شارا بکات. چەند جارێک زەنگی بۆ لێدا، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. بڕیاریدا ئێوارەکەی کە هانس هاتەوە بچن سەرێکی بدەن، هێندەی نەبرد هانس ئاگاداری کردەوە کە ئەو ئێوارەیە درەنگتر دێتەوە. بۆیە ئەمیش خۆی چوو سەرێک لە شارا بدات.

شارا لەماڵ نەبوو، چووە خوارەوە و سەیرێکی پەنجەرەکەی کرد گڵۆپیان داگیرسابوو، ئەمجارەشیان لە گێلی خۆی توڕەبوو، چونکە وەک جاری پێشوو کلیلەکانی لە ماڵەوە بیرچووبوو. ماوەیەک لەسەر ئەو شەقامە دەهات و دەچوو جارێکیتر لە دەرگاکەی دەدا و دەگەڕایەوە، ئیتر ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە تا تەلەفۆنێ بۆ رێزان بکات.

ویستی کۆدی دەرگاکە لێبدات، دەستێک پێش دەستی کەوت و ژمارەکەی لێدا، کە سەری بەرز کردەوە کەربابەکەی مێردی بینی.

– پێم نەوتی لە بنی دنیاش خۆت بشاریتەوە دەتدۆزمەوە. چاو جوان گیان. وادەزانی گەر بە سوێدی شووبکەیت رزگارت دەبێ... هەردووکتان دەتۆپێنم.

– هەر ئێستا تەلەفۆنی پۆلیس دەکەم.

– وا ئەزانی لە جاری پێشووەوە دەرسم وەرنەگرتووە، پۆلیسی چی.

دەمانچەکەی نیشان داو داوای لێکرد بچێتە ژوورەوە. کە چوونە سەرەوە لە بەردەم دەرگای ماڵەکەیاندا سارا چاوەڕوانی دەکرد.

هەرسێکیان چوونە ژوورەوە، شیرین کە سەیری دەکردن باوەڕی نەدەکرد، لەوە گەیشت کە سارا بۆ وەدیهێنانی مەبەستی خۆی، کۆنە مێردەکەی بەکارهێناوە. شتەکان لای شیرین تێکەڵاوبوون، راست و چەپی لێک جیانەدەکردەوە.

– ئێمە ڕێککەتبووین کە یەکتر ببینین، واتدەزانی دەتوانی خۆتم لێبدزیتەوە، نەتدەزانی چی چاوەڕوانت دەکات.

– من ئاگام لە سەفەرەکە نەبوو، لە فرۆکەخانە پێیی وتم.

– گرنگ ئێستا دەگەڕێیتەوە یان دوو گوللەتان تێدا سارد کەمەوە.

شیرین سەیرێکی سارای کرد بۆ ئەوەی بزانێ هەڵوێستی ئەو چیدەبێت سەبارەت بە کوشتنی مێردەکەی. ساراش چاوی بڕیبووە شیرین و پێیی پێدەکەنی. هەروەک پێیی بڵێ من دەزانم چۆن حەقی خۆمت لێدەکەمەوە.

– ئێستا دەتەوێ ڕێکبکەوین؟

– تا ئەم کابرایە لێرە بێت بشمکوژن ئامادە نیم ڕێکبکەوین.

– بەبێ من هیچ ڕێککەوتنێک جێبەجێ نابێ.

– دەتوانی هەر لێرەدا گوللەیەک بنێی بە سەرمەوە.

شیرین هەوڵی دا دەست بۆ تەلەفۆنەکە ببات. نەیانهێشت.

– ئەوەندە نابا هانس دێتەوە.

– زۆر هەڵەی، هانس لەگەڵ منداڵەکانیدایە.

– دەزانم، بەڵام هانس تەلەفۆنی کرد کە دێن بۆ ئێرە.

ئەم قسەیە سارای پەشۆکان، خێرا تەلەفۆنی بۆ ماڵەوەکرد کەس هەڵی نەگرت، تەلەفۆنی بۆ کاتەرینا کرد تەلەفۆنەکەی داخرابوو. بۆیە قسەکەی شیرین خستیە گومانەوە.

– ئێستا چیت دەوێت؟

– ئەم پیاوە بە یەکجاری لە بەرچاوم ونبێ.

– هەی کچی قەحبە پێم وتی بەبێ من هیچ ڕێککەوتنێک نابێ.

– ئێ کەواتە بمکوژن و تەواو، من لێرە ناجوڵێمەوە.

کابرا دەمانچەکەی دەرهێنا و خستیە سەر دڵی شیرین. سارا زۆر ترسا کارێکی وابکا و ئەمیشی تێوەگلێ. هێندەش ئەو پیاوەی نەدەناسی و باوەڕی پێنەبوو تا ببێتە شەریکە تاوانێکی وا.



بۆیە داوای لێکرد لە خوارەوە چاوەڕوانی بکات.

– من لێرە ناڕۆم تا خۆی و مێردەکەی نەکوژم، ئەوە چەندێکە بەدوای ئەم دایکحیزەدا دەگەڕێم، ئێستا دۆزیومەتەوە، چۆن وا بە ئاسانی وازی لێدەهێنم.

سارا ترسی ئەوەی هەبوو هانس و منداڵەکان خۆیان بکەن بە ژووردا و ڕیسەکەی لێ ببێتەوە خوری و منداڵەکانیش بەمە بزانن و ئەوانیشی لەدەست بچێ. بۆیە جانتاکەی دەرهێناو بڕێک پارەی دا بە کابرا و داوای لێکرد بچێتە خوارەوە.

– هەر وەک وتم دەبێ هانس بەجێبهێڵی.

– گەر منیش بەجێیبهێڵم، ناگەڕێتەوە بۆ تۆ.

– ئەوە کێشەی تۆ نییە.

– من دەتوانم واز لە هانس بێنم، بەڵام ئەو واز لەمن ناهێنێ. هەموو ڕۆژێ دەرگام لێدەگرێ.

– دەبێ وازی لێبهێنی و ئەم شارەش بەجێبهێڵی. وا دەزانی بە ئاسانی وازت لێدەهێنم. تۆ ناتوانی خۆت لەمن بشاریتەوە چونکە ئێمە منداڵی هاوبەشمان هەیە، هەردەم لە ڕێگەی هانسەوە دەتدۆزمەوە. من پێویستم بەوە نییە هیچ بکەم، کابرای کۆنە مێردت هەموو شتێ جێبەجێ دەکات. تۆ گەر هانست خۆشدەوێت دەبێ وازی لێبهێنی چونکە ژیانی ئەویش دەکەوێتە مەترسییەوە.

– دیارە خۆت ئەمەت ویستووە، دوای ئەوە بۆ من هێندە ئاسان نییە بچمە شارێکی تر.

تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا. دەمانچەیەکی بچووکی لە جانتاکەی دەرهێنا و داوای لە شیرین کرد لەگەڵیدا بڕوات، شیرین وتی با نامەیەک بۆ هانس بەجێبهێڵم تا نیگەران نەبێ و تەلەفۆن بۆ پۆلیس نەکات.

– دەبنووسە. من پێت دەڵێم چی بنووسی.

– نا، من خۆم ئەوەی دەمەوێ دەینووسم. ئەگینا دەتوانی لێرەدا بمکوژی.

شیرین زۆر دەترسا، بەڵام وای نیشان نەدا.

"هانس! من تۆم زۆر خۆشدەوێت، ببوورە کە ناچارم بەجێتبهێڵم، هەرگیز لەیادت ناکەم"

جانتاکەی هەڵگرت و کەوتە پێش سارا.

– کلیلی ماڵەکەت پێیە؟

– لەناو جانتاکەمدایە.

لەگەڵ سارا چوونە خوارەوە. لە ناو ئۆتۆمبیلەکە سارا داوای کلیلەکەی لێکرد، شیرین پێکەنی و وتی لەماڵەوە بەجێمهێشت، سارا تەواو توڕەبوو، ئەو کلیلەشی کە کۆپی کردبوو، لای دایکی بیری چووبوو، وا بە نیاز بوو کە بڕوات نامەکە بدڕێنێ و جل و شتەکانی شیرین لە ماڵەکە دەرکات. بۆ ئەوەی گومانی ئەوە لای هانس دروست بکات کە شیرین ئەو ماوەیە ئەمی هەڵخەڵەتاندوە ئێستاش هەڵاتووە. تا دواتر خۆی بێت و دڵنەوایی بکات. سارا هێشتا ئۆتۆمبیلەکەی نەختستبووە ئیش ئۆتۆمبیلەکەی هانس دەرکەوت، بۆیە بە خێرایی سویچەکەی سووڕاند و پێی بە بەنزیندا نا.

هانس ئەو ئێوارەیە بە نیاز بوو شیرین بە منداڵەکانی بناسێنێ، لە ڕێستەورانێکدا شوێنی حیجزکردبوو، چوونە سەرەوە و دەرگایان کردەوە، هانس لە پێشەوە چووە ژوورەوە.

– شیرینی ئازیز لە کوێی، ئەوا منداڵەکانم هێناوەو دەیانەوێ بتبینن.

شیرین چەند دەقیقەیەک بوو ماڵەکەی بەجێهێشتبوو. نامەکەی دۆزییەوە، هەموو دنیای لێهاتەیەک، کەوتە سەر زەوی، منداڵەکان پەلاماری باوکیان داو دەستیان کرد بە گریان، نامەکەیان خوێندەوە. کاتەرینا بۆ تەلەفۆنەکە دەگەڕا کەچی چاوی کەوتە سەرکلیلەکانی دایکی کە بە سەر قەنەفەکەوە بەجێیهێشتبوو. یەکسەر مەسەلەکە لای کاتەرینا ساغ بووەوە کە دایکی لە پشت ئەم پیلانەوەیە. خێرا زەنگی بۆ دایکی لێدا، تەلەفۆنەکەی داخرابوو. تەلەفۆنی بۆ ماڵەوە کرد کەس هەڵی نەدەگرت. لەو کاتەدا باوکی هاتەوە سەرخۆی و منداڵەکان دەورەیان لێدا.

– بابە گیان خەمت نەبێ دەیدۆزینەوە.

– دەتوانن لێرە چاوەڕوان بکەن، من هەر ئێستا دێمەوە.

– بابە گیان دەتوانی ئۆتۆمبیل لێخوڕی؟

– خەمت نەبێ، دەتوانم.

هانس چووە خوارەوە و بەرەو ماڵە کۆنەکەی شیرین ڕۆیشت، چونکە دەیزانی تاقە شوێنێک بۆی بچێت لای شارایە. لەوێش کەسی لێ نەبوو. تەلەفۆنی بۆ ڕێزان کرد، ئەویش هیچ هەواڵێکی لا نەبوو، بە ناچاری گەڕایەوە ماڵێ. ماوەیەک بەبێ دەنگی دانیشت و منداڵەکانیشی نەیاندەزانی چبکەن. کاتەرینا چەند جارێ تەلەفۆنی بۆ دایکی کرد وەڵامی نەدەدایەوە.



– دەتوانم بتانبەمەوە بۆ ماڵەوە، هەرچەندە شوێنیشم لە ڕێستەورانێکدا گرتووە، بەڵام ببوورن بۆ جارێکی تر.

منداڵەکانی بردەوە و گەڕایەوە بۆ ماڵێ. بەوردی سەیری ماڵەکەی کرد، بەلایەوە سەیربوو، شیرین هیچ شتێکی لەماڵەوە نەبردووە، تەنانەت شتە تایبەتییەکانی خۆشی، وێنەکەی باوکی هەر بە تەنیشت جێگاکەیەوە هەڵواسرابوو، نامەکانی دایکی، جل وبەرگ و کتێبەکانی. هانس لەوە گەیشت کە ئەم دەرچوونەی ناچاریی بووە، بە زۆر ماڵیان پێ جێهێڵاوە، ئەگینا گەر بە ئارەزووی خۆی بڕۆیشتایە شتەکانی دەبرد، هەرهیچ نەبێ وێنەکەی باوکی. باشە گەر کەسێک ئەوی بەزۆر ببردایە ڕێگەی نەدەدا ئەو نامەیە بنووسێ. ئەو شەوە دەهات و دەچوو بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، چۆن لەگەڵ ئەم هەموو خۆشەویستییەی، شیرین بەجێیهێشت.

کە گەڕانەوە هێشتا دایکیان نەگەیشتبووەوە ماڵێ. ئانناو ئەندەش سەغڵەت و نیگەران بوون، کاتەرینا دڵی دەدانەوە.

– دایە چووەتە لای نەنە.

– نا تەلەفۆنم بۆ ئەویش کرد لەماڵ نەبوو.

کاتەرینا منداڵەکانی هێمن کردەوەو خەواندنی، بەڵام خۆی چاوەڕوانی دایکی دەکرد، کە بینی ئۆتۆمبیلەکەی لە بەردەم ماڵەکەدا وەستاند، چوو دەرگاکەی بۆ کردەوە.

– ئەوە چییە کاتەرینا هێشتا نەخەوتووی، ئەی منداڵەکان خەوتوون؟

– دایکە ئەوە لەکوێ بووی تا ئەم نیوە شەوە؟

– ئەوەندە گرنگە بزانی لە کوێ بووم؟

– زۆر گرنگە!

– لای نەنە بووم.

– تەلەفۆنم بۆ ئەویش کرد لەماڵ نەبوو.

– ئاخر لەدەرەوە بووین.

– نەنە وا درەنگ لە دەرەوە نامێنێتەوە.

– چییە دەڵێی بووی بە پۆلیس بەسەرمەوە، بۆ ناچی ببی بە پۆلیس بەسەر باوکتەوە. بەڕاست

چوونە دەرەوە؟

- بەڵێ لەگەڵ ژنە تازەکەیدا چووینە دەرەوەو نانمان خوارد، پێش تۆزێ هاتینەوە.

سارا خۆی نەگرت و دەستی کرد بە پێکەنین.

- ژنەکەی جوان بوو.

- زۆر جوان بوو.

- فشە فش. ژنەکەیت هەر نەبینی.

- دایە تۆ لەوێ چیت دەکرد؟ شیرینت چی لێکرد؟

- مەبەستت چییە؟ من حەقم چییە بە شیرینەوە؟

- دەزانم تۆ لەوێ بوویت و ونبوونی شیرین پەیوەندی بە تۆوەیە.

- کەرەکەر، من هەر نازانم ئەوان لە کوێ دەژین!

- ئەی کەواتە کلیلەکانت لەوێ چیان دەکرد، قابیلە خۆیان بۆ ئەوێ ڕۆیشتبن.

- کلیلی چی؟

سارا خێرا چوو جانتاکەی هێناو بە دوای کلیلەکانیدا گەڕا، کاتەریناش کلیلەکانی لە گیرفانی دەرهێناو وتی:

- مەگەڕێ بۆیان، ئەوەتانێ، لە ماڵەکەی باوکم بیرت چووبوو.

- باوکت ئاگای لەمە بوو؟

- نا، بەڵام یەکسەر بوورایەوە..

- چاک دەبێتەوە و شیرینی بیر دەچێتەوە.

- دایکە پێم بڵێ شیرینت چی لێکردووە؟

- ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نییە، فزەشت لە دەم بێتە دەرەوە، منیش دەڕۆم، خۆم ون دەکەم و جارێکی تر نامبیننەوە.

ئەمەی وت و بە توڕەیی هۆڵەکەی بەجێهێشت و چووە ژووری نووستنەکە. هەستی بەمەترسی ئاشکرابوونی پلانەکەی کرد. چبکات تا کاتەرینا بێدەنگ بکات. خۆ لەوانەیە ئێستا تەلەفۆنێک بۆ باوکی بکات، چوو لە دەرگاکەی کاتەرینای دا.



- دەتوانم بێمە ژوورەوە؟ کچم من ئەمەم لەبەر ئێوە کرد، هیچ لەو ژنە ناکەم، تەنیا لە باوکتی دوور دەخەمەوە، ماوەیەکە و بیری دەچێتەوە و دوایی دەگەڕێتەوە لای خۆمان. کە ئێوەم دەبینی وا ئازار دەچێژن، بیرم لەو هەموو ساڵە دەکردەوە لەگەڵ باوکتان ژیاوین، ئەم بڕیارەم دا، ئەو ژنە دەبێ باوکتان جێبهێڵێ. تکات لێ دەکەم هیچ شتێ لای باوکت مەدرکێنە، لە داهاتووشدا بۆت دەردەکەوێ کە من لە پێناوی ئێوەدا ئەم کارەم کردووە. بەڵێنم بدەرێ کە لای کەس ئەم شتە نادرکێنی!.

بۆ ڕۆژی دوایی هانس نەچووە کار، تەلەفۆنی بۆسەر کارەکەی شیرین کرد، چووە شوێنی کارەکەی، تەنیا ئەوەیان وت کە ژنێکی سوێدی تەلەفۆنی کردووە و وتوویەتی نەخۆشە. بەمە تۆزێ دڵی خۆشبوو، مادام تەلەفۆن کراوە بۆ سەر کارەکەی دەگەڕێتەوە. ئەمیش وازی لێناهێنی و دەیگەڕێنێتەوە لای خۆی. هەمان ڕۆژیش سارا چوو سەری لە شیرین داو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ قسەیان کرد. پاشان دەستی بەستەوە و خستیەوە ناو ژوورێکی بچوکی بێ پەنجەرە و دەلاقە. لە ڕۆژێکدا دووجار سەری لێدەدا و خواردنی بۆ دەبرد و دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ. سارا پێویستی بە هەفتەیەک بوو هەتا هەموو کارەکانی ڕێکبخا. دوو جار سەفەری بۆ ئەو شوێنە کرد و هەموو شتەکانی بۆ شیرین مسۆگەرکرد.

هانسیش هەتا دەهات بێ هیوا دەبوو پاش ئەوەی زانی نامەی وازهێنانی بۆ کارەکەی ناردووە. چەند جارێک سەری لە شارا دا، کەس دەرگای نەدەکردەوە. دوا جار پەیوەندی بە ڕێزانەوە کرد و چووە شوێنی کارەکەی. ڕێزان سەری لەم مەسەلەیە دەرنەدەچوو، چونکە شیرین بیری لە کاری وا نەدەکردەوە.

- من لەو باوەڕەدام کە کەسێک شیرینی ناچارکردووە خۆی لە تۆ ونبکات. چونکە ئەو تۆی زۆر خۆشدەویست، تاقە شتێک کە ئەوی ئازار دەدا منداڵەکانت بوون.

- لەو باوەڕەدا نیم ئەوە هۆکەی بێ، لەبەرئەوەی لە سەفەرەکەماندا ڕێککەوتین کە بە منداڵەکانی بناسێنم و هەوڵدەین خانوویەکی گەورەتر بکڕین بۆ ئەوەی جارجار بێنە لامان. لەگەڵ ئەوەی هەستی بە ترسێکی زۆر دەکرد، بەڵام دڵی خۆشبوو، لە سەفەرەکەشماندا هەروەک بڵێی شەرمی شکابێت باسی خۆشەویستی و هەموو شتێکی خۆی بۆ دەکردم، بۆیە سەرم لێشێواوە،

کەسێک هێندە منی خۆشبوێ و وا بە ئاسانی خۆی ون بکات.

ئەنجامی فەحسەکانی شیرین، پتر شپرزەیان کرد، کاتێک کە ڕوونبووەوە شیرین سکی هەیە.

پاش هەفتەیەک کاتەرینا سەری باوکی دا تا خواردنی بۆ بکات و ماڵەکەی بۆ کۆبکاتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناوی شیرینی نەدەهێنا.

– کچم کاتەرینا گەر من شتێکم لێهات، ئەوا بزانن کە شیرین سکی پڕە، واتە ئێوە برایەک یان خوشکێکی ترتان دەبێ.

کە هانس ئەم قسەیەی کرد کاتەرینا باوەشی بە باوکیدا کرد، ویستی شتێ بڵێ، بەڵام خێرا قسەکەی گێڕایەوە. بەڵێنی بە دایکی دابوو کە لەم بارەیەوە هیچ نەدرکێنێ. کە گەڕایەوە ماڵێ هەواڵی شیرینی لە دایکی پرسی، بەڵام نەیوێرا سکپڕی شیرین بە دایکی بگەیەنێ.

– من ئازاری نادەم، هەر ئەوەندەم دەوێ لە باوکت دوورکەوێتەوە، من لەگەڵی ڕێککەوتووم کە ئێرە بەجێبهێڵێ.

– ئەی لەو باوەڕەدا نیت کە ئێرە بەجێبهێڵێ پەیوەندی بە بابەوە بکات و هەموو شتەکانی پێبڵێ.

– نا هەڕەشەی ئەوەم لێکردووە گەر کارێکی وابکات ئەوا باوکت دەکوژرێ.

– چی چی. ئەوە چ دەڵێی دایکە شێت بووی!

– نا خۆ بەڕاستیم نییە، دیارە ئەو بەستەزمانە باوکتی خۆشدەوێت، لە پێناو سەلامەتی ئەودا ئامادەیە هەموو شتێ بکات. زۆریش قسەم لەگەڵ کرد سەبارەت بە ژیانی ئێوە و ساڵانی دوورو درێژی هاوسەرێتیمان. هەر چۆنێک بێ ڕازیم کرد باشترە بڵێم فشارم خستە سەری کە واز لە باوکت بێنێ و منیش بەڵێنم پێدا یارمەتی بدەم تا دێتەوە سەرخۆ.

– ئەی لەو باوەڕەدانیت کە باوکم بیدۆزێتەوە.

– نا، کارەکانم باش ڕێکخستووە.

سارا بۆ دوو ڕۆژ موڵەتی لە کارەکەی وەرگرت و لەگەڵ شیریندا سەفەریان کرد. لەو دوو ڕۆژەشدا دایە گەورە هاتە لای منداڵەکان. بەڕێکەوت ئەو ئێوارەیەی کە سارا سەفەری کردبوو هانس هاتەلایان و کاتێک زانی دایکیان لە ماڵ نییە ئیتر کەوتە شکەوە. بە کاتەرینای وت:



– کاتەرینا لەو باوەڕەدانیت کە دایکت لە پشت مەسەلەی ونبوونی شیرینەوە بێ.

ئەویش شانێکی هەڵتەکاند و وەڵامی نەدایەوە.

– کە دایکت هاتەوە پێی بڵێ شیرین لە ژێر زەویشدابێت دەیدۆزمەوە، بەتەمام دیدەکتیڤێک بگرم تا بۆم بدۆزێتەوە.

پاش ڕۆیشتنی باوکی کاتەرینا بە تەلەفۆن قسەکەی باوکی بە دایکی گەیاند.

ساراش پێشوەخت هەموو شتێکی بۆ شیرین جێبەجێکردبوو. خانوویەکی بچکۆلەی دوو ژووری بەکرێ بۆ گرتبوو، لە نەخۆشخانەیەکیشدا کاری بۆ دۆزیبووەوە.

– ئەمەش بیست هەزار کرۆن، کەل و پەلی ماڵی پێ دەکڕی. ئەم ماوەیەی تا مووچە وەردەگری پێی بژی. ئەوەش ژمارەکەمە هەر شتێکت پێویست بوو تەلەفۆن بکە. هەروەک ڕێککەوتین بە هیچ جۆری پەیوەندی بەو کەسانەوە ناکەیت کە هانس دەناسن، مەبەستم شارا و ڕێزانە ئەوەش بزانە هەر ژیانی خۆت و هانس ناکەوێتە مەترسییەوە بەڵکو شارا و دەریای کچی لە هەمان لیستەدان. ئەوەشت لەیاد نەچێ کە ئێستا لەم شارە ناوت هەتاوە و بە ناوو مەوالیدە ئەسڵییەکەی خۆتەوە دەناسرێیت.

جاری پێشوو ناوو مەوالیدی خۆی گۆڕی تا خۆی لە پیاوێکی زاڵم ون بکات کە هەڕەشەی کوشتنی لێدەکرد، ئێستاش ناوە ئەسڵیەکەی خۆی وەرگرتەوە تا خۆشەویستەکەی نەیدۆزێتەوە.

ژیانێکی سەیرە، هەتاو نەیدەتوانی لەو گۆڕانکارییانە بگات کە لە ژیانیدا ڕوویاندابوو. لەماوەی دە ڕۆژێکدا هەموو ژیانی گۆڕا. جاری پێشوو کۆنە مێردەکەی لە ژوورێکی بێ تەلەفۆندا زیندانی کرد. بەڵام دەستی نەبەستەوە، هەر هیچ نەبێ لە ماڵەکەدا هات و چۆی دەرکرد و خۆی دەشۆشت و خواردنی ئامادە دەکرد، کەچی ئەمجارە لە ژوورێکی بێ پەنجەرەدا زیندانی کراو دەستەکانی بەسترابوونەوە. دەبوایە چاوەڕوانی سارای بکردایە هەتا نان و ئاوی بۆ بێنێ. ڕۆژێکی دوور و درێژ لەگەڵ سارادا قسەیان کرد، دەربارەی چەند لایەنێکی پەیوەندی هەردووکیان لەگەڵ هانس، لە سەر چەند خاڵێک ڕێککەوتن.

لە شارۆچکەیەکی باکووری سوێددا نیشتەجێ بوو، تاقە بێگانەیەکی لێنەبوو، ناوچەیەکی گەلێک سارد، کاری دەستکەوت، هەر زوو مشووری ئەوەی خوارد دەست بکات بە خوێندن،

ئەوەشی زانی کە دەتوانێ لە شارێکی نزیک درێژە بە کۆرسەکانی بدات تا بگەڕێتەوە کۆلیژی پزیشکی. نیگەرانی ئەوە بوو فریا نەکەوت منداڵێکی لە هانس ببێ هەر هیچ نەبێ وەک یادگاری ئەو خۆشەویستییە بمێنێتەوە. دڵی لای شارا و دەریا بوو، نەیدەزانی چییان بەسەردێت، بەتایبەتی کە دوا ڕۆژ ئەوان لە ماڵ نەبوون، گەر شارا گەڕابێتەوە بۆ ماڵی باوکی ئەوا شیرین هیچ شانسێکی نییە جارێکی تر دەریا و دایکی ببینێ، چونکە هیچ ناونیشانێکی ئەوانی لانییە، لە دەرەوەش زۆر تەلەفۆنی کرد، وەڵام نەدرایەوە. تاقە هیوایەک مابێتی ڕێزان بوو بەڵێنی بە سارا دابوو کە تەلەفۆن بۆ کەسیان نەکات، گەر بێت و هەریەکە لەمان بەڵێنی خۆی بەدی نەهێنێ ئەوا ڕێککەوتننامەکە دەشکێندرێ، کارەسات ڕوودەدات. لەگەڵ ئەوەشدا دەیویست هەر چۆنێک بووە تەلەفۆن بۆ ڕێزان بکات، بەڵام بەڵێنی لێوەرگرێت کە هیچ بە هانس نەڵێت. هەرچەندە ڕێزان لەو ڕووەوە جێگای باوەڕ نییە و قسە لە دەمیا ناوەستێ، بە تایبەتی زۆریش ڕێزی هانس دەگرێت لەوانەیە یەکسەر پێی بڵێت.

باری دەروونیی هانس بەرەو خراپی دەچوو، بۆ ماوەی مانگێ مۆڵەتی نەخۆشی وەرگرت. سارا و منداڵەکان بەردەوام دەچوون بۆ لای و داوایان لێدەکرد بگەڕێتەوە ناویان، بەڵام هانس ڕازی نەدەبوو ئەمەش سارای نیگەران کردبوو، کاتەرینا هەفتەی چەند جارێک دەهات بۆ لای باوکی و زۆر نیگەرانی بوو. زۆر هەوڵیشی دەدا گوێ لە تەلەفۆنەکانی دایکی بگرێ بۆ ئەوەی شتێ لە بارەی شیرینەوە بزانێ. بڕیاری دابوو گەر ناونیشانەکەی بزانێ خۆی بچێ بۆ لای، بۆ ئەوەی بزانێ ئەم مەسەلەیە چۆن ڕوویداوە، دایکی زۆر بە دڵڕەق دەهاتە پێشچاو. لەوەش تێنەدەگەیشت چۆن لەبەر گەڕانەوەی باوکیان دایکی ئەم کارە سەیرەی کردووە.

هانس زیاد لەهەموو کەسێ دڵی بە ڕێزان دەکرایەوە، هەموو ڕۆژێ دەچوو سەری لێدەداو خەریکی منداڵەکانی دەبوو، یارمەتیشی دەدا تا کاری مێردەکەی خێراتر بەڕێوەبچێ. سارا ئەمەشی پێناخۆش بوو. کاتەرینا هێمنی کردەوە و وتی ئەو ژنە مێردی هەیە و بابە یارمەتی دەدا تا مێردەکەی زووتر بگاتە ئێرە. زۆرتر خووی بە ئینتەرنێتەوە گرتبوو، هەوڵی دەدا شت لە سەر ڕۆژهەڵات و وڵاتەکەی هەتاو بخوێنێتەوە، هەموو ڕۆژێکیش بیری لەتەمەنی منداڵەکەیان دەکردەوە، ڕۆژێک بە کاتەرینای وت



– شیرین بەختەوەرە منداڵێکی دەبێ بەرهەمی خۆشەویستییە.
– کە شیرین ئێرەی بەجێهێشت دەیزانی سکی لە تۆ هەیە؟
– نا... پاش ونبوونەکەی بە دوو ڕۆژ ئەنجامی ئەزمایشەکەیم وەرگرت.
– لەو باوەڕەدانیت منداڵەکەی لەباربچوێنێت؟
– نا، منداڵی زۆر خۆشدەویست و بڕیارمان دابوو کە هەر باری ئێوە باشتر بێت منداڵ بکەین.
– بابە چۆن تۆ ئەوت ئەوەندە خۆشدەویست؟
– نازانم، خۆشم نازانم، پاش ناسینی ئەو ژیان لای من مانایەکی تری هەبوو، هەستم بە هێز و توانا دەکرد، بەختەوەربووم، پێم وابوو لە ئاسماندا دەژیم، هەموو دنیا بۆم پێدەکەنی، ئێستاش شتەکان تەواو پێچەوانە بوونەتەوە.

هەتاو تا دەهات سکی گەورەتر دەبوو، لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکەیدا هانسی زۆرتر خۆشدەویست. دەستی بە سکی خۆیدا دەهێناو باسی عەشق و خۆشەویستی خۆی بۆ منداڵەکەی دەگێڕایەوە. لەخوێندن و کاردا سەرکەوتوبوو، ئێوارەیەک بڕیاری دا زەنگێک بۆ ڕێزان لێبدات. پێی باشتر بوو کە لە دەرەوە تەلەفۆن بکات تا نەزانێ لە کوێوە قسەدەکات. ئێوارەیەکی سەیربوو، دوو سەعاتی تەواو تەلەفۆنی دەکرد وەڵام نەدرایەوە، ڕۆژنامەیەکی کڕی و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.

" کچێکی بێگانەی بیست ساڵان خۆی دەخنکێنێ"

ئەم کچە لە مێردەکەی جیاببووەوە ماوەیەک لە سەنتەری ژناندا دەژیا، پاشان بڕیاردەدات بگەڕێتەوە، پاش ماوەیەک لە گەڕانەوەی، لە ژوورەکەیدا بە ڕەفتەیەک، خۆی هەڵدەواسێت و خۆکوژیی دەکات. کچە منداڵەکەشی کە بە بست لە دایکی جیانەدەبووەوە، ئەو ڕۆژە دایە گەورەی بە بیانوی پیاسەکردن بردویەتیە ناو شار.

بە خوێندنەوەی ئەم هەواڵە ئازارێکی بە هێز بە سکی هەتاودا تێدەپەڕێ و خۆی بۆ ناگیرێ دەکەوێتە سەر زەوییەکە، هەرچۆنێ بێت خۆی دەگەیەنێتە لای تەلەفۆنەکە و دەیەوێ پۆلیس ئاگادارکاتەوە، باشە چییان پێبلێ؟ بلێ ئەمە درۆیە مێردەکەی و باوکی کوشتوویانە، هەر بۆیە لەو کاتەشدا دەریای کچیان بردۆتە دەرەوە. خۆ پۆلیس خۆی لە هەموو کارەکە ئاگادارە، باشترە نامەیەک بۆ ئەو ڕۆژنامەنووسە بنێرێ کە هەواڵ و ڕیپۆرتاژەکەی ئامادەکردووە.

خێرا تەلەفۆنی بۆ سارا کرد، زۆر تووڕە بوو:

– تەماشاکە هاتنی من بۆ ئێرە بوو بە هۆی کوشتنی شارا، گەر من نەهاتمایە بۆ ئێرە ئەو کوشتنە ڕووی نەدەدا. ئێستا دەبێت ناونیشانی کەسوکاری شارام بۆ بدۆزیتەوە تا لەگەڵ منداڵەکەیدا قسان بکەم، هەرچۆنێک بووە دەبێ بیدۆزیتەوە، ئەو منداڵە بگەیەنی بەمن، یەک هەفتە مۆڵەتت دەدەمێ، ئەگینا خۆم دێمەوە، ئەو کاتەش من و ئەو منداڵە و هانس بە یەکجاری سوێد بەجێدەهێڵین. تەماشای ژمارەی ئەمڕۆی ئێکسپرێسن بکە.

پاش هەفتەیەک لە هەمان ڕۆژنامەدا هەواڵێکی تر بڵاوکرایەوە:

"شک دەکرێ ئەو ژنە خۆی نەخنکاندبێت، بەڵکو بەدەستی باوکی کوژرابێت. پاش کوژرانی ژنەکە منداڵەکەی کە ناوی دەریایە، ونبووە، پۆلیس لە هەموو وڵاتدا بۆی دەگەڕێ. دەڵێن ئەو منداڵە دەتوانێ بیسەلمێنێ کە دایکەکەی خۆی نەکوشتووە، هەربۆیە بێ سەرو شوێن کراوە، زۆر کەس دەڵێن ئەو منداڵە یەکجار زیرەک بووە و وەک گەورەیەک بیری کردووەتەوە، مامۆستایانی باخچەی ساوایان لای تیمی پشکێنەری پۆلیس باسی ئەو منداڵەیان وەک موعجیزەیەک گێڕاوەتەوە..."